چاپی چوارەم

# ئادابە ئیسلامییەکان

## بۆ گەنج و تازە پێگەیشتووەکان

بەشی یەکەم- دووەم- سێیەم

-بۆ هەر سێ قۆناغی:
-سەرەتایی و بنەڕەتی
-فەقێی حوجرەکان و ئامادەیی
-پەیمانگا و زانکۆ و هاوئاستەکانیان



نووسینی
أبوبكر صديقى




ئادابە ئیسلامییەکان بۆ گەنج و تازە پێگەیشتووەکان
ئەبوبەکر صدیقی

# ئادابە ئیسلامییەکان

# بۆ

# گەنج و تازە پێگەیشتوان

بۆ هەر سێ قۆناغی :

١ – سەرەتایی و بنەڕەتی

٢– فەقێی حوجرەکان و ئامادەیی

٣– پەیمانگاو زانکۆ و هاوئاستەکانیان


نوسینی

ئەبوبکری صدیقی



چاپی چوارەم

١٤٤٢ کۆچی

٢٠٢٠ م








ناوی کتێب: ئادابە ئیسلامییەکان بۆ گەنج و تازە پێگەیشتوان

نوسینی: ئەبوبکری صدیقی

بابەت: پەروەردەیی

وردبینی: کاوە پێنجوێنی

دەرهێنانی فەرمودەکان: حمزە شوانی

نەخشاندنی بەرگ: کتێبخانەی گەشە

نۆبەی چاپ: چوارەم، ٢٠٢٠

تیراژ: ٢٠٠٠دانە

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارە سپاردنی (٢٣٢١)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە..



کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ‌و بڵاو کردنەوە

سلێمانی – بازاڕی ئاوباریک بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١



٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ – ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ التحريم: ٦

## پێشکەشە:

١-بەهەموو دایك وباوكێك كە ئەمانەتی پەروەردەكردنی رۆڵـەكانیان لەگەردندایە، ئەگەر ئەنجامی بدەن پیرۆزییە، ئەگەرنا پەشیمانیە.

٢-بەهەموو مامۆستا و پەروەردكارێك كە هەڵدەستێ بە پەروەردەكردنی گیان و دڵـەكان لەسـەر هیدایـەت و بـڕوا وپارێزكـاری، بـە پـەروەردەكردنی عـەقڵ و ژیرییەكان لەسەر زانست و عیرفان، بەپەروەردەكردنی دەرونەكان لەسـەر ئاداب و ڕەوشتە بـەرزەكان، بە چاولێكردن لـە پێغەمبـەری ئیسلام ﷺ پێغەمبـەری هـەمو مرۆڤەكانی جیهان.

٣-بـە هـەموو بانگـەوازكاران كـە هەڵدەسـتن بەدروسـتكردنی كەڵـەپیاوانی وەك: ئەبوبكر و عمر و عثمان وعلی..... وە شاژنانی ناوداری وەك: خەدیجە و فاتیمە و عائیشەو ئەسما......، چاكترین ئافرەتانی جیهان.

پێشكەشە بە هـەموو ئـەو گـەنج و لاو و تـازە پێگـەیشتوانەی كـە دەیانـەوێ لەسـەر هیدایەت و باوەڕ و زانست و عیرفان خۆیان پـێ بگـەیـەنن و ببن بـەهیوا و ئومێدی ئاینده و دواڕۆژی گەلەكەمان و غەمخۆری نیشتمان .

## پێشەکی:

الحمدلله ربّ العالمين والصلاة والسلام على خير خلق الله محمد وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين.

بەڕاستی ئاینی پاکی ئیسلام ئاینێکە گرنگی بەکاروبارە تایبەتی و گشتیەکانی مرۆڤ داوە، بەدواداچوون و ئاراستەی بۆ وردو درشتی ژیان کردوە، وە لە هەموو کاروبارێکی کەسێتی تایبەت و مرۆڤایەتی گشتگیری بەشداری کردووە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئاینی ئیسلام یەقینی وایە کە کۆمەڵگای بەرزو پیرۆز لەتاکی بەرزو پیرۆزەوە سەرچاوە دەگرێت، وە نەتەوەی پێشکەوتوو بێگومان ئەو نەتەوەیە، کە تاکەکانی لەسەر پێشکەوتن و شارستانێتیو ڕازاوەیی دروستیان کردبێت.

لەبەر ئەوەیە کە منداڵ و گەنج و لاو لەئیسلامدا بە شێکی گەورە لەچاودێری و ئەدەبدان و پەروەردەکردنی پێدراوە، گەنج و لاویش بەشێکی گەورەی فێرکردن و پەروەردەکردنی بەهەمان شێوە پێدراوە کوڕان و کچان، قورئانی پیرۆز باسی یەحیا پێغەمبەر(عليه السلام) دەکات وەدە فەرمێ: ﴿وآتيناه الحكم صبيًا﴾
واتە: هەر بە منداڵی ئێمە شەریعەت و حیکمەتی خۆمانمان بە یەحیا پیغەمبەر(عليه السلام) بەخشیوە.

وە یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) باس دەکات و دەفەرمێ: ﴿إِنَّهُمْ فتيةٌ آمَنُوا بربّهم و زِدْناهُمْ هُدىً﴾ واتە:ئەو گەنج و لاوانە بڕوایان بەپەروەردگاری خۆیان هێناو ئێمەش هیدایەتەکەمان بۆ زیادکردن.

بەڕاستی ئاینی ئیسلام سەرپەرشتیارانی منداڵ و گەنج و لاوەکان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی زیاتر وباشتر وچاکتر هەستن بەرۆڵی خۆیان بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی رۆڵەکانیان و بیانکەن بەهیواو ئومێدی نەتەوەکەیان لەهەموو بوارەکانی ژیاندا و بیانکەن بە برا گەورەو ڕابەرو پێشەوای دین و ژینیان،

پێغەمبەر ﷺ لە بارەی پیرۆزی و گەورەیی ئەو بڕوادارانەوە فەرمویەتی: {مانَحَلَ والدٌ ولَدَه نِحلةً أفضلَ من أدبٍ حَسَنٍ}([1])، واتە: هیچ باوکێك بەخشش‌ێکی بە ڕۆڵەکەی خۆی نەبەخشیوە ،کەچاکتربێت لەئەدەب وئاکارو ڕەوشتی جوان، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کارو ڕۆڵی دایك و باوك هەر ئەوە نیە کە خواردن و کاروباری جەستەیی منداڵەکەیان دابین بکەن، بەڵکو کارو ڕۆڵی دایك و باوك ئەوەیە کە زانست و زانیاری بەسود و ئەدەبی جوان و ڕەوشتی بەرز بۆ منداڵەکەیان پێشکەش بکەن لەهەموو هەنگاوەکانی ژیانیدا و جوان پەروەردەی بکەن و پێیْ بگەیەنن.

لێرەوە منیش بەپێویستم زانی کە چەند چەپکە گوڵێك لە گوڵزاری ئادابە ڕازاوەکانی ئیسلام بەزمانی کوردی پێشکەش بەباوکان و دایکان و پەروەردکاران بکەم، بۆ ئەوەی بتوانن ڕۆڵەکانیان باشتر پەروەردە بکەن،و پێیان بگەیەنن و تێیان بگەیەنن، و بیانکەن بەهیوا وئومێدی ئەم نەتەوەیە، تا بەهۆی ئەوانەوە هەمومان دین و ژینمان لەبەرەو پێشکەوتندا بێت، بەختەوەری دونیا و دوارۆژ مسۆگەر بکەین و لە دونیاو قیامەتدا سەردار وبەختەوەر و سەربەرزبین.

خوێنەری ئازیزم بەپێویستم زانی کە ئەم ئادابە ئیسلامیانە بکەم بەسێ بەشەوە و هەر بەشەی بۆ قۆناغێکی تایبەت بە تێگەیشتن وحاڵی بونە،بۆئەوەی بە ئاسانی وەربگیرێن و قوتابی وگەنج ولاوو ڕۆڵە ئازیزەکانمان لێیان حاڵی ببن، و لەبەریان بکەن و بیانکەن بەمەلەکەی دڵ و دەرونیان،وپاشان ئەو ئادابانە ڕەنگ بداتەوە لە کارو کردەوە و ئاکار وگوفتار و هەڵس وکەوتەکاندا، ئەوەش ببێتە مایەی پێگەیاندنی جیلێکی چاك و پاك و بەهێز وبەپێز و واقیعێکی پڕ لە داد و دادپەروەری وئاسایش و خۆشی و هەرزانی و دینداری و زانست و زانیاری.

نوسەر

سلێمانی - گەڕەکی کازیوە- پایزی : ٢٠١٤م

[1] الجامع الصغير، رقم الحديث:٨١١٨.وهوحديث صحيح، وأخرجه البخاري: مرسلا .

# بەشی یەکەم

## ئەم بەشە تایبەتە بە قوتابیانی زانستەکانی شەرعی و قۆناغەکانی سەرەتایی و بنەڕەتی، چەند ئادابێکن، پێویستە گەنج و لاوەکان ،کوڕان وکچان، لەم قۆناغەدا بەچاکی ڕەچاویان بکەن و جێبەجێیان بکەن:

## یەکەم: ئادابەکانی :نیازکردن و نییەت هێنان:

نیازکردن و نییەت هێنان جێگا وپلە وپایەیەکی گەورەی هەیە لەژیانی دینی و دونیایی مسوڵماندا، چونکە هەمو کار وکردەوەکان بەپێی نیاز کردنەکەیەتی،بەئەوەوە دروست دەبێ، یان بەهێز و لاواز دەبێ،بۆیە نیازکردن کۆلەکەی کردەوەکانە، وبناغە و ئەساسەکەیەتی، کردەوەکان شوێن ئەو دەکەون،نیازەکە چۆن بێ کردەوەکان ئەوها دەبن، هەتتا خۆشی وبەختەوەری بەونازکردنەوەیە، ونەگبەتی وبەدبەختیش بەهەمان شێوە ئەویش هەر بەنیازکردنەوەیە، خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾ الإسراء: ١٨ - ١٩ واتە: هەرکەسێك ئیرادە ونیاز ومەبەستی بۆ ئەم دونیایە بێ ئەوە ئێمە هەر لە دونیادا ئەوەی بمانەوێ پێی دەدەین، وەهەرکەسێکیش بۆ ژیانی دوارۆژی تێبکۆشێ و برِوادار بێت، ئەوە کۆششەکەی وەرگیراوە.[1]

هەرخوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ وماتنفقون إلاّ ابتغاء وجه الله﴾ ( البقرة: ٢٧٢ ).واتە: هەر لەبەر خوا ماڵ و سامانی خۆیان سەرف دەکەن.

وە نیازکردن واتە: ئیخلاص وخۆ یەکلاکردنەوە بۆ خوا، وەك فەرمویەتی: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البينة: ٥.

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية للدكتور محمد عبد العاطي بحيري، ل:٢٣.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّما الأعمال بالنيّات، وإنّما لكلّ امريء مانَوى}[1]، واتە: کار و کردەوەکان هەمویان بە نیاز و نییەتەکانیانەوە بەندن، وەهەر مرۆڤێك تەنها پاداشتی ئەوکار وکردەوانەی وەردەگرێتەوە کەنییەتی لێهێنابێت، بۆیە زانایان گوتویانە: ئەم فەرمودەیە یەکێکە لەو چوار فەرمودەیەی کە مەداری ئیسلامیان لەسەردەسورێتەوە، وە مسوڵمان بۆ دینەکەی بەسیەتی.[2]. لەغەزای (تبوکدا) پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {لەمدینەدا کۆمەڵێك لەیارەکان لەبەر ئەوە کە عوزریان هەبوە بەجێماون و نەیان توانی لەگەڵماندا بێن، بەڵام هەرچەندە دواکەوتوون لەهەموو خێرو پاداشێکدا هاوبەشن چونکە بیانتوانیایە نیازیان وابوو لەگەڵماندا بێن}.[3].

عبدالله ی کوڕی موبارك دەڵێ: کردەوەی بچوکی واهەیە نیاز ونییەتەکەی گەورەی دەکات، وەکردەوەی گەورەی واهەیە نیاز ونییەتەکەی بچوکی دەکاتەوە.

ئیبن عجلان دەڵێ: کار وکردەوە بەسێ شتەوە چاك دەبێ: لەخوا ترسان، نیاز ونییەتی چاك، ئیصابە کردن و پێکان، واتە: کارو کردەوەکە بەگوێرەی شەرع بێت.[4].

**ئەمەش هەندێکە لە ئادابەکانی نیازکردن و نییەتهێنان، دەبێ ڕەچاو بکرێن:**

١-پێویستە بزانی کەخوا جلجلالە تەماشای جەستە وحەسەب ونەسەبی بەندەکانی خۆی ناکات،وئەمانە بەلای خواوە حیسابیان نیە، بەڵکو تەنها تەماشای دڵەکانیان دەکات و ئیش و مەداری کاروکردەوەکان هەر لەسەر ئەوە.

٢-پێویستە تێبکۆشی کەهەر کارێك دەیکەیت بەبێ نیاز ونییەتی چاك مەیکە، چونکە نیاز ونییەتی مرۆڤ روح وگیانی کار وکردەوەیە، دروستبونەکەی بەئەوەوە وەستاوە، و هەر بەئەوەوە خەراپ وگەندەڵیش دەبێت.[5].

٣-پێویستە مسوڵمان نیاز ونییەتەکەی صاف وساغ ویەکلابکاتەوە بۆ خوا جل جلالە، چونکە خەڵکی واهەیە نیاز ونییەتەکەی لەئەوپەڕی چاکی وبەرزیدایە، وەخەڵکی واش

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم ، كتاب الإخلاص.

[2] منهاج الصالحين، ب٢ / ل:٢٤ .

[3] أخرجه البخاري ومسلم ، كتاب الإخلاص.

[4] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل:٢٥.

[5] موسوعة الآداب الإسلامية،ل:٢٨ .

هەیە نیاز و نییەتەکەی لەئەوپەڕی خەراپی و نزمیدایە، هەتتا تۆ دوو کەس دەبینی هەردووکیان یەك ئیش ویەك کار دەکەن، بەلام جیاوازی نێوانیان ئاسمان وریسمانە، ئەمەش بەهۆی جیاوازی نیاز ونییەتەکەیانەوەیە.[1].

٤-دەبێ بزانی بەهۆی نیاز ونییەتەوە کار وکردەوە حەلال وموباحەکانی وەك نانخواردن وئاوخواردنەوە وبوون لەخۆدان دەگۆڕێن بۆ خواپەرستی ودەبن بەخاوەن ئەجر وپاداشتی گەورە،هەروەها ئەگەر عیبادەت وخوا پەرستیش نیاز ونییەتی چاکی لەگەڵدا نەبێ بۆی هەیە ببێ بەگوناهو تاوان و خەراپە[2].

٥-پێویستە مسوڵمان بزانێ کەلەڕۆژی دواییدا هەر لەسەر ئەو نیاز ونییەتەی کە لەدونیادا لە سەری بوە زیندو دەکرێتەوە، بۆیە پێویستە لەدونیادا هەولبدەی نییەت ونیازی چاك و جوانت هەبێ، نییەت ونیازی خەراپت نەبێ،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { إنّما يُبعثُ الناسُ على نيّاتهم}[3]، واتە: لەڕۆژی دواییدا خەڵك لەسەر نیاز ومەبەستەکەی خۆیمان زیندو دەکرێنەوەودەچنە بەردەم خوای پەروەردگار.

٦-پێویستە مسولمان هەرکارێك دەکات، یان هەرشتێك، هەر قسەیەك، هەر هەنگاوێك، و هەر پرۆژە و هەرشتێك دەکات با نیاز ونییەتی چاك وجوانی لەگەڵدا هەبێت،زانای پایەبەرز سەوری بە علی کوڕی حسینی گوت: (هەر کارێك دەکەی با بەنییەتەوە بێ، خواردن و خواردنەوەشت با بەنییەتەوە بێ).

بەئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمیان گوت: قسەمان بۆ بکە، ئەویش گوتی: (ئاخر هیچ نییەتێکم بۆ نەهاتوە تاوەکو قسە بکەم).[4].

ئیبن حزم دەڵێ:(نیازکردن و نییەت هێنان نهێنی و روحی کردەوەیە، کردەوە بەبێ نیاز و نییەت وەك جەستەی بێ گیان وایە).[5].

عبدالله ی کوڕی مسعود-رحمه الله- گوتویەتی:(قسە بەبێ کردەوە سودی نیە، قسە و کردەوەش بەبێ نییەت سودی نیە،وەقسە وکردەوە ونییەتیش موافیقی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ نەبێ هیچ سودی نیە وهیچ نییە.[1].

---

[1] المصدر السابق، ل:٢٨-٢٩ .

[2] المصدر السابق، ل:٢٩.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[4] حلية الأولياء لأبي نعيم، (٤ /٢١١).

[5] إحكام الأحكام لابن حزم، (٢ /٧٠٦).

{سود وبەهرەیەك}كار وكردەوە تێكڕا سێ جۆری هەیە:

أ-عیبادەتەكان ب-گوناهەكان ج-شتە حەڵاڵ و موباحەكان:

١-عیبادەتەكان-خواپەرستیەكان- بناغەی دروستبونیان بەنیەتەوە بەندە، واتە: نیاز و نییەتت پێیان ئەوەبێ كە خواپەرستیەكەت تەنها لەبەر خوا بێت، ئەگەر نییەتی ڕیا و ڕوپامایی بێت، ئەوە ئە وخواپەرستیانە دەبن بەگوناهو تاوان، وەئەگەر تەنها نییەتی هەر خوابێ، ئەوە ئەوعیبادەت وخواپەرستیانە چەندەها جار دووچەندانە دەبنەوە، بۆ نمونە وەك: دانیشتن لەمزگەوتدا، تاعەت وخواپەرستیە، دەتوانی نییەتی چەندەها شتی لێبێنی وەك:دەرس گوتنەوە، ئامۆژگاریكردنی خەلك،فەرمان بەچاكە، چاوەڕێ كردنی نوێژ، دوركەوتنەوە لەخەڵك و وازهێنان لەگوناه، ئیعتیكاف كردن.
٢-گوناهەكان: نیاز ونییەت هیچ ناتوانێ گوناهەكان بگۆڕێ بۆچاكە، بۆ نمونە پیاوكوشتن، زیناكردن، دزیكردن، هتد بەنیاز ونییەتی چاك هەرگوناهە و نابێ بەچاكە.
٣-شتە موباح وحەلالەكانە:مرۆڤ دەتوانێ بە شتە موباح وحەڵاڵەكان نییەتێك یان چەندەها نییەتی لێبهێنێ، وبچێتە ریزی چاكەكانەوە، بۆ نمونە: بۆن لەخۆدان، مرۆڤ دەتوانێ نییەتی ئەم شتە چاكانەی لێبێنێ وەك: شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەرﷺ، و لابردنی بۆنی ناخۆش لە جەستە، و بڵاوبونەوەی بۆنی خۆش بۆخەڵكی، وچەند شتی دیكە.([1]).

## دووەم: ئادابەكانی خەوتن:

خەوتن گەورەترین نیعمەتی خوایە بۆ مرۆڤ، بۆ حەسانەوەی دڵ و دەرون و جەستەی، هەر رۆژێك كە گزنگ دەدات مرۆڤ ژیانێكی تازە دەست پێدەكاتەوە، ناڕەحەتیەكانی پێشوی لە بیردەچێتەوە.
خەوتن نیشانەیەكی گەورەیە لەسەر گەورەیی و دەسەلاتی خوای پەروەردگار،وەهەروا خەو نیشانەیە لەسەر لاوازی و بێهێزی مرۆڤ، بۆیە خوای پەروەردگار خەوتنی كردوە بە ڕاحەت و خۆشی بۆ مرۆڤ، و شەحن كردنەوەی هێزەكەی وگێڕانەوەی چالاكیەكانی، وەك خوا جل جلالە فەرمویەتی:

---

[1]منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ / ل:٣٣.

[2]موسوعة الآداب الإسلامية للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل:٢٧-٢٨.

﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴾ النبأ:٩ - ١١

واته: ئێمه خەومان بۆ ئێوه کردوه بەحەسانەوه و خۆشیتان، شەومان کردوه بەپۆشاك بۆتان، رۆژمان کردوه بەکاتی ژیانو مەعیشەت.([1]) . لەبەر گرنگی خەوتن ئاینی پاکی ئیسلام چەند ئادابێکی بۆ داناوه بەم شێوەیەی کە باسیان دەکەین:

١-لەپێش خەوتنەوه دەستنوێژێك بگره، پاشان لەسەر لای راستت بخەوه،هاوەڵی بەرێز بەرائی کوری عازیب گێرایەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا أتيتَ مَضْجعكَ فتوضأْ وُضُوئَكَ للصلاة، ثُمّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقّكَ الأيْمَنِ**}([2]). واته: کاتێك کەچویته سەرجێگا دەستنوێژ بگرەوەك دەستنوێژی نوێژکردن و پاشان لەسەر لای راستت بخەوه.

٢-لەدوا نوێژی عیشاوه هەوڵ بده زوو بخەوه، مەگەر لەبەر پێداچونەوەی زانست و زانیاری و دەرس وتنەوه بێت، یان لەبەر میوان بێت، چونکە ئەبو بەرزه گێرایەوه گوتی: {**إنّ النبيﷺ كان يَكْرَهُ النومَ قبل صلاة العشاء والحديثَ بعدها**}([3])، واته: پێغەمبەر ﷺ خەوی پێش نوێژی عیشای بەلاوه ناپەسەندبووه، هەروەها قسەکردنیدوای نوێژی عیشاشی پێ ناخۆشبووه.

٣-لەپێش خەوتنەوه موحاسەبەو سەرزەنشتی نەفسی خۆت بکەو پەشیمان ببەوه لەو گوناهو تاوانانەی کە بەرۆژ کردوته، ئەبو سەعیدی خدری دەگێرێتەوه: کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{هەرکەسێك کە هاته سەر جێگاکەی بڵێ: {**أستغفِرُالله الذي لا إله إلا هو الحيّ القيّومُ وأتوبُ إليه**} ئەوه ئەگەر تاوانەکانی وەك کەفی دەریا وابێت خوای پەروەردگار لێی دەبورێت}([4]).

٤-لەپێش خەوتنەوه ئایەت الکورسی و(قل هو الله أحد) و(قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) بخوێنه،وفو لەدەستت بکە،ودەستت بهێنه بەجەستەتدا ئەوەندەی دەتوانی، چونکە لەوبارەوه فەرمودەی صحیحی پێغەمبەری ﷺلەسەر هاتووه.([5]).

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،محمد عبد العاطي بحيري،ب١/ل:٣٥٣.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما، وأبو داود رقم الحديث:(٣٠٤٥).

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما، والترمذي رقم الحديث:(١٦٨).

[4] أخرجه الترمذي في سننه، انظر: المسند الجامع، رقم الحديث:٤٥٦٢.

[5] حديث متفق عليه.

٥-لەپێش ڕاکشانت لێفەو بەتانیەکەت هەڵتەکێنە، بۆئەوە دڵنیابیت کە هیچ زیندەوەرێکی زیانبەخشی تێدانیە، پاشان ئەم دوعایە بخوێنە کە پێغەمبەر ﷺ خوێندویەتی: وفەرمویەتی: {کاتێك یەکێك لەئێوە هاتە سەر جێگاکەی با فەرش وپۆشاکەکەی هەڵتەکێنێ،وپاشان بڵێ: {**بِاسْمِك ربّى وضعتُ جَنْبى، وبك أَرْفعُهُ، إِنْ أَمْسكتَها فأرْحمْها، وإِنْ ارسلتَها فاحْفظْها بما تَحْفظُ به عبادَك الصّالحين**}([1]). واتە: بەناوی خواوە جەستەم دادەنێم و هەڵی دەگرمەوە، ئەی خوایە ئەگەر روحی رەوانم دەهێڵیەوە بەزەیی خۆتی پێ بکە، وە ئەگەر بەریشی دەدەیەوە وەك چۆن بەندە چاکەکانی خۆت دەپارێزی ئەویش بپارێزە.([2])

٦-هەوڵ بدە زوو بخەوە بۆئەوەی زوو بەئاگابێیتەوە، عائیشە-رەزای خوای لێ بێت-گێڕایەوە گوتی: {**كان رسُولُ الله ﷺ ينامُ في أوّل اللّيل ويقومُ آخرَه فيُصلّي**}([3]). واتە: پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای شەوەوە دەخەوت و لەکۆتاییدا هەڵدەستایەوە شەو نوێژی دەکرد.

٧-پۆشاکی نەرم و خۆش و درێژ لەبەربکە، خۆت لە ڕوتی و دەرکەوتنی عەورەتت بپارێزەو لە شوێنی هەوایخۆش وئازاد وفراوان بخەوەو هەرکەسە بەپۆشاکی تایبەتی خەوەوە پێویستە بخەوێت.

٨- لەشگران(جنب)ئەگەر بۆی نەکرا خۆی بشۆرێ پێشخەوتن، سوننەتە دەستنوێژ بگرێ و پاشان بخەوێ عائیشە گێڕایەوە گوتی:{**كانَ النبيّ ﷺ إذاأراد أنْ يَنام جُنُباً، توضّأ وُضُوئَه للصلاة**}([4])واتە:پێغەمبەر ﷺ کاتێك بیویستایە بەلەشگرانیەوە بخەوتایە دەستنوێژیکی وەك دەستنوێژی نوێژکردنی هەڵدەگرت.

٩- لەسەر سك مەخەوە چونکە زەرەرو زیانی تەندروستی و دەرونی وجەستەیی هەیە، یعیشی کوڕی طحفە گێڕایەوە گوتی: ڕۆژێك لەمزگەوتدا لەسەر سك خەوتبوم، کاتێکم زانی کەسێك بەپێی منی جوڵاندەوە و گوتی: ئەمە راکشانێکە خوا پێی ناخۆشە،منیش کە سەرم بەرزکردەوە سەیرم کرد پێغەمبەر بوو ﷺ.([5])

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] بروانە: آداب النوم،للدكتورعادل بن عبدالشكور الزرقي.

[3] بروانە: كنز العمال،رقم:١٨٥٨٦،والحديث صحيح.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه،وأحمد في مسنده.

[5] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،محمد عبد العاطي بحيري،ب١/ل:٣٥٧. والآداب الإسلامية الشخصية،ل:٢٢.

١٠-شەو و ڕۆژ لەهەشت سەعات زیاتر مەخەوە، چونکە خەوتن ڕاگرتنی جوڵەی ژیانە و لەکاتی خەودا ژیانت دەکوژێتەوە،کابرایەکیان بۆپێغەمبەرﷺباسکرد، کەوا زۆر دەخەوێ و نوێژەکەی ناکات،پێغەمبەرﷺفەرموی: {ذاك رَجُلٌ بالَ الشيطانُ في أُذُنَيه}([1]).
واتە: ئەوە پیاوێکە کەوا شە یطان میزی لەگوێچکەکانی کردوە.
١١-لەکاتی خەوتندا چراکان بکوژێنەوە، و پەنجەرە ودەرگاکان دابخە، و سەری ئاو وخواردەمەنی داپۆشە. جابیری کوڕی عبدالله گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {أطْفِئُوا المصابيح بالليل إذا رَقدْتُمْ، وأغلِقوا الأبواب، وأوكئوا الأسقية، وخَمِّروا الطعامَ والشرابَ، فإنّ الشيطان لا يفتح باباً مُغْلقاً ولا يَحلّ وِكاءً}([2]) واتە: کاتێك کە خەوتن چراکان بکوژێننەوە، دەرگاکان دابخەن، کوندە وقاپەکان بەپەت سەریان بپێچنەوە، سەری خواردن و خواردنەوەکان داپۆشن.

{سودوبەهرەیەك} لەئیسلامدا خەوندیتن پلەوپایەکی گەورەی هەیە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {رؤيا المسلم جزءٌ من ستةٍ و أربعين جزءاً من النبوة}([3])واتە:خەونی مسولمان بەشێکە لەچل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی.
وە خەوندیتن سێ جۆری هەیە أ-خەونی چاك وباشە، کە بەشارەت ومۆژدەی خوایە.ب-خەونی غەمباری وخەفەتە،کە لەلایەن شەیتانەوەیە. ج-خەونێکە،کەخەیالات وقسەی نەفسە لەکاتی بەخەبەربوندا کراوە.
بۆیە خەوندیتنئەم ئادابانەی هەیە دەبێ ڕەچاو بکرێن:
١-خەونی خۆش موژدەو بەشارەتی خۆشیە،چونکەلەخواوەیە و پێویستە لەلای کەسێکی چاك و شارەزا بیگێڕیەوە.
٢- کەخەونی خۆشت بینی زۆرسوپاسی خودای لەسەربکە.
٣-کەخەونی ناخۆشت دیت سێ جار فو بکە بەلای چەپتداو سێ جاریش خۆت بەخوا بپارێزە لەخەراپەی و بڵێ :أعوذ بالله من الشيطان الرجيم و گەشبینبە نەك ڕەشبین و

[1] أخرجه البخاري ومسلم، بروانە: المسند الجامع، رقم الحديث :٩٠٦٠.
[2] أخرجة أحمد في مسنده رقم (١٤١٦٢)، وصحّحه الالباني في صحيح الجامع رقم(١٠٨٠).
[3] اخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

داوا لەخوا بکە کەلە خەراپەی ئەو خەونە بتپارێزێت، بەڵام خەونی خەراپ بۆ کەس مەگێڕەوەو زەرەرت پێناگات.([1]).

١٢- لەکاتی خەوتندا لەسەر لای ڕاست ڕابکشێ و ئەم دوعایە بخوێنەو بڵێ {**باسْمك اللّهمّ أمُوتُ وأحْيَا**}([2]) واتە: بەناوی تۆوە ئەی خوایە دەمرم و زیندو دەبمەوە.([3]).

١٣-سوننەتە کاتی خەوتن کل لەچاوت بکەیت، عبدالله ی کوڕی عەباس گێڕایەوە گوتی: {**إنّ النبيّ ﷺ كان يَكتحِلُ بالإثْمِد كُلّ ليلةٍ قبل أنْ ينامَ....**}([4]).واتە: هەمو شەوێك پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بخەوێ چاوەکانی بەکلدەڕشت، ودەیفەرمو: ئێوەش چاوتان بڕێژن ، چونکە کل چاوتان گەش دەکاتەوە و موو سەوز دەکات.

<u>(سودوبەهرەیەك)</u>

خەوتن تەنها لەدونیادا هەیە،ئەویش لەبەر ماندویەتی وناڕەحەتی، بەڵام لەدوا ڕۆژدا خەوتن نیە نەلەبەهشتدا ونەلەدۆزەخدا،جابر گوتی: کابرایەك پرسیاری کرد وگوتی: ئایا ئەهلی بەهەشت دەخەون؟،پێغەمبەر ﷺفەرموی: {**لا، النوم أخو الموت، والجنة لا موت فيها**}([5]) واتە:نەخێر لەبەهەشتدا خەوتن نیە، چونکە خەوتن برای مردنە، ومردنیش لە بەهەشتدا نیە.

## سێیەم: ئادابەکانی لەخەوهەستان:

لەخەوهەستان نیشانەیەکە لە نیشانە گەورەکانی خوای بالأدەست، وەك زیندوبونەوەی دوای مردن وایە، خوا جل جلالە لەقورئاندا خەوتنی بەمردن ناوبردوە ، و لەخەو هەستانیشی بەزیندوبونەوە ناوبردووە ، لەخەوهەستان ژیانێکی تازە دەداتەوە بەمرۆڤ ، کردنەوەی لاپەڕەیەکی سپییە لەژیاندا، بۆیە شێخ حەسەنی بصری گوتویەتی:

---

[1] متفق عليه.بروانە:الآداب الإسلامية ب١ ل:١٠٨ ومنهاج الصالحين ب١ ل:٣٦٩ .

[2] أخرجه البخاري في صحيحه (٩٨).

[3] آداب النوم، للدكتور عادل عبدالشكور الزرقي.والآداب الإسلامية، للشيخ محمود المصري، ل:٤٧٨.

[4] أخرجه أحمد في مسنده(٣٣٢٠ ) بإسناد، صححه الشيخ أحمد شاكر،٣ /٤١٢.

[5] أخرجه إبن المبارك في الزهد(٢٧٩) والقرطبي في التذكرة،ص:٤٩٦.

( هـەموو ڕۆژێکـی تـازە کـە گـزنگ دەدا یـەکێك بـانگ دەکـاتودەڵێ: ئـەی مـرۆڤ مـن دروسـتکراوێکی تـازەم، ئاگـام لەکردەوەکانتـە، جارێکی تـر ناگەڕێمـەوە بۆلات، زوکـە زەخیرە و توێشوو بۆخۆت پەیدابکە).

زانایەکی تر گوتویەتی: (ئەی مرۆڤ تۆ بریتی لەچەند ڕۆژێك، هەر ڕۆژێك بڕوا هەندێکی تۆ ڕۆیشتووە)[1].

**ئادابەکانی لە خەوهەستان ئەمانەن پێویستە ئەنجام بدرێن:**

١-تێبکۆشـە بۆئـەوە لـەپێش گزنگـی بەیانـدا هەڵبـستی، تـاوەکو سـودە روحیـەکان و وەرزشە تەندروستیەکان و کاتە پاکەکان بەدەست بهێنی، بۆ خوا پەرستی و خوێندن و لێکۆڵینەوەو کۆششکردن،وزو چون بەدەم کارەکانتەوە، وەبۆ بەدەست هێنانی ڕیزق و ڕۆزی و زانست و زانیاری وکارە گەورەکان، لەم بارەوە خوا جل جلالە فەرمویەتی :

﴿ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾ الذاريات: ١٨ واتە: لەکاتی پێش بەیاندا پیاوانی خوا تۆبە و ئیستیغفار دەکەن، وڕازو ونیازی خۆیان لەگەڵ خوادا دەکەن.

وە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**باكِروا في طَلَبِ الرزق و الحوائج، فإنّ الغُدُوّ بركةٌ و نجاحٌ**}[2] واتە:بەیانی زوو هەوڵی ڕیزق و ڕۆزی و پێداویستیەکانتان بدەن،چونکە کاتی بەیانی پیرۆزە وبەفەڕەو سەرکەوتنە.

٢-یەکەم وشەیەك کە بەسەر زمانتدا دێت، بازیکرو یادی خوای پەروەردگار بێت، هاوەڵی بەڕێز حوزەیفەی یەمانی-ڕەزای خوای لێ بێت-لەم بارەوە گێرایەوە وگوتی:( پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك لەخەو هەڵدەستا دەیفەرمو:

{**الحمدلله الذي أحيانا بعدما أماتنا و اليه النشور**}()، واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لەدوای مردنی خەومان ئێمەی زیندوکردەوەو هەر بۆلای ئەویش کۆدەکرێینەوە.

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة، للدكتور محمد خير فاطمة/سوريا/ دمشق ب١/ ل١٤،وآداب النوم والاستيقاظ/ مكتبة / صيد الفوائد/ للشيخ محمدحسن يوسف،ل:٢٠.

[2] أخرجه النسائي،رقم الحديث ١٠٦٩٤ ،قال الألباني في السلسلة الضعيفة والموضوعة، ٤ ١٦٤ : ضعيف، رواه المخلص في " الفوائد المنتقاة " ( ١٠ / ١٨ / ١ ).

٣-دوای هەستانەوەت لەخەو لەشەودا خێرا دەست نوێژ بگرە و شەونوێژ بکە، چونکە ئەبو هریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {يَعقدُ الشيطانُ على قافية رأس أحدكم إذا هو نامَ ثلاثَ عُقدٍ،يَضْرب على كلّ عُقدة، عليك ليلٌ طويلٌ فارقد، فإن استيقَظَ وذكَر اللهَ تعالى انحلَتْ عُقدةٌ، فإنْ توضأ انحلَتْ عُقدةٌ، فإن صلّى انحلَت عُقدةٌ فأصْبَحَ نشيطاً طيّب النفس و إلاّ أصبح خبيث النفس كسلان} .([2]) واتە: هەر کەسێك کە دەخەوێ لەکۆتایی سەرو مێشکیدا شەیتان سێ گرێی لێدەداو پێی دەڵێ: شەوێکی درێژە بۆ خۆت بخەوە، جا ئەگەر ئەو کەسە بەخەبەر هات و زیکرو یادی خوای کرد، ئەوە گرێیەکیان دەکرێتەوە، وە ئەگەر لەخەو هەستاو دەسنوێژی هەڵگرت، ئەوە گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، وە ئەگەر نوێژیشی کرد، ئەوە گرێیەکەی تریشیان دەکرێتەوە، و ئەو ئینسانە ئەو ڕۆژە زۆر چاك ودڵخۆش ودڵپاك دەبێت، ئەگینا ئەو ئینسانە ئەو ڕۆژە تەمبەڵ و لەشگران و دڵ پیس ودڵناخۆش دەبێت.

٤-دوا بەئاگا بونەوەت لەخەو لەجێگەکەتدا مەمێنەوە، ئەم دیو وئەودیو وتەمبەڵی مەکە، هەر خێرا هەستە،ودەست نوێژ بگرەو نوێژەکەت بکە.

٥-لەبەر سەرماو ماندویەتی تەمبەڵی مەکەو هەڵسە بۆ نوێژەکەت.

٦-لەدوا گزنگی بەیانیەوە نەکەی بچیەوە ناو جێگەکەت، یان بڵێی پاش ماوەیەکی تر بۆ نوێژەکەم هەڵدەستم،چونکە ئەمە تەنها وەسوەسە وخوتخوتەیەکی شە یطانیە،ونابێ بەقسەی بکەیت،چونکە زەرەرت پێدەگات.

٧-لەدوای هەڵسانت لەخەو خێرا سیواك بکە، چونکە حوذە یفە- ڕەزای خوای لێ بێت - گێڕایەوە گوتی: {كان رسولُ الله ﷺإذا قَامَ من النوم يَشُوصُ فاهُ بالسّواك}([3])واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە لەخەو هەڵدەستا خێرا سیواکی دەکرد.

٨-کاتێك کە لەخەو هەڵدەستی زۆر هێواش و لەسەرخۆبە، دەوروبەرەکەت ئازار مەدەو هەراهەرا مەکە.

٩-کاتێك کە لەخەو هەستای لەشوێنی گەرمەوە خێرا مەڕۆ بۆشوێنی سارد،چونکە زیان بە تەندروستیت دەگەیەنێت وتوشی نەخۆشی دەبیت.

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] حديث متفق عليه.

[3] حديث متفق عليه.

١٠-كاتێك خەڵك لەخەو بە ئاگا دێنیەوە، بەهێواشی و لەسەرخۆیی بەئاگایان بهێنەوەو (بسم الله) بکە وپێیان بڵێ:نوێژکردن لەخەو چاکترە.
١١-کە لەخەو هەستای دەرگاو پەنجەرەی ژورەکەت بکەرەوە، بۆ ئەوەی هەوای تازە بێتە ژورەکەتەوە([1]).

## چوارەم: ئادابەكانی سەرئاو وخۆ پاككردنەوە:

چونە سەرئاو(ئاودەست) یەکێکە لەخەصڵەتەکانی پاکی ورِسکان وفیطرە تي ئینسانی، چونکە مرۆڤ پاك دەکاتەوە ورِزگاری دەکات، عائیشە-ڕەزای خوای لێبێت-دەڵێ: پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{**عشرةٌ من الفطرة.....وانتقاص الماء،يَعْنِي الاستنجاء بالماء**}([2]) واتە:دە خەصڵەت هەیە لەخەصلەتەکانیپاکی ورِسکان وفیگرەتی ئینسانی..... خۆ پاك کردنەوە لە میز وشتەکانی تر، یەکێکە لەو خەصڵەتانە،کە هەمو پێغەمبەران( عليهم السلام) پێوەی پابەند بوون.
چونە سەرئاو بۆ رزگاربون لەپاشەرۆ وشتەکانی تر نیعمەتێکیگەورەی خواییە، بۆ ئەوە لاشەی مرۆڤ بەتەندروست و بەپاکی بمێنێتەوە ودور بێت لەنەخۆشیەکان،چونکە ڕاگرتنی میزو شتەکانی تر زیانی گەورە بەجەستە دەگەیەنێ، بۆیە پێویستە مرۆڤ کە لەسەرئاو رزگاری بوو سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار بکات، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کە لەسەرئاو دەهاتەوە دەیفەرموو:{**الحمدلله الذي أذاقني لذّته، وأبْقَى فيَّ قوّته و رَفَع عنّي أذاه**} ([3]). واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە تام وچێژی خواردنەکەی پێدام، وسود وقازانجی خواردنەکەشی تێدا هێشتمەوە، وە ئەزیەت و ناڕەحەتیەکەشی لەجەستەم لابرد.
لەبەرئەوەی کە ئاینی ئیسلام ئاینی پاك و خاوێنیە، داوامان لێدەکات لەکاتی چونە سەرئاودا ئەم ئادابانە رەچاو بکەین و بیانکەین:
١) لەپێش چونە سەرئاودا لەدەرگای سەرئاوەکە بدە، بە تایبەت لەشوێنە گشتییەکاندا.

---

[1] بروانە: الآداب الاسلامية للناشئة، للدكتۆر محمد خير فاطمة.ب١/ل:٤٥.

[2] أخرجه النسائي في سننه رقم الحديث:(٥٠٥٥) والبيهقي في الآداب،٢٢٦/١.

[3] بروانە :روضة المحدثين رقم الحديث(٥٠٣٦).وقال في فتح الباري ٦/٣٧٣ ): إسناده مقطوع.

٢)لەچونەژورەوەدا قاچی چەپت پێش بخە، لەهاتنە دەرەوەدا قاچی ڕاستت،وئەو دوعایە بخوێنە کە پێغەمبەر دەیخوێند لەکاتی چونە سەرئاوداو دەیفەرموو: {**اللهمَّ إنّي أعوذبك مِن الخُبُث و الخبائثِ**}([1]). واتە: خودایە پەنادەگرم بەتۆ لەشەڕو خراپەی جنۆکەی نێرومێ.

٣)کاتێك کە دەرچوی لەسەرئاو ئەم دوعایە بخوێنە کەپێغەمبەرﷺ دەیخوێند : {**غُفرانكَ، الحمدلله الّذي أذهبَ عنّي الأذى وعافاني**}([2]). واتە: ئەی خوایە لێم ببورە، سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەزیەت و ئازاری لەسەر لابردم و سەلامەت و تەندروستی کردم.

٤)لەکاتی سەرئاودا ڕو لە قیبلە(مککە)مەکە، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا أتَى أحَدُكُم الغائطَ فلا يستقبل القبلة، ولايولّها ظهرَه، شرِّقوا أو غرِّبوا**}([3]). واتە: کاتێ کە چونە سەرئاو ڕوو لەقیبلە( مککە) مەکەنو پشتیشی تێ مەکەن، ڕوو لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوا بکەن.

٥)لەکاتی چونە سەرئاوداناوی خوا یان قورئان یان هەندێ لەئایەتەکانی قورئانت با پێ نەبێت، چونکە خەراپە مەکروهە.

٦) لە کاتی سەرئاودا خۆت داپۆشە وخۆت ڕوت مەکەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ أتَىَ الغائطَ فليَستتِرْ**}([4]). واتە: هەر کەسێ کە چووە سەرئاو باخۆی داپۆشێت، وکەس عەورەتی نەبینێت.

٧)تەماشای عەورەتی خۆت مەکە وچاوت بگرە، چونکە خوا شایەنترە بۆ ئەوەی شەرمی لێ بکەیت.

٨)لەکاتی سەرئاودا قسەمەکە، سەلام لەخەڵك مەکە، وەڵامی سەلام مەدەوە، زیکرو یادی خوا بەدەنگی بەرز مەکە، چونکە عبدالله کوڕی عمر-ڕەزای خوایان لێبێت-گوتی:

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] رواه الخمسة وابن ماجه. ومسلم برقم (٢٦٤).

[3] حديث متفق عليه.

[4] أخرجه أبو داود٤٩/١،والحاكم في المستدرك١٥٨/١وصححه ،وصححه ابن خزيمة وابن حبان والبغوي.بڕوانە: التقريب/٤٢٨/٢ .

(کابرایەك بەلای پێغەمبەردا ڕۆیشت کە سەر ئاوی بچوکی دەکرد، کابراکە سەلامی لێ کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوەو هیچ قسەی نەکرد) [1].

٩)لەسەر ئاودا بەدەستی چەپت تارەت بگرە وخۆت پاك بکەوە، چونکە ئەبو قەتادە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{لا يمسّنّ أحدكم ذكرَهُ بيمينه وهو يبولُ، ولايتمسّحْ من الخلاءِ بيمينهِ}[2]. واتە: لەکاتی میزکردندا بەدەستی ڕاستتان عەورەتی پێشەوەتان مەگرن، وە لەسەر ئاویشدا دەستی ڕاستتان بەژێر خۆتاندا مەهێنن بۆ پاکردنەوە.

١٠)دڵنیابوون لەپاکبونەوە لەپیسی، چونکە ئەبو هریرە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{استنزِهُوا من البول، فإنّ عامّةَ عذابِ القبرمنه}[3] واتە:خۆتان لەمیز پاك بکەنەوە، چونکە هەموو ئەشکەنجەی ناوگۆڕ بەهۆی میزەوەیە.

١١)لەئاودەستدا زۆر مەمێنەوە،خۆت بەشتی ترەوە مەشغول مەکە، دەستت بە ئاو تەڕ بکە پێش ئەوە تارەت بگری، میز وشت مەکە ناو کون وکەلەبەرەکانەوە،بەدانیشتنەوە میز بکە نەك بەپێوە،خۆت توشی وەسوەسە مەکە، بەرەو با میز مەکە،لەناو حەمام و مەتبەخ و لەناو گۆڕستاندامیز وشت مەکە.[4].

١٢) کاتێك لەئاودەست تەواوبوی شوێنەکەت پاك بکەوە، بۆئەوە ئەسەر و شوێنەواری پیسیەکە نەمێنێت، وخەڵکیش قسەت پێنەڵێن.

١٣)پاش تەواوبون لەسەرئاو هەردوو دەستت بەئاو وصابون بشۆ، بۆ ئەوەی پیسیان پێوە نەمێنێ، چونکە پێغەمبەرﷺپیاوێکی بینی لەسەر ئاودەست هاتە دەرەوە پێی فەرموو:{بڕۆ بە ئاوو وبە ئەشنان- گیایەکە دەکرێ بەصابون- دەستەکانت بشۆرە}[5].

<u>{سود وبەهرەیەك}</u>: دەست شۆرین بەئاو وصابون، بەتایبەت بۆ منداڵی بچوك وبۆ ئافرەت هەر زۆر زەروریە، بەتایبەت کاتی هاتنەوەیان لەسەرئاودا،چونکە منداڵ نافامێ دەستی بشوا و ئافرەتیش دەست دەخاتە ناو چێشت وچایی و شتەکانی ترەوە زۆر زەرورە دەستیان پاك وخاوێن بێت.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه،وحسّنة الالباني في صحيح سنن أبي داودرقم:١١.

[2] حديث متفق عليه.

[3] أخرجه الدار قطني في سننه.بروانه:(فتح الباري ١/٣٣٦ )وقال الحافظ : صحّحه ابن خزيمة وغيره .

[4] بروانه: منهاج الصالحين للبحيري،ب١/ل:١٢٥-١٢٦.

[5] بروانه: الآداب الاسلامية للناشئة ب١ ل:١٠.ومنهاج الصالحين،ب١/ل:١٢٧.

## پێنجەم : ئادابەکانی دەستنوێژگرتن :

دەستنوێژ گرتن کلیلی نوێژکردنە ومەرجێکی بنەڕەتییە بۆ دروستبونی نوێژ، چونکە کەسێك دەستنوێژی نەبێ نوێژەکەی دروست نابێت. دەستنوێژ گرتن پاکیە،وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {**الطَهُور شَطْرُ الإيمان**} واتە: خۆپاکردنەوە نیوەی ئیمان و باوەڕە. دەستنوێژ گرتن عیبادەت وخوا پەرستیەکە دەبێتە هۆی پاك بوونەوەی مرۆڤ لەگوناهو تاوانەکانی، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ توضَأَ فأحْسنَ الوضوءَ خَرَجتْ خطاياهُ مِنْ جَسده حتّى تخرجَ مِن أظْفاره**}(١) واتە: هەرکەسێك دەستنوێژ بگرێت بەدەستنوێژێکی جوان، ئەوە تاوانەکانی لەجەستەی دەردەچن لەنینۆکەکانیەوە.

**ئەمەش ئادابەکانی دەستنوێژگرتنە پێویستە ڕەچاو بکرێن وبکرێن:**

١-بە (بسم الله) کردن دەست بکە بەدەستنوێژگرتن: ئەبوهریرە-رحمه الله- گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لاوضوءَ لمَن لم يَذْكُرِاسمَ الله تعالى**}(٢)واتە: ئەو کەسەی لەدەستنوێژدا ناوی خوا ناهێنێ دەستنوێژەکەی تەواونیە، جارێك پێغەمبەر ﷺ بەیارەکانی فەرموو: {**تَوضّأوا باسم الله**}(٣). واتە: ناوی (الله) بهێنن و دەستنوێژ بگرن.

٢- لەدەستنوێژگرتندا لەسەرخۆبە،ودڵت ئامادەی دەستنوێژەکەت بکە، چونکە لەسەرخۆیی و ترس لەخوا لەدەستنوێژدا سەرەتایەکە بۆ لەسەرخۆیی و ملکەچی لەنوێژکردندا ولەبەرامبەر خوادا.

٣-لەگەڵ هەموو دەستنوێژێکدا سیواك بەکاربهێنە، چونکە سیواك کردن دەم پاك دەکاتەوە و خوای پەروەردگاریش لەمرۆڤ رازی دەکات. لەم بارەوە ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لولا أنْ أشُقّ على أمّتي لأمَرْتُهمْ بالسّواكِ مع كُلِّ وُضوءٍ**}(٤) واتە: ئەگەر بۆ ئوممەتەکەم ناڕەحەت نەبوایە، فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو نوێژ ودەستنوێژێکدا سیواك بەکاربهێنن.

---

(١) أخرجه مسلم عن عثمان بن عفان في صحيحه.

(٢) الجامع الصغير،٢/٣٩٧،وقال: حديث صحيح.

(٣) أخرجه النسائي في سننه (١/ ٦١) و البيهقي في السنن الكبرى ١ / ٤٣ ، وابن خزيمة برقم : (١٤٤) من حديث أنس بن مالك بإسناد صحيح.

(٤) أخرجه البخاري و مسلم في صحيحيهما وأحمد و مالك في الموطأ.

{**سود و بەهرەیەك**} سیواك كردن ئەم ئادابانەی هەیە، دەبیّ رەچاو بكریّن:

أ-لەبەرچاوی خەلك و لەناو كۆمەلّدا سیواك مەكە،سوننەت نیە،چونكە پیّچەوانەی مروئەتی مرۆڤە.([1]).

ب-سیواكەكەت بشۆوە، ومەهیّلە پیس ببیّ، دوا سیواك كردنەكەشت سیواكەكە بشۆوە، چونكە عائشە دەلیّ:(پیّغەمبەرﷺ سیواكی دەكرد، و پاشان سیواكەكەی دەدایەوە من بۆ ئەوە بیشۆمەوە).([2]).

ج-لەلای راستی دەمتەوە سیواك بەكاربیّنە،چونكە پیّغەمبەرﷺ وا سیواكی كردوە.

د-مندالّەكانیشت لەسەر سیواككردن رابیّنە، فیّری سیواككردنیان بكە.

هـ-بۆ قورئان خویّندن و زیكر كردن و نویّژكردن ، و شەونویّژ سیواك بكە.

و-لە هەموكاتەكاندا وبەتایبت كەتامی دەمت گۆرِا بەهەر هۆیەكەوە بیّت سیواك بكە.چونكە پیّغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ **السواك مَطْهرةٌ للفم مَرْضاة للربّ** }.واتە: سیواك كردن دەم پاك دەكاتەوە، خواش لیّت رازی دەبیّ.

ز- كە گەرِایتە مالّەوە سیواك بكە،ولەكاتی هەستانیش لەخەو خیّرا سیواك بكە، چونكە پیّغەمبەر ﷺ كەلەخەو بەخەبەر دەهاتەوە بۆشەو نویّژ خیّرا سیواكی دەكرد.([3]).

{**هەندیّك لەسودەكانی سیواككردن**} ئیبن قیم الجوزیە دەلیّ: (سیواككردن سودی زۆرە وەك ئەمانە:دەم پاكدەكاتەوە،پوك وچاوبەهیّز دەكات، چالّایی ددان لادەبا،وگەدە تەندروست دەكات و یارمەتی هەزمكردنیش دەدات، قورئانخویّندن و نویّژ و زیكركردن چالاك دەكات، خەویش لادەبا، چاكەكانی مرۆڤ زۆر دەكات، فریشتەكانیش خۆشحالّ دەكات.([4]).

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،لمحمد عبد العاطي ،ب٢ /ل:١٨٥.

[2] رواه البيهقي وأبو داود وحسّنه الألباني في صحيح سنن أبي داود(٥٢)، وتخريج المشكاة(٣٨٤).

[3] حديث متفق عليه ، بروانه :منهاج الصالحين ب٢ / ل:١٨٨.والآداب الإسلامية للطفل المسلم، للشيخ محمود المصري، ل:٨٣ .

[4] منهاج الصالحين ب٢ / ل:١٧٦.

## سودەکانی زانستی وپزیشکی سیواککردن:

أ-سیواکی سەوز ماددەی مازوی تێدایە، دژی هەوکردن وبۆگەنکردنە، وناهێڵێ پوك نەزیف ببێ و بەهێزی دەکات.

ب-ماددەی سنجرینی تێدایە، بۆنی خۆشە، ومیکرۆب وڤایرۆسەکان لەناو دەبات.

ج-چەند مادەیەکی ترشەلۆکی تێدایە ددانەکان لەچلك پاك دەکاتەوە. د-ماددەیەکی صەمغی تێدایە ناهێڵێ ددانەکان خۆرە لێیان بدات.

هـ- کلوراید و سیلکای تێدایە ددانەکان سپی دەکەنەوە.

٤-لەکاتی دەستنوێژگرتندا خۆت لەقسەکردن و پێکەنین و یاریکردن بەئاو بپارێزە، تەنها مەگەر فەرمان بەچاکە وگێڕانەوە لەخەراپە بکەیت، یان وەڵامی سەلام بدەیەوە، لەم کاتانەدا گرفت نیە.

٥-بە مشت ئاو مەدە بە دەم و چاوتدا وەك شەپازلە، بەڵکو لەگەڵ ئاوەکەدا بەهێواشی دەست بێنە بەدەم و چاوتدا،چونکە پێغەمبەر ﷺ واینەکردوە،ئیبراهیمی نخعی دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ ئەوهایان نەکردوە.([1]).

٦-لەدوا دەستنوێژەوە دەتوانی خۆت ووشك بکەیەوە بەتایبەت کاتەکانی سەرما، چونکە پێغەمبەر ﷺکاتێ دەستنوێژی دەگرت مەندیل وپارچە پەڕۆیەکی هەبو دەم و چاوی پێ ووشك دەکردەوە.([2]).

٧-سوربە لەسەر ئەوەی کە زیاد لەشوێنی فەرزەکان بشۆریت بەتایبەت لەکاتەکانی سەرمادا، بۆ نمونە لەگەڵ دەستەکانتدا قۆڵەکانیشت بشۆرە، لەگەڵ قاچەکانتدا هەتا ئەژنۆکانیشت بشۆرە، بەتایبەت لەکاتی سەرمادا، چونکە ئەم کارە لەرۆژی دواییدا بۆتۆ دەبێتە نور و ڕوناکی وپۆشاك، ئەبوهریرە گێڕایەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{ألا أدُلُّكم على مايَمحُو اللهُ به الخطايا، و يَرفعُ به الدرجات؟}** واتە: ئەوە بۆ ئەو شتانەتان پێ نەڵێم کە تاوانەکانتان دەسرێتەوەو پلەوپایەتان بەرزدەکاتەوە؟ یارەکان گوتیان بەڵێ پێمان بڵێ، ئەویش فەرموی: **{إسباغُ الوضوءِ على المكارِه، وكثرةُ الخُطا الى المساجِد و انتظارُ الصلاةِ بعد الصلاة، فذلكمُ الرِباط، فذلكم الرِباط}** ([3]).

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:١٣٤.

[2] رواه البيهقي والنسائي في الكنى بإسناد صحيح.بروانه:تحفة الأحوذي شرح صحيح الترمذي٥٧/١.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه رقم الحديث: ٦٦٤ عن جابير.

واتە:دەستنوێژگرتنی تەواو و کامڵ لەکاتەکانی ناخۆشیدا و زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوتەکان، وچاوەڕێکردنی نوێژی فەرز لەدوا کردنی فەرزێکی ترەوە، ئەمانەن سەنگەرگرتن لە دوژمن ، ئەمانەن سەنگەرگرتن لە دوژمن،

واتە: ئەنجامدانی ئەو کارانە وەك ئەوە وایە بچیە جیهادکردن لە دژی بێباوەڕان و سەنگەر گرتن لێیان. هەر لە ئەبوهریرەوە دەڵێ: گوێم لەخۆشەویستەکەمەوە بو دەیفەرموو: {تبلُغُ الحُلْيَةُ من المؤمن حَيث يبلُغُ الوضوءُ}([1]). واتە: ئاوی دەستنوێژ هەتا کوێ ئەندامەکانی دەستنوێژ بگرێتەوە ئەوە لەدواڕۆژدا خەشڵ وجوانی وپۆشاکی بەهەشتیٚ هەتا ئەو شوێنەت دەگرێتەوە.

٨-لەکاتی دەستنوێژ گرتندا لەشوێنێکی بەرز وپاکدا دەستنوێژ بگرە.

٩-لەدوا دەستنوێژگرتنەوە ئەو نزاو پاڕانەوەیە بکە کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی، پێشەوامان عمر گێڕایەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:((هەر کەسێك لەئێوە دەستنوێژێکی جوان بگرێت و بڵێ: {أشهد أنْ لا إله الاّ الله وحده لا شريك له، وأشهد أنّ محمداً عبدُهُ ورسولهُ}([2])ئەوە لەهەر دەرگایەك لەدەرگاکانی بەهەشت حەز بکات دەچێتە بەهەشتەوە.ئیمام ترمذي ئەمەشی زیادکردوە: {اللهم اجْعلْني من التوّابين واجْعلْني من المتطهّرين}([3])واتە:خوایە لەتۆبەکاران ولەپاکانم بگێڕە.

١٠-لەدوادەستنوێژ گرتنەوە دوو ڕکات نوێژ سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : {ما مِنْ أحَدٍ يتوضأ فيُحْسن الوضوءَ و يصلّى ركعتين يُقْبِلُ بقلبه و وجْهِهِ عليهما إلاّ وجَبَتْ له الجنة}([4]).واتە:هەرکەسێك لەئێوە دەستنوێژ بگرێت بەدەستنوێژێکی چاك، پاشان دوو ڕکات نوێژ بەدڵ و بەئاگاییەوە بکات، ئەوە بەهەشت بۆ ئەو کەسە واجب دەبێت.

١١-لە دەستنوێژ گرتندا ئاوسەرف مەکە و ئیسراف مەکە، سەعد-رحمه الله- گێڕایەوە گوتی: (پێغەمبەر ﷺ بەلامدا هات،ومنیش دەستنوێژم هەڵدەگرت، پێی ووتم:{ئەی سەعد لەئاوی دەستنوێژدا ئیسراف مەکە}، منیش گوتم: بۆ لەئاو سەرف کردندا

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه رقم الحديث:٢١٩ .

[2] البدر المنير،٢ /٢٨٤،وهو صحيح،أخرجه مسلم وأحمد في مسنده.

[3] أخرجه الترمذي في سننه رقم:٥٥، وقال: في إسناده اضطراب.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

ئیسراف هەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟، ئەویش فەرموی: بەڵێ: {هەرچەندە لەسەر ڕووباریش بیت ئاو سەرف مەکە} چونکە ئیسرافکردن لە ئاویشدا گوناهە، وخوا جل جلالە پێی ناخۆشە (1).

١٢-ئەگەر ناچار نەبی بۆخۆت دەستنوێژی خۆت بگرە، باخەڵك بۆت نەگرێ، زانایان لەسەر ئەمە یەکدەنگن کەوا ئینسان بۆ خۆی دەستنوێژی خۆی بگرێ، تەنها مەگەر ناچار بێ ئەوکاتە دروستە.(2).

<u>{سود وبەهرەیەك}</u> پاك وخاوێنی چوار پلە وپایەی هەیە:

١- پاك وخاوێنی جەستەیە لەبێدەستنوێژی ولەپیسیەکان.

٢-پاك وخاوێنی ئەندامەکانە لەگوناهو تاوان،چونکە ئەندامەکانی مرۆڤ وەك جۆگەلە وایە ، شتی صاف و لیڵ دەهێنێ،جاهەرکەس گوناهو خەراپە نەکا ئەوە گەدەی دڵی پاك و چاك ودور لەنەخۆشیەکان دەبێ، بەلام بەپێچەوانەوە دڵەکە پڕ دەبێ لەچڵك وچەپەڵی و لە نەخۆشی.

٣-پاك وخاوێنی دڵە لە ڕەوشتە نزمەکانی وەك: حەسودی، ڕق وکینە، فیز وخۆبەزلزان و تەماع وپیسکەیی، وهتد.

٤- پاك وخاوێنی دڵە لەغەیری خوا جل جلالە، وەئەمەش لەهەمو پلە وپایەکانی تر بەرزتر وبالآترە.(3).

## شەشەم: ئادابەکانی نوێژ کردن:

نوێژکردن لەئیسلامدا وەك سەر وایە بۆ جەستە،دیارە سەر نەبێ مرۆڤ ژیانی نابێ،بۆیە کەسێك نوێژ نەکا دینی تەواو نیە،نوێژکردن پایەیەکە لەپایەکانی ئیسلام،بگرە لەدوا شایەتومان پایەی دوەمی ئیسلامە، نوێژکردن گەورەترین کردەوەی ئەندامەکانی مرۆڤە، هەروەك چۆن ئەمە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە و فەرمویەتی: {وعَمُودُهُ الصَّلاة}(4). واتە: نوێژکردن ستون وکۆڵەکەی ئاینی ئیسلامە.

---

1 كنز العمال،رقم:٢٧٠٢٧،وقال: حديث صحيح.

2 منهاج الصالحين ،ب١/ل:١٣٥.

3 منهاج الصالحين،ب١/ل:١٣٣.

4 جامع الأصول في أحاديث الرسول للجزري،رقم الحديث:٧٢٧٤، والتأريخ الكبير للبخاري،رقم:١٨٦٦.

خوا جل جلاله هەمو عیبادەتێکی لەسەر زەوی فەرزکردوە،بەلأم لەبەرزترین جێگاو لە پیرۆزترین شەودا کە شەوڕەوی پێغەمبەر بوو ﷺ بۆ ئاسمانەکان،وبەبێ نێوانی کردنی هیچ کەسێك خوا جل جلالە نوێژی لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرزکرد، یەکەمجار پەنجا نوێژی فەرزکرد،لەدواهەولێکی زۆری پێغەمبەر ﷺ ئەمجا خوا جل جلالە پەنجا نوێژەکەی کردەوە بەم پێنج فەرزەی ئێستا،ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی وپیرۆزی نوێژ لەناو هەموعیبادەتەکانیتردا، بۆیە نوێژکردن بناغەو دایك و ئەصڵی هەموو عیبادەتەکانە، چونکە هەمو جۆرەکانی پەرستنی جەستەی ئینسانی تێداهەیە، وەك:دڵ و عەقڵ و زمانی، کەهەر یەکەیان بەشێك لەنوێژکردن دەگرێتەوە ([1]).

یەکەم شت لەرۆژی دوایدا کە ئینسان لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت نوێژە و کۆتا شتیش کەپێغەمبەرﷺ لەکۆتایی ژیانیدا راسپاردەی ئوممەتەکەی کرد نوێژکردن بوو.

**لەبەر گرنگی نوێژ ئەم ئادابانە پێویستە ڕەچاو بکرێت وبکرێن:**

١)بەئارەزویەکی گەورەو بەخۆشەویستی وبەشەوق و چالاکی گەورە وە ڕوو لە نوێژەکەت بکەو بچۆ ناو نوێژەوە.

٢)پێش چونە ناو نوێژەوە پۆشاکی پاك لەبەربکە وخۆت بۆنخۆش بکە وسیواك بکە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾ الأعراف: ٣١ واتە: ئەی مرۆڤەکان لەکاتی نوێژکردن ولە کاتەکانیتریشدا خۆتان داپۆشن،وپۆشاکی جوان و پاك لەبەربکەن وخۆتان پاك بکەنەوەوخۆتان بۆنخۆش بکەن([2]).

٣)کاتێك کە نوێژ دابەسترا نوێژی سوننەت مەکە، چونکە ئەبوهریرە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **((إذا أُقيمَتِ الصلاةُ فلا صلاة إلاّ المكتوبة))**([3]) واتە: هەر کاتێك نوێژ دابەسترا هەرنوێژی فەرز دەکرێت ، نوێژی سوننەت ناکرێت.

---

[1] بروانە: الموسوعة الآم في تربية الأولاد ، للدكتور احمد مصطفى متولي ب١ ل: ٢٢٨ .ومنهاج الصالحين، ب١/ل:١٦٧.

[2] بروانە: تيسير الكريم الرحمن ، لعبدالرحمن ناصر السعدى.وتفسير البحر المحيط لأبي حيان الأندلسي.

[3] أخرجه مسلم.في صحيحه.

٤)پێش نوێژکردن هەموو کارەکانت و پێداویستیەکانت جێبەجێ بکە، بۆئەوەی دڵت بۆ خوا جل جلاله لەناو نوێژدا یەکلاببێتەوە ،عائیشە گێڕایەوە گوتی: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: (( **لا صلاة بحضرة الطعام، و لا هو يُدافعُه الأخبثان**)) ([1]) واتە: کاتێك کە خواردن دانرا، یان کاتێك کە دەستی ئاوت هەبوو، و تەنگاوبوی نوێژ مەکە، چونکە ئەو کاتە نوێژەکەت تەواو نابێ و کامڵ نابێت.

٥) کە دەست دەکەیت بەنوێژکردن زۆر هێواش و لەسەرەخۆبە وبەترسان لەخواجلجلالە بچۆ ناو نوێژەوەو عائیشە–**رضي الله عنها**–گوتی:ئێمە لەگەل پێغەمبەردا قسەمان دەکرد، و ئەویش قسەی لەگەلدا دەکردین، بەلأم کەکاتی نوێژ دەهات پێغەمبەرﷺوەك ئەوەی لێدەهات کە نەبمان ناسێ ونەبیناسین، بۆ؟ لەبەر ترسانی لەخوا جلجلالە.([2]).

٦)لەناو نوێژدا تەماشای شوێنی سوجدەکەت بکە وئاوڕمەدەوە و پێمەکەنە، بەپۆشاك و دەستەکانت یاری مەکە، عائیشەگێڕایەوە گوتی: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: {**هو اختلاسٌ يَختلسُهُ الشيطانُ مِن صلاة العبد**}([3])واتە: ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا دزییەکە شەیتان بەنوێژ خوێنی دەکات.

٧)لەناو نوێژدا ئەو ئایەتو زیکرانەی کەدەیان خوێنی لێیان وردببەوە، عماری کوڕی یاسر دەڵێ پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{ **إنّ الرجل لَيَنْصَرِف عن صلاته و ماكُتِبَ له إلاّ عُشْر صلاته، تُسْعها، ثُمْنها، سُبْعها،....**}([4]) واتە: ئینسانی وا هەیە کەلەنوێژەکەی دەبێتەوە تەنها دەیەك، یان نۆیەك، یان هەشتیەك، یان حەوتیەك، یان شەشیەك،... یان نیوەی نوێژەکەی بۆ دەنوسرێت.

٨)لەنوێژدا بەئارام و لەسەرەخۆبە، پەلە پەل مەکە، چونکە ئەم لەسەرەخۆییە، وپەلە پەل نەکردنە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٩)هەوڵ بدە لەناو نوێژدا هەتا ئەتوانی خۆت بپارێزی لە باوێشکدان و پژمین و قرقێنە هاتنەوە ، ئەبوهریرە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**التثاؤبُ في الصلاة**

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:١٦٨.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] أخرجه أحمد رقم (١٨٧٨١ ) بإسناد صحيح، وأبو داود وحسّنة الألباني.

**من الشيطان، فاذا تثائَبَ أحدُكُم فليكْظِمْ ما استطاع**} (١). واتە: باوێشکدان لەناو **نوێژدا** لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر ئێوە باوێشکتان هات بەگوێرەی توانا بیگرنەوە و مەهێڵن بێت.

١٠)هەوڵ بدە لەکاتی خۆیدا و لەسەرەتای کاتەوە نوێژەکەت ئەنجام بدە وبەبێ هۆ دوای مەخە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لێ کردو گوتیان: چ کارێك لەکارەکان خێری زیاتر و گەورەترە؟، ئەویش فەرموی: {**الصلاة عَلَى وقتها**} (٢). واتە: **نوێژکردن** لەکاتی خۆیدا لەهەمو کارەچاکەکانی تر خێری زیاترە.

١١)لەدوا نوێژ تەواوبون لەشوێنی خۆتدا دابنیشە ویرد و دوعا بخوێنە، ئەبو ئومامە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: بەپێغەمبەریان گوت: چ دوعاو نزایەك زوتر گیرا دەبێت؟ پێغەمبەریش ﷺ لەوەڵامدا فەرموی: {**جوف الليل الآخِر، ودُبُر الصلوات المكتوبات**}(٣)واتە: ئەو دوعا ونزایە زوتر گیرا دەبێت کە لەنیوەشەودا بکرێت، یان لەدوا نوێژە فەرزەکانەوە بکرێت.

هەروەها ئەبوهریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{هەر کەسێك لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە (٣٣) جار (سبحان الله)و(٣٣) جار (الحمدلله)و(٣٤) جار (الله أكبر) بکات، وئەمجار یەکجاریش بڵێ: **لا اله الا الله وحده لاشريك له، لهُ الملك وله الحمد، وهو على كلّ شيءٍ قدير**}ئەوە ئەو کەسە هەرچەندە گوناهەکانی وەك کەفی دەریا بێت خوای پەروەردگار لێی دەبورێت(٤).

١٢-لەگەڵ بەجێهێنانی نوێژە فەرزەکان نوێژە سوننەتە راتیبەکان کە لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندا دەکرێن بەجێیان بهێنە، رملەی کچی ئەبو سوفیان دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەرەوە بوو ﷺ دەیفەرموو: {**ما من عبدٍ مسلمٍ يصلّي لله تعالى كلّ يومٍ ثنتا عشرة ركعةً تطوّعاً غير الفريضة، إلاّ بَنَى اللهُ له بيتاً في الجنّة**} (٥). واتە: هەر کەسێ هەموو رۆژێك دوازدە رکات نوێژی سوننەت بکات لەگەڵ فەرزەکاندا ئەوە خوای پەروەردگار خانویەکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات.

---

١أخرجه البخاري في صحيحه..

٢حديث متفق عليه.

٣أخرجه الترمذي في سننه. رقم الحديث ( ٣٤٩٩) وقال : حديث حسن .

٤أخرجه مسلم في صحيحه.

٥أخرجه مسلم في صحيحه.

**( ئاگاداری)** ئەودوازدە ڕکاتە سوننەتە ئەمانەن: دو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، ودو لەدوایەوە، دوڕکات لەدوا نوێژی مەغریبدا، دوڕکات لەدوا نوێژی عیشادا،ئەمانە پێیان دەگوترێ: سوننەتی ڕاتیبە، واتە: ئەو سوننەتانە کە لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندا دەکرێت.

١٣-هەوڵ بدە نوێژەکانت بەکۆمەڵ( جەماعەت) و لەمزگەوتدا ئەنجام بدەیت، چونکە عبدالله ی کوڕی عمر -رحمهما الله-گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {صلاة الجماعة أفضلُ مِن صلاة الفذِّ بسَبْعٍ وعشرين درجةً}([1])واتە:نوێژی بەکۆمەڵ(جماعەت) گەورەترو خێری لە نوێژی بەتەنها زیاترە بەئەندازەی بیست وحەوت پلە.

١٤)هەوڵ بدە بەرو بومەکانی نوێژ کردن وەك: یادی خوا وشەرم موراقەبە و ترس لەخوا بەدەست بهێنە، واز لەهەمو قسەو کارێکی خراپ و ناپەسەند بهێنە، پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾طه: ١٤

واتە: تەنها بەخاتری زیکرو یادی منەوە نوێژەکەت بەرپا بکەو ئەنجامی بدە.

هەروەها خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴾ العنكبوت: ٤٥.

واتە: نوێژ بکە، بەراستی نوێژ لەخەراپە وکاری ناشیرین دەتان گێڕێتەوە.

عبدالله ی کوڕی مسعود-رحمه الله -گوتویەتی: {مَنْ لم تأمُره صلاتُه بالمعروف وتنهاه عن المنكر لم يزددْ من الله إلا بُعدًا}([2]). واتە: هەر کەسێك نوێژەکەی فەرمانی چاکەی پێنەکات ولەخەراپە وکاری ناشیرین نەیگێڕێتەوە ئەوە ئەو کەسە لەخوا نزیك نەبۆتەوە.

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] رواه الطبراني في الكبير ورجاله رجال الصحيح، بروانە:مجمع الزوائد،ب٢/ل٥٣١.

## حەوتەم: ئادابەکانی نانخواردن:

خواردن نازو نیعمەتێکی گەورەی خواییە، لەزۆر لەئایەتەپیرۆزەکانی قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، خوا جل جلالە کاروبارەکانی ئاسمان وزەوی رێکخستوە، وباران دەبارێنێ، و ریزق و رۆزی بەمرۆڤەکان دەدا، بۆ ئەوە دین و ژینی خۆیان تەواو بکەن ،بۆیە هەر کەسێك بەهۆی خواردنەوە زانست و زانیاری بەدەست بهێنێ، وکارو کردەەی چاك ئەنجام بدا، وخۆی بۆ خواپەرستی بەهێز بکات، ئەوە بە تەئکید خێر و پاداشێکی زۆری دەست دەکەوێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إنّ الرجلَ ليُؤجرُ حتّى في اللقمة يَرْفعُها إلى فِيه وإلى فِيّ أمرأته**}(١) واتە: مرۆڤ لەسەر ئەو تیکەیەی کە دەیبا بۆ دەمی خۆی، یان دەیدا بە منداڵ وهاوسەرەکەی خێر وپاداشتی لەسەر وەردەگرێتەوە.بۆیە جیاوازی نێوان بڕوادار وبێباوەڕ ئەوەیە: بڕوادار خواردن دەخوا بۆ ئەوە بۆ دینداری بەهێزبێت، دەژیا بۆ ئەوە کارۆ کردەوەی چاك بکات ودونیا ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام بێباوەڕ دەژیا بۆ ئەوە بخوا وهەرچی لەزەت وخۆشی هەیە بەدەستی بهێنێ،وەك ئاژەڵ وبڕواشی بە دواڕۆژ نیە(٢).

**نان خواردن ئەم چەند ئادابانەی هەیە، پێویستە جێبەجێ بکرێن:**

١) پێش نان خواردن ودوا نان خواردن دەستەکانت بشۆ، ئەبو هریرە گێڕاویەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**مَنْ بات وفِي يده ريحُ غَمَرٍ، فأصابه شيْءٌ، فلا يَلومَنَّ إلاَ نفسَه**}(٣).واتە:هەر کەسێك لەدوا نانخواردنەوە دەستەکانی نەشوا، چەوری یان بۆنی خواردنی پێوە بمێنێ، وجانەوەرێك،یان شتێکی ژەهراوی، یان جنۆکەیەك، ئەزیەتی بکەن، یان توشی بەڵەکی ببێت، ئەوە ئەو کەسە تەنها بالۆمەی خۆی بکات وبەس.

هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانێ دەست شۆرین لەپێش نانخواردن و لەدوا نانخواردندا چەند پاك وخاوێنیە وچەند پارێزگاریکردن لەنەخۆشیەکانی تێدا هەیە،بەتایبەت بۆ منداڵ و بۆ ئافرەت، وەك باسمان کرد، بۆیە ئایینی ئیسلام زۆر گرنگی بەپاك و

---

(١) أخرجه البخاري في صحيحه.

(٢) منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية ، ب١،ل:٣٠٣.

(٣) أخرجه الترمذي وأبو داود وابن ماجه وأحمد،وصحّحه الالباني.

خاوێنی داوەو گرینگترینی ئەو شتانەی کە مسوڵمان لە غەیرە مسوڵمان جیا دەکاتەوە، پاك وخاوێنی دڵ ودەرون وروالەتی مسولمانە، دڵ ودەرونی پاکە لەهەموسیفەتە خەراپەکانی وەك: حەسودی، فیز، پیسکەیی، رەزیلی، هتد، وەڕوالەتیشی پاکە لە هەرچی شتی قێزەونی وپیس وپەلۆسی هەیە، وەگرینگترینی ئەو کارانەی کە لەشساغی و تەندروستی مرۆڤ دەپارێزێ گرنگی دانی مرۆڤە بەپاك وخاوێنی،ئەوەش بەوە دەبێ لەپێش نانخواردن ولەدوا نانخواردنەوە دەستەکانی بشوا وخۆی پاك بکاتەوە، بۆ ئەوە توشی نەخۆشی نەبێ و دوربێ لە هەرچی میکرۆبات و ڤایرۆس و پیس و پەلۆسی هەیە[1].

**{چەند سودێك}** لەفەرمودەدا هاتوە: دەست شۆرین لەپێش خواردنەوە هەژاری لادەبا، وەلەدوا خواردنیشەوە شێتی لادەبا،وەپێویستە دەستە تەڕەکەی بەپەڕۆ و خاولی ووشك نەکاتەوە،نەوەك میکرۆبی پێوە بێ، وە پێویستە منداڵ لەپێش گەورەکانەوە دەستی بشوا ، چونکە منداڵ دەستی زیاتر پیس دەبێ.(٢).

٢)نابێ بەپاڵکەوتنەوە خواردن بخۆیت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{أنا لا آكُلُ متكئاً}**([3]) واتە: من بەپاڵکەوتنەوە خواردن ناخۆم،بەدانیشتنەوە نان دەخۆم.

٣)پێش دەست بە خواردنکردنبەدەنگی بەرز بسم الله بکەوبەدەستی ڕاستیش دەست بەخواردن،بکە، لەم بارەوە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: **{سَمِّ اللهَ، وكُلْ بيمينك، وكُلْ مما يَليك}** ([4]) واتە:بەدەنگی بەرز (بسم الله) بکەو بەدەستی ڕاستت بخۆو لەلای خۆشتەوەبخۆ،جابیر گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : **{لاتَأْكُلوا بالشّمال،فإنّ الشيطان يأكُلُ بالشمال}**([5])واتە:بەدەستی چەپ خواردن مەخۆ، چونکە شەیطان بەدەستی چەپ خواردن دەخوات،بۆیەبەدەستی چەپ نان وئاو خواردن خەراپە، چونکە دەستی چەپ زیاتر بۆ تارەتگرتن ولابردنی پیسی و شتی خەراپ بەکار دەهێنرێ.

---

[1] من آداب الطعام للزهراني،ل:٥٣.

[2] آداب الأكل للأقف هسي،ل:٦.

٣أخرجه البخاري برقم (٤٧٢).

٤أخرجه البخاري (٤٥٨) ومسلم (٢٠٢٢).

٥أخرجه مسلم في صحيحه و الترمذي في سننه.

شێخ عوثەیمین–رحمه الله–گوتویەتی: (بسم الله) کردن واتە: بڵێ: (بسم الله)، وە ئەگەر بشڵێی:(بسم الله الرحمن الرحیم) هیچ خەراپەی تێدانیەودروستە.([1]).وە ئەگەر مرۆڤ (بسم الله) لەبیرچوو لەسەرەتاوە، با لەناوەڕاستەوە بڵێ: (بسم الله أوّلَه و آخِرَه) ([2]).

<u>{سود و بەهرەیەك}</u> سوننەتە لەکاتی خواردن وئاوخواردنەوەدا بەدەنگی بەرز(بسم الله) ی بکرێت، چونکە (بسم الله) ذیکرە، ذیکریش دروستە بەدەنگی بەرز بگوترێ،شێخ ملاّ علی القاری دەڵێ:هەمو زیکرێکی ڕەوا واجب یان سوننەت،بەبێ گوتن بەزمان هیچ ئیعتیباری پێ ناکرێت.([3])

ئەمە خاڵێکی گرنگە پێویستە ئێمە هەڵوێستەی لەسەر بکەین، بەتایبەت ذیکرە کاني نوێژ، بۆ ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نەبێت، یان خێرەکەی کەم نەبێتەوە،بۆیە زۆرێك لە زانایان گوتویانە:هەر کەسێك زیکری ڕەوا بەدەنگی بەرز نەڵێ، ئەوە هیچ خێری نیە، دەبێ دوبارەی بکاتەوە، شێخ بن بازیش–رحمه الله– ئەم قسەیەی گوتوە ([4]).

٤)خواردنی حەڵاڵ و زەلاڵ و پاك بخۆ، خواردنی حەرام و پیس مەخۆ، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَـٰلًا طَيِّبًا.... ﴾ (النحل: ١١٤) واتە: لەو ریزق و رۆزیە حەلاڵ و پاکەی کە خوا پێێ داون بخۆن،کەعبی کوڕی عەجرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی {كلّ لَحْمٍ نَبَت من الحرام فالنار أَوْلَى به}([5]) واتە: هەر گۆشتێکی مرۆڤ بە ماڵی حەرام دروست بێت، ئەوە ئاگر بۆی باشترە.

٥)لەخواردنی پاك و خاوێن بخۆ، لە میوەی نەشۆراوە وخۆراکی پیس بوو، یان سەرهەڵدراوە خۆت بپارێزە ، زەرەرو زیانی بۆ جەستەت هەیە.

---

١ شرح رياض الصالحين ٧ / ١٩٦.

٢بڕوانە الإرواء ٧ / ٢٤، والموسوعة الام في تربية الاولاد في الاسلام ب١ ل:٤٥٤.

٣بڕوانە :مرقاة المفاتيح لملا على القارى ٨ / ٩.

٤من آداب الطعام للزهراني،ل:١٢.

٥أخرجه الترمذي وحسّنه،بڕوانە:تخريج أحاديث الإحياء، رقم:١٦٤٥.

٦)عەیب لەخواردن مەگرە، ئارەزووت لێی بوو بیخۆ، ئارەزوت لێی نەبوو مەیخۆ، ئەبوهریرە دەڵێ: {پێغەمبەر ﷺ قەت عەیبی لەخواردن نەگرتووە، ئەگەر ئارەزوی بکردایە دەیخوارد،وە ئەگەر ئارەزووی نەکردایە نەی دەخوارد}([1]).

٧)تیکەوپاروی بچوك بکە، تیکەکە چاك بجاوە ئنجا قووتی بدە، ئەم تیکەیە بخۆ پاشان تیکەیەکی تر بخۆ.

٨)فوو لەخواردنی گەرم مەکە،ئەسمائە-ڕەزای خوای لێبێت-خواردنی گەرمی دادەپۆشی هەتا سارد دەبۆوەودەیگوت:من گوێم لەپێغەمبەر بو دەیفەرموو :

{هو أعظم للبركة}([2]) واتە:خواردن سارد ببێتەوە فەرو پیرۆزیەکەی گەورەترە لەوەی کە بەگەرمی بخورێ،وە خواردنی گەرم و زۆر سارد مەخۆ چونکە زەرەرو زیانیان هەیە.

٩)دەمت مەبە سەر قاپەکەی بەردەمت، نەبادا خواردەمەنی ناودەمت بێتەوە ناو قاپەکە.

١٠)دوو دەنکە خورما،یان ترێ یان قۆخ و شتیتر بەیەکەوە مەخۆ کاتێك کە لەگەڵ کۆمەڵێکدا خورما یان شتی تر دەخۆی، مەگەر بەپرسی خەڵکەکە، چونکە عبد اللەی کوڕی عمر گوتی:پێغەمبەر ﷺ ئەمەی قەدەغە کردوە.([3]).

١١)خواردن زۆر مەخۆ، زۆرخۆر مەبە، ئەوەندە بخۆ سودی هەبێت نەك زەرەرت لێ بدا، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ الأعراف: ٣١ واتە: بخۆن و بخۆنەوە و ئیسراف مەکەن، چونکە خوا ئیسراف و ئیسرافکارانی خۆش ناوێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ماملأ ابنُ آدم وعاءً شراً مِن بطنه، حَسْبُ ابن آدم أُكُلَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَه، فإنْ لم يفعلْ فثُلثٌ لطعامه، وثُلثٌ لشرابه، وثُلثٌ لِنفَسِه}([4]) واتە: مرۆڤ بۆ بەهێزکردنی خۆی چەند تیکەیەکی بەسە، جا ئەگەر هەر زیاتری کرد، ئەوە با بەشێکی سکی بۆ خواردن بێت ، و بەشێکی تریشی بۆ ئاوخواردنەوەبێت، و بەشەکەی تریشی بۆ هەناسەدانی بێت.

---

[1] أخرجه البخاري (٤٧٧) ومسلم (٢٠٦٤). بروانە:من آداب الطعام، للزهراني.

[2] أخرجه الدارمي،و أورده الألباني في الصحيحةبرقم: ٣٩٢.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[4] أخرجه أحمد رقم:١٧٣١٨،والترمذي رقم:٢٣٨٠وقال:حديث حسن،

١٢)کۆبونەوە لەسەر سفرەیەك و پەرتەوازە نەبوون،لەم بارەوە وەحشی کوڕی حەرب گێڕایەوە گوتی: ( هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە هەر خواردن دەخۆین بەڵام تێر ناخۆین ئەوە چییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {ئێوە دیارە پەرتەوازە بوون؟ یارەکان گوتیان: (بەڵێ ئێمە پەرتەوازە بووین)ئەمجا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {**فاجْتمِعوا على طعامكم، واذكرُوا اسمَ الله يُبارَكْ لكم فيه**} ([1]) واتە: لەکاتی خواردندا کۆببنەوە لەسەر سفرەیەك و ناوی خوابهێنن، خوای پەروەردگار فەڕو پیرۆزی خۆی دەخاتە ناو خواردنەکەتانەوە.

١٣)لەسەر نانخواردن باسی داستانی پیاوچاکان بکە، یان شتی خێر باس بکە، یان فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە بکە.

١٤)لەکاتی نانخواردندا پێکەنینی بەقاقا، یان گاڵتەکردن بەکەس مەکە.

١٥)خواردن بەسەر خواردندا مەکە، وەهەتا برسیت نەبێ خواردن مەخۆ، چونکە بۆ تەندروستیت زۆر زیانی هەیە، بۆیە ئیمامی شافیعی- رحمەاللە- گوتویەتی:

**ثلاثٌ مُهْلِكَاتُ الأنام- أو داعية الصّحيح إلي السّقام.**

**دوام مُدامةٍ و دوام وَطْءٍ- وإدخالُ الطّعام على الطّعام.**

واتە:سێ شت لەناوبەری مرۆڤەکانن یان نەخۆشیان دەخەن، ئارەق خواردنەوەی بەردەوام وجیماع کردنی بەردەوام خواردن بەسەر خواردندا، واتە:زۆر خۆری(٢).

١٦)لەقاپی زێڕو زیودا خواردن و خواردنەوە مەخۆ چونکە حەرامە.

١٧)لەخواردندا یەك جۆرە خواردن مەخۆ،چونکە هەندێ خواردن هەیە بەتەنها زەرەری هەیە،بۆیە پێغەمبەرﷺ کەکاڵەگی بخواردایە خورمای لەگەڵدا دەخوارد، ودەیفەرمو: گەرمی خورماکە ساردی کاڵەگەکە لادەبا.

وە پێغەمبەر ﷺ دووخواردنی ساردو دووخواردنی گەرمی بەیەکەوە نەخواردوە، زانیاری زیاتر لەم بارەوە لەزانستی پزیشکیدایە ([3]).

---

[1] أخرجه ابو داود (٣٧٦٤) و حسّنه الألبانى في صحيح ابي داود (٣١٩٩).

[2] ديوان الإمام الشافعي، رحمه الله، ل:٢٣.

[3] أخرجه الترمذي وأبوداود بإسناد صحيح.

١٨)لەپێش کەسێك لەخۆت گەورەتر یان بەتەمەنتر، یان کەسێکی زاناتر دەست بە خواردن مەکە، یارەکان- رەزای خوایان لێ بێت- دەڵێن: هەتا پێغەمبەر ﷺ دەستی بەخواردن نەکردایە، ئێمە دەستمان پێ نەدەکرد[1].

١٨)لەدوا نانخواردنەوە سوپاس و ستایشی خوا جلجلاله بکە، چونکە ئەبو ئومامە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە لەخواردن دەبۆوە دەیفەرموو: {الحمدلله كثيراً طيّباً مباركاً فيه،غير مكفِيِّ ولا مودَّعٍ ولامستغنىً عنه ربّنا} [2]واتە:ستایشی زۆر وپاك پیرۆز بۆ خوا، ئێمە لە پەروەردگارمان بێنیازنین،وجگە لەخوا هیچ کەسێکیش نیە کیفایەتمان بدا، هەرخوا بۆ ئێمە بەسە ولەهەموکەسێکیش چاکترە. وە دەتوانن ئەم دوعایەش بخوێنن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { الْحَمْدُلِلَّه الَّذِي أَطْعَمَ وَ سَقَى وَ سَوَّغَه ُوَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجًا}[3] واتە:ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێداین ،وخواردنەکەشی بۆ ئاسانکردین و شوێنی دەرچونەکەشی بۆ داناوین.

وە دەشتوانن ئەم دوعایەش بخوێنن کە پیغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{اللَّهُمَّبارك لنافيه،وَأَطْعِمْنَاخَيْرًامِنْهُ}[4]واتە:خوایە فەڕ وپیرۆزی بخە ناو خواردنەکانمانەوە، خوایە خواردنی چاکترمان پێ بدە.

## نانخواردن بەچی تەواو وکامڵ دەبێت؟

ئیمام أحمد-رەحمەتی خوای لێ بێت- باسی کردوە ودەڵێ:ئەگەرنانخواردن ئەم چوار شتەی تێدا هەبێ، ئەوە خواردنێکی تەواوە.

١)لەسەرەتای خواردنەکەوە (بسم الله)ی لەسەر کرابێت.

٢)لەکۆتاییەوە سوپاس و ستایشی خوای لەسەر کرابێت.

٣)نانخواردنەکە لەسەر سفرەودەستی زۆروبەکۆمەڵ بێت.

٤)خواردنەکە حەڵاڵ بێتوبەکاسبی حەلاڵ و زەڵاڵ پەیداکرابێت.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه البخاري برقم: (٥٠١).والموسوعة الام في تربية الاولاد في الإسلام ب١/ل:٢١، والآداب الاسلامية للناشئة ب١ ل:٤٣-٤٧.

[3] أخرجه أبوداود،وصحّحه الالباني رحمه الله.

[4] أخرجه الترمذي وقَالَ:حَدِيثٌ حَسَنٌ، وأخرجه ابن ماجه ،وحسّنه الألباني، وحسّنه الأرناؤوط في زاد المعاد ٤ / ٢١٧.بروانە: من آداب الطعام،للزهراني.

## هەشتەم: ئادابەکانی ئاو خواردنەوە :

ئاو خواردنەوە وەك خواردن وایە، بگرە زۆرلەو زەرورترە،مرۆڤ وباڵندە وماڵات زۆر زیاتر پێویستیان بەئاوە، بەبرسیەتی ئیدارە دەکرێ بەڵام بەتینوێتی ئیدارە ناکرێ،خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿وجَعَلْنا مِنَ المَاء كُلّ شَيْءٍ حَيّ﴾الأنبياء: ٣٠،ئیبن قیم لەبارەی ئاوەوە دەلێ:ئاو سەرچاوەی ژیانە،لە هەمو خواردنەوەکان گەورەترە، یەکێکە لەپایە هەرە گەورەکانی جیهان،چونکە ئاسمانەکان لەهەڵمی ئاو دروستکراون، وزەویش لە کەفەکەی و هەمو شتێکی زیندوش لەئاو دروستکراوە(١).

### ئاوخواردنەوە کۆمەڵێك ئادابی هەیە پێویستە جێبەجێ بکرێن:

١) لەسەرەتاوە {بسم الله} بکەو لە کۆتاییشدا سوپاسی خوا بکە، چونکە ئەمە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

٢)ئاو خواردنەوە بەدانیشتنانەوە چاکترە لەڕوی تەندروستی ولەڕوی ئەدەبەوە چونکە ئەنەسی کوڕی مالك گێڕاویەوە گوتی: {**نَهی رسولُ الله ﷺأَنْ يَشْرَبَ الرّجُلُ قائماً**} واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کەوا ئینسان بەپێوە ئاو بخواتەوە، یارەکانی گوتیان: ئەی نان خواردن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {**ذاك أشرُّ وأخبثُ**}([2]) واتە: نانخواردن بەپێوە خەراپتر وپیسترە، بەڵام ئاو خواردنەوە بەپێوە دروستە، چونکە ئیبن عباس گێڕایەوە گوتی:(من ئاوی زەمزەمم دا بەپێغەمبەر ﷺ ئەویش بەپێوەخواردیەوە.([3]).

٣)بەدەستی ڕاست ئاو بخۆوە، چونکە ئەمە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرو یارەکانی و شوێنکەوتوانیەتی.

٤-ئاو خواردنەوە بەسێ هەناسە ولەدەرەوەی قاپەکەوە، ئەنەسی کوڕی مالك گێڕایەوە گوتی: {**إنّ رسولَ الله كان يَتنفّسُ في الشراب ثلاثاً**}([4]) واتە:پێغەمبەر ﷺبە سێهەناسە لەدەرەوەی قاپەکەیەوە ئاوی دەخواردەوە.

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١/ل:٣٢١.

١رواه مسلم في صحيحه.

٣رواه البخاري (١٧ ٥٦) ومسلم (٢٠٢٧)

٤أخرجه البخاري (٨١) ومسلم (٢٠٢٨).

٥-نابێ لەناو ئاودا هەناسە هەڵبکێشی، ئەبو قەتادە گێڕایەوە گوتی: {أنَّ النبيَّ ﷺ نَهى أنْ يُتنفَّسَ في الإناءأو يُنفخَ فيه} (١) واتە: پێغەمبەر ﷺ هەناسەدانی ناو ئاو، یان فوو لێکردنی قەدەغە کردوە.

٦-لەئاو خواردنەوەدا نابێ دەم بنێیٚ بەدەمی کوندەو شەربەوە، چونکە ئەبوهورەیرە گێڕایەوە گوتی: {نَهى رسُولُ الله ﷺأنْ يُشْرَبَ منْ فِيِّ القُربة أو السِقاء}(٢) واتە: پێغەمبەر ﷺ ئاو خواردنەوەی لەدەمی کوندە و شەربەی قەدەغە کردووە.بەڵکو دەبێ بکرێتەناو قاپێکەوە.

٧-لە قاپی زێڕو زیودائاو خواردنەوە قەدەغەیە، چونکە ئوم سلمە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنَّ الَذي يَأْكُلُ أو يَشْرَبُ في آنيةِ الذهب والفضّة، فإنّما يُجَرْجِرُ في بطنه نارَ جهنّم}(٣) واتە: ئەو کەسەی لەقاپی زێڕو زیودا نان بخوا، یان ئاو بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخی کردۆتە سکی خۆیەوە وهەڵی قوڕاندوە.

٨-سوننەتە ئاوگێڕ لەکۆتایی هەموو ئاو خۆرەکانەوە ئاوبخواتەوە، ئەبو قەتادە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ساقِي القوم آخرُهُم}(٤) واتە: ئاوگێڕ لەکۆتاییەوە ئاو دەخواتەوە.

٩-سوننەتە لەلای راستەوە ولەدوا یەکەم کەسەوە ئاوەکە بسوڕێتەوە بۆئەوانیتر،چونکە ئەنەس دەڵێ: شیری تێکەڵ بەئاویان بۆ پێغەمبەر ﷺهێنا، لەلای راستیەوە کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لێ بوو، لەلای چەپیشیەوە ئەبوبەکری صدیق، پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی خواردیەوە، پاشان دایە پیاوەکە و فەرموی: {الأيْمنُ فالأيْمنُ}(٥) واتە: لای راست و لای راست، واتە: کاتێك کە لای راست تەواوبو پاشان لای چەپ دەست پێدەکات.

١٠-لەکاتی نانخواردندا ئاو زۆر مەخۆوە، چونکە هەزمکردنی خواردنەکەت تێکدەدات و نیو سەعات پێش خواردن،ودوا خواردن ئاوبخۆوە.(٦).

---

١أخرجه البخاري (٢٢١) ومسلم (٢٦٧).

٢أخرجه البخاري (٧٨ – ٧٩).

٣أخرجه البخاري (٨٣-٨٤) و مسلم (٢٠٦٥).

٤أخرجه الترمذي (١٨٩٥) وصحّحه الألباني في صحيح الترمذي (١٥٤٤).

٥أخرجه البخاري (١٤٨/٥)، (٦٦/١٠) ومسلم (٢٠٢٩).

٦الآداب الإسلامية للناشئة، محمد خير فاطمة، ل:٥١.

١١-لەپاش تەواوبونی ئاو خواردنەوەکەت سونئەتە سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار بکرێت لەسەر ئەو نیعمەتە گەورەیە([1]).

### سودەکانی ئاو خواردنەوە بەسێ هەناسەدان:

١-بەو شێوەیە مرۆڤ چاکتر تێر ئاو دەبێت.

٢-بەو شێوەیە چاکتر ئەو ئاوە دەبێتە شیفا و چارەسەر بۆ مرۆڤ .

٣-بەو شێوەیە تامو چێژی ئاوەکە خۆشتر دەبێت.

٤-بەو شێوەیە مەترسی گەرو گیرانی لێ ناکرێت.

٥-ئاو خواردنەوە بەیەکجار جگەری مرۆڤ ئەزیەت دەدات.([2]).

(**سودوبەهرەیەك**) هەنگوین خواردنەوە سودی زۆر گەورەی تێدایە، ڕیخۆڵە و دەمارەکانی جەستە پاك دەکاتەوە، تەڕیەکانی جەستە ڕادەمالێ،سروشتی مرۆڤ نەرم دەکات،جەرگ و سیەکان پاك دەکاتەوە، میزکردن خۆش دەکات،چارەسەری هەلأمەت دەکات، ئەمانە و چەندەها نەخۆشی تر،لەفەرمودەی پیرۆزدا هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:((**علیکم بالشفائین العسل والقرآن**))،واتە: هەنگوین و قورئان شیفایان تێدایەو ئێوەش بیانکەن بەدەرمانی دەردەکانتان.([3]).

## نۆیەم : ئادابەکانی پۆشاك لەبەرکردن:

پۆشاك یەکێکە لەوناز ونیعمەتانەی کە خوا جلّجلالە مرۆڤی پێ تایبەتمەند کردوە، بۆ ئەوە خۆی لەگەرماو سەرما بپارێزێ، وبۆ ئەوە عەورەت وئابڕوی خۆی پێداپۆشێ، وەخۆشی پێ بڕازێنێتەوەلە ژیانیدا،بەلأم بەداخەوە رۆژئاوای گومڕا تازە بەتازە کەوتۆتە بانگەشەی خۆ ڕوتکردنەوە وڕوت وقوتی وبەرەلایی، ئەمەش بۆهەلّگێڕانەوەی مرۆڤە، وگەڕانەوەیەتی بۆ ژیانی ئاژەلّی نەك پێشکەوتن بێت.([4]).

---

[1] بروانە: الموسوعة الأم في تربیة الأولاد في الإسلام ب١ ل: ٤٦١-٤٦٢.

[2] بروانە: سە رجاوە ی پێشوو ل:٤٦٥.

[3] منهاج الصالحین في الآداب الإسلامیة،ب١/ل:٣٢٦.

[4] الآداب الإسلامیة للناشئة،ل:٥٣.

**پۆشاك لەبەركردن ئەم چەند ئادابانەی هەیە پێویستە جێبە جێبكرێن:**

**١- لەكاتی لەبەركردنی پۆشاكدا (بسم الله) بكە، سوننەتێكی گەورەیە.**

**٢-پۆشاك لەبەركردنەكەت بۆ گوێڕایەڵی كردنی فەرمانی خوابێت،بەداپۆشینی عەورەت نەك بۆ فیزو شانازی كردن بەپۆشاكەوە.**

**٣-سوننەتە پۆشاكی سپی لەبەر بكەیت، چونكە ئیبن عباس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ألبِسُوا من ثيابكم البياضَ فإنّها مِنْ خير ثيابكم، وكفِّنوا فيها موتاكم}(١) واتە: پۆشاكی سپی لەبەربكەن، چونكە پۆشاكی سپی چاكترین پۆشاكی ئێوەیە، وە مردوەكانیشتان بەپۆشاكی سپی كفن بكەن.**

**٤-پۆشاكی مام ناوەندی-نەزۆرگران ونەزۆرهەرزان لەبەربكە، نەك پۆشاكی زۆر گران، یان پۆشاكی زۆر بێ نرخ و فڕێدراو.**

**٥-هەوڵبدە پارێزگاری لەسەر پاكوخاوێنی پۆشاكەكەت بكەیت، بۆئەوە خوا پەرستیەكەت دروست بێت، وە لەبەرئەوەش چونكە پێویستە بڕوادار دڵ ودەرون و جەستەو پۆشاكی پاكوخاوێن بێت، خوا جلّ جلاله فەرمویەتی:﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾(المدثر: ٤) واتە:دڵ و دەرونت لە گوناهو تاوانپاك بكەوە، وكردەوەكانیشت باچاك بێت، و پۆشاكەكەشت پاك بكەوە،وپاك ڕایبگرە.(٢).**

**وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ اللهَ نظيفٌ يُحبُّ النظافة، فنَظِّفوا أفنيتكم}(٣)واتە:خوا پاك وخاوێنە وپاك وخاوێنی خۆشدەوێ،دە ئێوە بەردەمی ماڵەكانتان پاك بكەنەوە.هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {تنظفوا بكلّ ما استطعتم، فإنّ الله بَنَى الإسلامَ على النظافة، ولن يدخل الجنة إلا نظيفٌ} .(٤).**

**٦-ئەو دوعایە بخوێنە كەپێغەمبەر ﷺ بۆ لەبەركردنی پۆشاك دەیخوێند، ئەبو سعیدی خدری گێڕایەوە گوتی:پێغەمبەر كاتێك كە پۆشاكێكی لەبەردەكرد دەیفەرمو: {لك الحَمْدُ أنت كسوتنيه، أسألك مِنْ خَيْره ومنْ خَيْر ما صُنِع له، وأعوذبك من شرِّه و من شرِّ ما صُنِع**

---

١أخرجه الترمذي(٤ ٩ ٩ ) وأبو داود (٣٨٧٨) وصحّحه الألباني في صحيح أبي داود (٣٤٢٦).

[٢]أيسر التفاسير، لأسعد حومد،ل:٥٣٧٨.نه مه قسه ى ئيبن عباسه رحمه الله.

[٣]أخرجه الترمذي عن سعد بن أبي وقاص مرفوعا،بروانه:كشف الخفاء،ل:٢٨٨.

[٤]أخرجه الرافعي عن أبي هريرة،(١/١٧٦).وهو ضعيف.

له}([1]) واته:ستایش بۆتۆ ئەی خوایە، من داوای چاکە وخۆشی ئەم پۆشاکە و ئەوەی پۆشاکەکەی بۆ دروستکراوە لێتدەکەم، وە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەشەڕو نەگبەتی ئەم پۆشاکە و ئەوەی پۆشاکەکەی بۆ دروست کراوە.

٧-خۆت بپارێزە فەخرو شانازی بە پۆشاکەکەتەوە مەکە، یان ئەوەندە درێژیان مەکە فیزیان پێوە لێ بدەیت، ئەبوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**لایَنظرُ اللهُ یوم القیامة إلی مَنْ جرّ إزارَه بَطَراً**} ([2]) واتە: خوای پەروەردگار لەرۆژی دواییدا تەماشای ئەو کەسە ناکات کە لەبەر فیزو خۆبەزلزانین پۆشاکەکەی رادەکێشێ.

٨-ئەگەر پۆشاکەکەت دڕابوو هەوڵ بدە بۆ خۆت بیدوورەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی پۆشاکەکەی دەدوریەوەو بەدەستی خۆشی پێڵاوەکەی چاك دەکردەوە.

٩-لەپۆشاك لەبەرکردن و پێڵاو و گۆرەوی لەپێکردندا لای راستت پێش بخە، عائیشە -رەزای خوای لێ بێت -گێڕایەوە گوتی: {**کان رسولُ الله ﷺ یُعجبُه التیَمُّنُ في شأْنه کلِّه، في طُهوره و ترجُلِه**}([3]) واتە: پێغەمبەر ﷺپێشخستنی لای راستی پێ خۆشتربو بەسەرلای چەپیدا لەهەموو کارە چاك و پیرۆزەکانی،وەك: دەستنوێژگرتن و خۆشۆرین و سەرو ڕیش بە شانە کردن وچونە مزگەوت وهتد.

١٠-پاك راگرتنی ئەو پۆشاکانەی کە بۆن دەکەن،وەك: گۆرەوی، کراس، و شتەکانی تریش،بۆئەوە خەڵك نارەحەت نەبێت.

١١-ئاوریشم لەبەرکردن بۆ کەسێك دروستە کە نەخۆشی لەش خوران و گەڕی لەگەڵدا بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ ریگەی زوبەیر وعبدالرحمن کوری عەوفی دا ئاوریشم لەبەر بکەن، لەبەر نەخۆشی خورانیەکەیان، چونکە ئاوریشم لەبەرکردن بۆ پیاوان حەرامە.

١٢-نابێ پیاو خۆی وەك ئافرەت لێبکات و پۆشاکی ئەو لەبەربکات، هەروەها نابێ ئافرەتیش خۆی وەك پیاو لێبکات و پۆشاکی ئەو لەبەربکات. ئەبوهریرە گێڕایەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لعَن اللهُ الرجلَ یَلبس لُبسة المرأة، والمرأة تلبس لُبسة**

---

[1] أخرجه أبوداود، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود، رقم(٤٠٢٠).

[2] حديث متفق عليه.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

الرجل}([1]) واتە: خوای پەروەردگار نەفرینی لەو پیاوە کردوە کە پۆشاکی ئافرەت لەبەردەکات، وە نەفرینی لەو ئافرەتەش کردوە کە پۆشاکی پیاو لەبەردەکات.

١٣-پێویستە ئافرەت پۆشاکێك لەبەربکات کە هەمو جەستەی داپۆشێ بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە جێگەی فیتنەن بۆ خەڵکی و خەڵك بەتەماشا کردنیان توشی گوناهو تاوان دەبێت.([2]).

(سودوبەهرەیەك) پێڵاو لەپێکردن ئەم ئادابانەی هەیە سوننەتە رە چاو بکرێن:

١-بەدانیشتنەوە پێڵاو لە پێبکە،چونکە پێغەمبەر ﷺ لە پێکردنی پێڵاوی بەپێوە قەدەغە کردوە.([3]).

٢-لەکاتی نانخواردندا پێڵاودابنێ، چونکە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

٣-لەکاتی دانیشتنداپێڵاودابنێ،بۆ ئەوە قاچەکانت ئیسراحەت بکات.

٤-پێڵاوەکەت هەڵتەکێنە ئەمجا لەپێێ بکە،نەوەك زیندەوەری ژەهراوی تێدابێت، وەقەت یەك تاکە پێڵاو بەتەنها لەپێ مەکە،بەڵکو هەردوپێڵاوەکەت لەپێبکە.([4]).

## دەیەم: ئادابەکانی گفتوگۆ وقسەکردن:

بەراستی قسەکردن لەبەردەم خوای پەروەردگاردا ولەبەردەم خەڵکیشدا هەمیشە لەسەر مرۆڤ حیساب دەکرێت، بۆیە خوای پەروەردگار لەقورئانە پیرۆزەکەیدا هەر بە قسەی چاك و جوان فەرمانمان پێدەکات و فەرمویەتی: ﴿وقولو للناس حُسْناً﴾ واتە: ئێوە قسەی چاك و جوان بەخەڵك بڵێن.پێغەمبەریشﷺ لەفەرمودەی پیرۆزیدا فەرمویەتی: {مَنْ كان يؤمنُ بالله واليوم الآخر فليقلْ خيراً أو لِيصمُتْ}([5]) واتە: ئەو کەسەی بروای بەخواو بەدوارۆژ هەیە، باقسەی چاك و جوان بڵێ، یان بێدەنگ بێت، هەروەها پێغەمبەر

---

[1] الجامع الصغير من حديث البشير النذير،ب٢/٢٢٣،وقال:حديث صحيح.

[2] بروانە: آداب المسلم دانراوی عبدالرحیم الماردینی ل: ١٢٢.

[3] صحيح سنن أبي داود للألباني رقم(٤١٣٥) وقال:صحيح.

[4] منهاج الصالحين،ب١/ل:٣٥٢.

[5] حديث متفقٌ عليه.

ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ يَضْمن لي مابين لَحْيَيه، ومابين فخذَيْه أَضْمَنْ له الجنّة}[1].
واتە: هەرکەسێك زارو زمان وعەورەتی بۆمن زەمانەت بکات، منیش بەهەشت بۆ ئەو زەمانەت دەکەم.

**لەبەر گرنگی گفتوگۆ و قسەکردن ئەم چەند ئادابە باس دەکەین:**

١-لەکاتی گفتوگۆ وقسەکردنت لەگەڵ خەڵکدا، پاکترین وچاکترین و جوانترین وشە بەکاربهێنە، چونکە خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ الحج: ٢٤ واتە: پیاوچاکان بۆ قسەی چاك و پاك و خۆش هیدایەت و ڕێنمویی کراون، هەروەك چۆن بۆ ڕێگای خوای سوپاسکراو، هیدایەت و ڕێنمویی کراون. هەروەها فەرمویەتی: ﴿وقولو للناس حُسْناً﴾ واتە: قسەی جوان وچاك بۆخەڵك بکەن و بڵێن. هاوەڵی بەڕێز عەدی کوڕی حاتەمی طائي- ڕەزای خوای لێ بێت - گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {إتقوُا النّار ولو بشِقّ تمرةٍ، فمَنْ لم يَجِدْ فبكلمةٍ طيّبةٍ}[2] واتە: ئەگەر بەبەخشینی لەتکە خورمایەکیش بێت، خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن ، وە ئەگەر خورماتان دەست نەکەوت، ئەوە بەقسەیەکی چاك و جوان خۆتان لەئاگر ڕزگار بکەن.

٢-لە قسەکردندا هێواش و لەسەرەخۆبە و قسەکانت وا بکە هەموو کەسێك لێت حاڵی ببێت و لەمەبەستەکەت تێبگا، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت گوتی: {كان كلامُ رسولِﷺ فَصْلاً يفهمُه كُلُّ مَنْ سَمِعَه}[3] واتە: گفتوگۆ و قسە کردنی پێغەمبەر ﷺ ڕون و ئاشکرا بووە، هەر کەسێك گوێی لەقسەیەوە ببوایە، چاك لێی حاڵی دەبو، وە قسەکانیشی ڕاستەقینە بون، دروستکراو نەبوون، بۆیە پێویستە ئێمەش وەك ئەو بکەین لە قسەکردندا، چاو لەو بکەین.

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[2] حديث متفقٌ عليه.

[3] أخرجه أبو داود رقم (٤٨٣٩).

٣-لەقسەکردندا واباشە تەماشای قسەبێژ بکرێت، چونکە وەك گوتویانە: چاو، شوێنی هەڵهێنجانی قسەیەو تەماشاکردنیش نیشانەی رێزلێنانە، هەروەك قسەبێژیش پێویستە تەماشای گوێگر بکات، لەکاتی گفتوگۆ وقسەکردندا.

٤-پێویستە قسەکردن بەپێی کات و شوێن بێت، لەکات و شوێنی جیددی و راستی دا قسەی گاڵتەو سوعبەت ناکرێت،وە لەکات وشوێنی غەمباری و پەرۆشیدا قسەی پێکەنین وياری ناکرێت، چونکە هەر شوێنە قسەی موناسبی ئەو شوێنەی پێویستە، وەهەر شوێن ومەقامێك قسەی خۆی گەرەکە.([1]).

٥-هەر کەسە پێویستە بەگوێرەی عەقڵی خۆی قسەیەی لەگەڵدا بکرێت،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ماأنت بمُحدّثٍ قوماً حديثاً لاتبلغه عقولُهم إلا كان لبعضهم فتنةً}([2]).

واتە:قسەیەك بۆ خەڵك بکەی،کەبەگوێرەی عەقلی ئەوان نەبێ،ئەوەئەوقسەیە دەبێتە فيتنە ئاژاوە بۆهەندێکیان.

٦- هەر کەسە پێویستە ئەوقسەیەی بۆبکرێت کەموناسبی ئەوبێت، بۆنمونە:لەگەڵ دایك وباوکدا دەبێ قسەی رێز وحورمەت بکرێت و لەگەڵ زانادا قسە لەزانست بکرێت، لەگەڵ غەیرە مسوڵماندا باسی گەورەیی وپیرۆزی ئیسلامی بۆ بکرێت،لەبەردەم ئافرەت ومنداڵدا نابێ قسە لەکاری سێکسی (جنسی) بکرێت،چونکەناشیرینە وخەراپە.

{سود وبەهرەیەك} پێویست ناکا بەبێدین وبێباوەڕ بگوترێ: گەورەم، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لاتقولوا للمنافق سيّداً، فإنه إنْ يكُنْ سيّداً فقد أسخطتم ربّكم}([3])

واتە:بەپیاوی دوڕو مەڵێن: گەورەم، چونکە ئەگەر کەسی دوڕو گەورە بێت، ئەوە ئێوە ڕقی پەروەردگارتان هەڵدەستێنن.

٧-لەهەر شتێکدا کە مەبەستی ئێمە نەبێت و بەئێمەوە پەیوەست نەبێ، پێویستە ئێمە خۆمانی لێ بپارێزین و خۆمانی تێهەڵنەقورتێنین،بۆیە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێ: (دوخەسڵەت خەڵکی فەوتاندوە: ا-ماڵ و سامانی زیادە. ب-قسەو قسەڵۆکی زیادە).

---

[1] بڕوانە: منهاج الصالحين، لمحمد عبد العاطي، ب٢/ل:٢٤٧.

[2] أخرجه مسلم في المقدمة.

[3] أخرجه أبو داود والحاكم وصححه الألباني في صحيح الترغيب رقم:٢٩٢٣.

٨-لەبەرامبەر کەسێکەوە کە لەتۆ باڵاتر، یان زاناتر، یان بەتەمەنتربێت، تۆ بێدەنگ بە، و گوێ لەئەو ڕابگرە و سودی لێ وەربگرە.

٩-ئەگەر کەسێك قسەی کرد تۆ گوێی لێ بگرە تا لەقسەکەی دەبێتەوە، قسەکەی پێ مەبڕە،وبریندار ی مەکە،وگاڵتەی پێ مەکە و بەخۆشترین ناو بانگی بکە، چونکە خوای پەروەردگاری فەرمانی پێ کردوین و فەرمویەتی ﴿وقولوا للناس حسناً﴾ واتە: قسەی چاك و جوان بەخەڵك بڵێن.

١٠-لەکاتی قسەکردندا زۆر لەسەرخۆبە و بەزەردەخەنەوە قسەبکە، چونکە ئەبودەردا دەگێڕێتەوە دەڵێ: {**کان رسولُ الله ﷺ لایحدّث حدیثاً إلاّ تبسّم**}[1] واتە: پێغەمبەر ﷺ هەر قسەیەکی بکردایە زەردەخەنەی لەگەڵدا بوو.

١١-لەکاتی قسەکردندا مەدح و سەنای خۆت مەکە، و بەشان و باڵی خۆتدا هەڵ مەڵێ، چونکە خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴾ (النجم: ٣٢)

واتە: ئێوە خۆتان بەپاك دامەنێن، هەر خوا جلجلالە دەزانێ کێ پارێزکارترە وبەدینترە.

١٢-پێویستە قسەکانی تۆ فەرمان بەخێرو سەدەقە کردن بێت، یان فەرمان بەچاکە بێت، یان فەرمان بەچاکسازی نێوان خەڵکی بێت، یان وەڵامدانەوە و ئامۆژگاری بێت، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ ۞ لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَـٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ١١٤ واتە: زۆرینەی قسە بەچپەکانیان خێرو چاکەی تێدانیە تەنها مەگەر قسەی ئەوانە نەبێ کە فەرمان بەخێرکردن و سەدەقە کردن دەکەن، یان فەرمان بەچاکە کردن دەکەن، یان فەرمان بەچاکسازی دەکەن.

١٣-لەهەر کۆڕێك یان لەگەڵ هەر کەسێکدا بیت، پێویستە نهێنییەکانی ئەو کۆڕ وئەو کەسە بپارێزەو بڵاوی مەکەوە، چونکە پێغەمبەری ﷺ فەرمویەتی: {**کفی بالمرء کذباً أنْ یُحدّث بکلّ ماسَمِع**}[1] واتە: مرۆڤ ئەوەندە درۆیەی بەسە کاتێك کە هەرچی بیستی بڵاوی بکاتەوە.

---

[1] رواه أحمدفي مسنده (٢٢٠٧٥)وقال الألباني في السلسلة٩/ ٢٤٤ :ضعيف.

١٤-لەکاتی قسەکردندا ئاگاداربە سوێند بەسەری پێغەمبەر وفریشتە، یان سەری خۆت،وباوکت وشەرەفت، هتد مەخۆ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ الله تعالى ينها كم أنْ تَحْلِفوا بآبائكم، فمَنْ كان حالفاً فليحلِفْ بالله أو لِيَصْمُتْ} ([1]) واتە: خوای پەروەردگار ئێوەی قەدەغە کردوە لەوەی کە سوێند بە باوکتان بخۆن، هەر کەسێك سوێند دەخوات با تەنها سوێند بەخوای پەروەردگار بخوات ئەگینا با بێدەنگ بێت و سوێند نەخوات.

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گوێی لە کابرایەکەوە بوو دەیگوت: سوێند بە (مەککە) عەبدوڵڵا پێی گوت: سوێند بە مەککە مەخۆ، چونکە من گوێم لەپێغەمبەرەوە بوە دەیفەرموو: {مَنْ حَلف بغير الله فقد كَفَر أو أشْرك} ([3])واتە:کەسێك بەجگە لەخوا سوێند بخوات ئەوە بێباوەڕ دەبێت، یان هاوبەش و شەریکی بۆ خوا قەرار داوە.

١٥-هەر کاتێك تاوانێکت کرد یان قسەیەکی خەراپت گوت، ئەوە خێرا لەو کردارو گوفتارەت پەشیمان ببەوە،حذيفە ي یەمانی گێڕایەوە گوتی: لەلای پێغەمبەر ﷺ سکالای زمان شڕی و خراپی خۆم کرد، ئەویش فەرموی: {أين أنت مِنَ الاستغفار؟} ([4]) ئەی تۆ لەکوێی بۆ تۆبەوداوای پەشیمان بونەوەی تاوانەکانت لەخوا ؟ خۆمن هەموو رۆژێك سەدجار تۆبە و پەشیمان بونەوە لەگوناهەکانم دەکەم.

١٦-موناقەشەو جیدال و دەم بەدەمێ لەگەڵ کەسدا مەکە چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی :{أنا زعيمٌ ببيتٍ في ربض الجنة لمنْ ترَك المِراء ولو كان مُحقّاً} ([5]).واتە:من دەستەبەری مالێکم لەناوەڕاستی بەهەشتدا بۆئەو کەسە کەدەم بەدەمێ ناکات هەر چەندە لەسەر هەقیش بێت.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه (١/١٠٥)

٢حديث متفق عليه.

٣رواه الترمذي في سننه،وقال: هَذَا حَدِيث حسن . وَقَال الْحَاكِم:صَحِيحعَلَى شرطهما.

[4] أخرجه النسائي في اليوم والليلة والحاكم وقال:صحيح على شرط الشيخين.

[5] صحيح سنن أبي داود للألباني رقم(٤٨٠٠) والسلسلة الصحيحة(٢٧٣).

١٧-سوننەتە سوپاس وستایشی چاکەی خەڵك بکەیت، چونکە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {لايَشْكُرُ اللهَ مَنْ لايشكُرُ الناسَ}[1].واتە:ئەو کەسەی سوپاس وستایشی چاکەی خەڵك نەکا، ئەوە سوپاس وستایشی چاکەی خوای پەروەردگاریشی نەکردوە.

١٨-چاودێری زمانت بکەو بیپارێزە لەم ئافەت وتاوانانەی کە باسیان دەکەین:

أ-درۆ ودەلەسەمەکە، چونکە مرۆڤی بڕوادار درۆناکات.

ب-بوهتان وغەیبەت وزەم مەکە،وخۆت لێیان بپارێزە.

ج-دووڕوویی مەکە،وقسەی ئەم وئەو مەهێنەومەبە.

د-قسەی زیادەوهیچ وپوچوقسەی زل وبێ مەعنامەکە.

و-جنێو بەکەس مەدە ولەعنەتونەفرین لەکەسمەکە.

ز- زۆرقسەی سوعبەت وگاڵتەجاڕی بەکەس مەکە.

ح-گاڵتە بەهیچ کەس مەکە،وبەکەس رامەبوێرە.

ط-قسەی بێسود مەکە و تانە و تەشەر لەکەس مەدە.

عوقبەی کوڕی عامیر گێڕایەوە گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی لە ئاگری دۆزەخ رزگاریم دەبێ؟ ئەویش لەوەلأمدا فەرموی:

{أَمْسِكْ عليك لسانك، وَليسعْكَ بَيْتُكَ، وابْكِ على خطيئتك}[2] واتە: زمانت بگرەلەخەراپە، ولەماڵەوە بە، و بۆ تاوانەکانت بگریە[3].

بە بەکری کوڕی (عبدالله المزني)یان گوت: تۆ بۆ زۆر بێدنگ دەبیوقسە ناکەی؟ ئەویش گوتی: ئاخر زمانم دڕندەیەکە ئەگەر بەرەڵای بکەم دەمخوا، وەمسوڵمانیش کاتێك مسوڵمانێکی ڕاستیە کەخەڵك لەدەست و زمانی ئەمین بن،وەك پێغەمبەرﷺفەرمویەتی : {المسلم مَنْ سَلِم المسلمون منْ لسانِه ويدِه}[4].

واتە:مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان لە دەست و زمانی ئەمین بن.

ئیبن مسعود یەکێك لە هاوڕێکانی هاتە لای و دیتی عبدالله بەزمانی خۆی دەگوت:ئەی زمان قسەی چاك بکە،چاکەت دەست دەکەوێ،یان بێدەنگبە تاسەلامەت بیت، ئەگینا

---

[1] صحيح سنن أبي داود للألباني رقم(٤٨١١).

[2] أخرجه الترمذي في سننه،قال الحافظفى " الفتح " ١١ / ٣٠٩ : حسنه الترمذى.

٣بروانە: آداب المسلم ل: ٩٣، والآداب الإسلامية للناشئة،ل:٥٩،

[4] أخرجه البخاري في صحيحه.

پەشیمان دەبیەوە،هاورێکەی گوتی: ئەمە قسەی کێیە؟ ئەویش گوتی:من ئەمەم لەپێغەمبەر بیستوە فەرمویەتی:{إِنَّ أكثرَ خطايا ابن آدم من لسانه}[1].واتە:زۆرینەی تاوانەکانی مرۆڤ بەهۆی زمانیەوەیە.[2].

برا گەنج و لاو وتازە پێگەیشتوەکان بۆتان دەرکەوت کە تاوانەکانی زمان چەند گەورەیە، ئافات وتاوانەکانی زۆرن لەبەرئەوە پێویستە ئێوەی بەڕێز زۆر ئاگاتان لەزمانی خۆتان بێت، تەنها لەگوفتاری شیرین و ئامۆژگاریکردن و فەرمان بەچاکەکردن و بەخێرو سەدەقەکردن و بەچاکسازی نیوان خەڵکیدا بەکاری بهێنن.

ئیمامی عومەر گوتویەتی: (هەرکەس قسە زۆر بکات هەڵە زۆر دەکات).

ئیمامی عەلی گوتویەتی: (جەستە بەزمانەوە وەستاوە، ئەگەر زمان راست بێت، هەموو ئەندامەکانی جەستە راست دەبن، ئەگەر زمانیش خواربێ ئەوە هەموو ئەندامەکانی تر خوار دەبێت).

عەبداڵڵەی کوڕی مەسعود گوتویەتی:(سوێند بەخوا هیچ شتێك هێندەی زمان پێویست بەبەند کردن ناکات).

شێخ حەسەنی بەصری دەڵێ:(ئەو کەسەی کە زمانی ناپارێزێت ئەوە لەئاین تێنەگەیشتوە).

سوفیانی کوڕی عوەینە دەڵێ:(بێدەنگی بەردەوام کلیلی دەرگای خواناسینە).

بەم شێوەیە وزۆر زیاتریش زانایانی ئیسلام باسی بەڵا وئافاتەکانی زمانیان کردوە، لەبەر ئەوە پێویستە ئێمەش زۆر ئاگامان لەزمانمان بێت و بیپارێزین.

مامۆستا مەلا عبد الكريمي مدرس-رحمه الله- گوتویەتی:

**زمانت یەکە و گوێچکەت دووانە**

**یەعنی یەك بڵێ و دووان بزانە.**

---

[1] رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح ذكره الهيثمي في المجمع، ١٠/٢٩٩.

[2] منهاج الصالحين،ب١/ل:٤٢٤.

**{سود وبەهرەیەك}** پێکەنین لەژیانی تاك وکۆمەڵگەدا نرخێکی گەورەی هەیە،خوا جل جلاله مەدحی ڕوگەشەکان دەکات و فەرمویەتی: ﴿ ضاحكة مستبشرة﴾.

واتە: بڕواداران لەدوارۆژدا دەم وچاویان پێدەکەنێ وموژدەی خۆشیانپێیە، پێکەنین سیفەتی خوایە،بەلام پێکەنینی زۆر خەراپەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{...**ولا تكثر الضحك، فإنَّ كثرة الضَّحك تُميتُ القلبَ**}([1]).واتە:زۆرپێمەکەنە، چونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.ئیمام مسلم دەلێ:{پێغەمبەر ﷺ زۆر بێدەنگ بوە ؛ وپێکەنینیشی کەم بوە} .(٢).وەیارەکانیشی بەهەمان شێوە پێکەنینیان کەم بوە، زەردەخەنەیان زۆر بوە.

## ئەمەش هەندێکە لەئادابەکانی پێکەنین:

أ-نابێ مسوڵمان درۆ بکات، تاوەکو خەڵك پێی پێبکەنن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ويلٌ للذي يحدِّث القوم، ثمّ يكذب ليضحكهم، ويلٌ له، ثمّ ويلٌ له**}([3]).

واتە: دۆلەکەی دۆزەخ بۆ ئەوکەسەی درۆ دەکات بۆ ئەوە خەلك پێی پێبکەنن،وەك درۆکردنی خەلکی ئەمرۆ وپێکەنینیان پێی،وناویان ناوە( کۆمیدیا) فلیم وشانۆی درۆ دروست دەکەن و پێی پێدەکەنن، زۆر جاری واهەیە گاڵتەش بەدینەکەیان دەکەن.

ب-لەکۆڕ ومەجلیسێکدا دامەنیشە هەموی هەر پێکەنین بێت، چونکەپێغەمبەر ﷺ و یارەکانی شتی وایان نەکردوە بەلێ پێغەمبەر ﷺ ویارەکانی پێکەنیون بۆ شتی حەلال و خۆش و سوعبەتیشیان کردوە([4]).

ج-لەگەل ژنەکەتدا بەتایبەت کچ بێت پێبکەنە وقسەی خۆشی لەگەڵدا بکە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەجابیری فەرموو:{**فهلاً بكراً تلاعبها وتلاعبك، وتُضاحِكُها وتُضاحِكُك**}([1]).
**واتە:ئەوە بۆ لەگەل ژنەکەتدا یاری ناکەیت وپێناکەنی وئەویش بەهەمان شێوە بکات ؟.**

---

[1] أخرجه البخاري في الأدب المفرد(٢٥٣) وابن ماجة في سننه(٤١٩٣)وقال البوصيري: هذا إسناد صحيح. وجوّده الألباني في الصحيحة(٥٠٦ ).

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] رواه أحمد في مسنده(١٩٩٠٦) بإسناد صحيح،وصححه الحاكم(١ /٤٦) ووافقه الذهبي،وصححه الألباني برقم:٧١٣٦.

[4] منهاج الصالحين ، ب١ /ل:٤٣٦ .

د- کاتێك کەسێك بایەکی لێدەبێتەوە پێمەکەنە،چونکە پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە ئامۆژگاری یارەکانی کرد، وفەرموی: { إلامَ يضحك أحدُكم ممّا يفعل}([2])،واتە: کاتێك کەسێك بایەکی لێدەبێتەوە بۆپێی پێدەکەنن؟([3]).

{سود و بەهرەیەکیتر} مەزاح وسوعبەتکردن لەنێوان دۆستان وبرایاندا دروستە، بەو مەرجە کە جنێودان وگاڵتەکردن هتد نەبێت،پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی مەزاح وسوعبەتی کردوە، بەلام هەر قسەی هەقی کردوە، کابرایەك داوای لە پێغەمبەر ﷺکرد کە سواری حوشتر ببێ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو:هەر سواری بەچکە حوشترت دەکەین، کابرایەکەش گوتی: ئاخر بەچکە حوشتر نامتوانێ،پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: هەر حوشترێك بێ خۆ پێشتر بەچکە بووە،ئەمجا گەورەبوە.([4]).

ئەمەش هەندێکە لەئادابەکانی سوعبەتکردن ومەزاح:

أ- زۆر سوعبەت مەکە، کەم بێت باشە، چونکە سوعبەتی زۆر خەراپە.

ب-ئەومەزاح وسوعبەتانەی کەخوا جل جلالە پیی ناخۆشە مەیکە، کەبریتین لەو سوعبەتانەی کە غەیبەتی خەلکی تێدابێ، یان گالتەکردن،یان دووڕویی،یان ترساندنی تێدا بێت، هتد.([5]).

ج-ئەومەزاح وسوعبەتانە مەکە کەدرۆو دەلەسەی تێدابێت ، یان کەسەکە بەرەو ڕوپامایی و چەورەیی و ڕوگیری ببات.

د-لەشوێنی جیددیدا وەك: لای ئەمیر وگەورە، کۆڕی زانست، شایەتیدان ، هتد، مەزاح وسوعبەت مەکە،چونکە ناگونجێ.([6]).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[3] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل: ١٤٢.

[4] رواه الترمذي ، وقال:حسن صحيح، وصحيح سنن أبي داود للألباني(٤٩٩٨ ).

[5] منهاج الصالحين، ب١ /ل:٤٤٤،والآداب الإسلامية، محمود المصري،ل:٣٨٧.

[6] الآداب الإسلامية، محمود المصري،ل:٣٨٧.

ه- لەگەڵ ئەوکەسانەدا مەزاح وسوعبەت بکە کەپێویستیان پێی هەیە، وەك: ئافرەتان، منداڵان، وپیر وشێوەیان،بۆیە پێغەمبەر ﷺمەزاح وسوعبەتی دەکرد بەم شێوەیە: سوعبەتی لەگەڵ ئەنەسی کوری مالیکدا دەکرد، پێی فەرموو:{یاذا الأذنین}([1]).واتە: ئەی خاوەنی دوگوێچکە.

هەر ئەنەسی کوڕی مالیك گێڕایەوە گوتی:پێغەمبەر ﷺ تێکەلاوی ئێمەی دەکرد و بە سوعبەت بە براکەمی دەگوت:{یاأبا عُمَیر مافعَل النُغَیر}([2]) واتە:ئەی ئەبو عومەیر ئەوە باڵندەکەت چی بەسەر هات ؟، ئەو باڵندەیەش مردبو، پێغەمبەر ﷺ دەیویست مەزاح و سوعبەت لەگەڵ ئەبو عومەیردا بکات ([3]).

## یازدەیەم: ئادابەکانی ناو ماڵ:

**ناوماڵ،لەماڵەوەبون چەند ئادابێکی هەیە پێویستە جێبەجێ بکرێن:**

١-لەکاتی چونەوەت بۆ ماڵەوە (بسم الله) بکە، جابیر گێڕایەوە گوتی: گوێم لەپێغەمبەر بو ﷺ دەیفەرمو:{کاتێك کە مرۆڤ دەچێتە ماڵەوە ولەکاتی چونە ژورەوە و نان خواردنیدا ناوی خوا بهێنێ،ئەوە شەیتان بەهاوەڵەکانی خۆی دەڵێ:نەشەو مانەوەتان هەیە لێرەو نەخواردن،وەکاتێك ئینسان چوە ماڵەوە،بەلاّم لە نانخواردنەکەیدا ناوی خوای نەهێنا ئەوە شەیتان دەڵێ: ئێوە هەم جێگەی شەوتان هەیە وهەم خواردن} ([4]) .

٢-پرس کردن سێجارە ئەگەر رێگەیاندا بچۆ ژوورەوە، ئەگینا بگەڕێوە([5]).

٣-هەر کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەم دوعا و نزایە بخوێنە کە پێغەمبەر ﷺ خوێندویەتی، وپاشان سەلام بکە:{**اللهم إنّی أسألك خیرَ المَولِج، وخیر المَخرَج، بسم الله وَلَجنا، بسم الله خَرَجنا، وعلى الله ربِّنا تَوَکّلنا، ثمّ یُسلِّم على أهله**}([6]) واتە: ئەی خوایە من داوای چاکترین چونە ماڵەوە وچاکترین دەرچون لەماڵت لێدەکەم، بەناوی خواوە

---

[1] رواه أبوداود(٥٠٠٢ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(١٩٠٩ ).

[2] حديث متفق عليه.

[3] الآداب الإسلامية للمصري،ل:٣٩٠ ،وآداب المسلم للمارديني، ل:٩٦ .

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] أخرجه البخاري (١١/٢٣) ومسلم (٢١٥٣).

[6] أخرجه ابوداود في سننه رقم:٤٩٨.

چوینەوە، وبەناوی خواوە دەرچوین، هەر بەخوای پەروەردگارمان پشت ئەستورین، لەدوای خوێندنی ئەم دوعاو نزایە سەلام لەئەهلی ماڵەوە دەکات، وە ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ بەمنی فەرموو: {**يابُنَيَّ إذا دخلتَ علَى أهلك فسلِّمْ، تكُنْ بركةً عليك وعلى أهل بيتك**}([1])، واتە: ئەی کوڕەکەم هەر کاتێك کە چویە ماڵەوە سەلامیان لێ بکە، ئەو سەلام کردنە دەبێتە پیرۆزی بۆ خۆت و بۆسەر ئەهلی ماڵەوەشتان.

٤-خۆت بپارێزە لەوەی کە بۆ ماڵەوە دزە بکەیت، یان کتوپڕ خۆت بکەیت بەماڵدا بەبێ ئاگادارکردنەوەو بەبێ پرس کردن، خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ البقرة: ١٨٩ واتە: چاکە ئەوە نیە کەوا لەپشتەوە بچیە ناو ماڵەکانەوە،بەلکوچاکە ئەوەیە کەلەدەرگاوە بچیە ژورەوە.

٥-لەتەنیایدا لەماڵەوە موراقەبەی خوای گەورە بەسەر خۆتەوە دابنێ و لەخوا بترسە و گوناهو تاوان ئەنجام مەدە.

٦-لەناوماڵدا دەنگت بەرزمەکەوە وهەرا هەرا مەکە، شتێکی وا مەکە، کە دراوسێکانت ناڕەحەت بکەیت.

٧-دەنگی رادیو و تەلەفزیۆنەکەت بەرز مەکەوە لەکاتەکانی حەوانەوە و خەوتندا.([2]).

٨- کاتێك لەماڵەوەی کاتەکانی خۆت بەشتی نابەجێوە بەسەرمەبە، خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ ....إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦) واتە: بەڕاستی گوێچکەوچاو ودڵ لەم سیانە لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت.

٩-شەرم و حیشمەت بپارێزە، و ئاگاداری عەورەتی خۆت بە لەکاتی پۆشاك گۆڕین، یان کاتەکانی تر خۆت هەڵنەدەیەوە، وەتەماشای عەورەتی خەڵکی تریش مەکە، ئیبن عباس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**نُهيتُ أنْ أمْشي عريانًا**}([3]) .

واتە: قەدەغە کراوم لەوەی کە بەڕوتیەوە بەرێدا بڕۆم.

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه رقم:(٢٦٧٨)وقال:هذاحديثٌ حَسَنٌ غريبٌ.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ب١/ل:٥٩.ومنهاج الصالحين،ب٢،ل:١٩١

[3] الجامع الصغير،رقم:٩٢٨٨،وهو حديث صحيح.

١٠-خوای پەروەردگار هەر بەشێك لەماڵ و مەسكەنی پێ داوی پێی رازیبە،وگلەیی مەكە،خۆت هەوڵی زیاتر بدە،وداوا لەخوا بكە بەشی چاكترت پێبدا، وەئەوەش بزانە كە فراوانی ماڵ و هۆدە و حەوشەكەت نیشانەی بەختەوەریە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ماڵی فراوان یەكێكە لەنیشانەكانی بەختەوەری مرۆڤ ، هەروەك چۆن تەنگی ماڵ نیشانەی بەدبەختی مرۆڤە}([1]).

١١-ئاگات لەئیسرافكردن هەبێت لەنانخواردن ولەخواردنەوەدا،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**كلوا واشربوا وتصدّقوا والبسوا مالم يخالطه إسرافٌ ولامخيلةٌ**}([2])

واتە:بخۆن وبخۆنەوە وخێربكەن، وپۆشاك لەبەر بكەن مادام ئیسراف و فیز نەبێت.

١٢-ئاگات لەپاك و خاوێنی ماڵەوە بێت و بەپاكی ڕایبگرە، بەشداری ماڵ و خێزانەكەت بكە بۆ خزمەتكردنی ماڵەوەتان، پرسیار لەعائیشە كرا كە ئایا پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە چی دەكرد؟ عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت - لەوەڵامدا گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە هەر خزمەتی ماڵو خێزانەكانی دەكرد، بەڵام كاتێك نوێژ ببوایە دەچو بۆ نوێژەكەی([3]).

١٣-نهێنیە تایبەتیەكانی ماڵەوەتان بپارێزە و بۆ كەسی باس مەكە.

١٤-كاتێك كە لەماڵەوە دەردەچی پرس بكە و سەلامیان لێ بكەو ئەو شوێنەشیان پێ بڵێ كە بۆی دەڕۆیت.

١٥-كاتێك كە لەماڵەوە دەرچوی دوعا و نزای دەرچون لەماڵەوە بخوێنە ئوم سەلەمە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێك كە لەماڵ دەربچوایە ئەم دوعایەی دەخوێند: {**بسم الله توكلتُ على الله، اللّهمّ إنّي أعُوذُ بك أنْ أضِلَّ أو أُضَلَّ، أو أزِلّ أو أُزَلّ، أو أظلِمَ أو أُظلَم، أو أجهل أو يُجْهَل عليّ**}([4]) واتە: بەناوی خوا جلّ جلالە، هەربەخوا پشت دەبەستم، خوایە من خۆم دەپارێزم بەتۆ لەوەی گومڕاببم، یان گومڕام بكەن وە لەوەش كە هەڵبخلیسكێم، یان هەڵم بخلیسكێنن، وە لەوەش كە ستەم بكەم یان ستەمم لێ بكرێت، وە لەوەش كە خۆم نەزانم بكەم، یان خەڵك نەزانیم بەسەردا بكەن.

---

[1] منهاج الصالحين،ب٢،ل:٢٠١.

[2] أخرجه أحمد والنسائي، وهو حديث صحيح.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] أخرجه الطبراني في الكبير (٩/٢٤)رقم: ١١ والترمذي.في سننه رقم:٤٩٧،وقال:حسن صحيح.

هەروەها ئەنەس گێڕایەوە کەوا: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەر کەسێك کە لەماڵەوە دەرچوو بڵێ: {بسم الله توكلتُ على الله ولاحول ولا قوة الا بالله} پێی دەگوترێت: ئەمەت بەسە، پارێزراوی،وهیدایەت دراوی، وە شەیتانیش لێی دور دەکەوێتەوە.([1]).

## دوازدەیەم: ئادابەکانی کوڕوکچ لەگەڵ دایك و باوکیاندا:

لەدواخوای پەروەردگارەوەدایك و باوکخاوەنی فەزلی گەورەن بەسەر ئینسانەوە، ئەوان هۆکاری بونی تۆن لەم دونیایەدا،چونکەئەوئەزیەت وئازارەیدایك و باوك دەیکێشن بۆ منداڵەکانیان هیچ کەسێکی تر نایکێشێ، بۆیە خوای پەروەردگارتەنها چاکەکردنی دایك و باوکی لەگەڵ پەرستنی خۆیدا بەرامبەر کردوە وفەرمویەتی:

﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا .... ﴾ النساء: ٣٦ واتە: هەر خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدامەکەن، وە لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاکە بکەن. وەلەچەندەها ئایەتی تردا ئەم فەرمانەی کردوە.

وە خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو خێرو فەزڵ و نازو نیعمەتێکە لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ سوپاس و ستایشی خۆیدا تەنها سوپاس و ستایشی دایك و باوکانی باس کردوەو فەرمویەت:﴿ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴾(لقمان: ١٤).واتە: سوپاس و ستایشی من و دایك و باوکت بکە، هەر بۆلای من دەگەڕێیەوە. ئەم پلەو پایە بەرزە تەنها بەدایك و باوك دراوە بە کەسێکی تر جگە لەوان نەدراوە، ئەمەش ڕاسپاردەیەکی خواییە کەفەرمویەتی:﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ ... ﴾ (العنكبوت: ٨) واتە: مرۆڤ ئەوەی پێ سپێردراوە لەلایەن خواوە کە لەگەڵ دایك و باوکیدا چاکە بکات.

وەخوای پەروەردگار تەنها چاکەکردنی دایك وباوکی کردوە بەهۆکاری تەمەن درێژی منداڵەکەی و ڕیزق فراوانی،لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ سَرّه أنْ يُمدّله في عُمْره، و يزاد له في رزقه فليبرّ والديه و ليَصِلْ رَحِمَه}([2]).واتە: هەر کەس پێی خۆشە تەمەنی

---

[1] رواه الترمذي والنسائي، بۆ ئەم بابەتە تێکڕا بڕوانە: الآداب الإسلامية للناشئة،ب١/ل:٥٩.

[2] أخرجه أحمد في مسنده(١٣٧٤٥) بإسناد صحيح.

درێژ بێ وریزق وروزی فراوان بێت ئەوە با چاکە لگەڵ دایك و باوکیدا بکات و پەیوەندی خزمەکانی بەجێ بهێنێ.
هەروەها ئەمە راسپاردەی پێغەمبەری خوایە کە فەرمویەتی: {**الكبائر: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وقتل النفس واليمين الغموس**}([1]) واتە: تاوانە گەورەکان ئەمانەن: هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا جل جلالە، ئەزیەت و ئازاردانی دایك و باوك، خەڵك کوشتن بەناڕەوا، سوێند خواردنی بەدرۆ.

## ئەمەش دەستە گوڵێکە لە گوڵزاری ئادابەکان لەگەڵ دایك وباوکدا لە ئیسلامدا:

١-پێویستە تۆ - کوڕ یان کچ - چاکە لەگەڵ دایك و باوکتدا بکەیت، و بەخێرو خۆشیەوە ژیانیان لەگەڵدا ببەیتە سەر، وەك لەئایەتەکەدا باسمان کرد،ئەبوهرەیرە گێڕایەوە کابرایەك هاتە لای پێغەمبەرو گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺ کێ شایانترە بۆئەوەی من چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ لەوەلآمدا فەرموی: {**أُمُّكَ ثم أُمُّكَ ثمّ أُمُّك، ثمّ أبَاك، ثمّ أدناك أدناك**}([2])واتە: دایکت، دایکت، دایکت، پاشان باوکت، پاشان خزمەکان،خوارتر و خوارتر.
لەبەرئەوەیە ئەزیەت‌و ئازاردانی دایك‌و باوکت یەکێکە لەهەرە تاوانە گەورەکان، وەك لەو فەرموودەی پێشوتر رونکرایەوە.
٢-بۆ هەر فەرمانێکیان مادام تاوان نەبێت بەقسەیان بکە،وگوێڕایەڵییان بکە، چونکە بەقسەنەکردنیان ئەزیەت و ئازاردانیانە کە ئەمەش تاوانی گەورەیە پێویستە مرۆڤی بڕوادار وازی لێ بێنێ و نەیکا.
٣-لەگەڵ دایك و باوکتدا قسەی ڕەق وناخۆشیان پێ مەڵێ و دەنگیان لەسەر بەرزمەکەوەو ڕاوبۆچونیان بەچاك بزانەو بەکەمی مەزانە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی :﴿ ....فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾ (الإسراء: ٢٣) .واتە: ئۆف لەدەستی دایك و باوکت مەکەوقسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ و قسەی ڕێز و خۆشیان پێ بڵێ.
٤-زۆر ڕێزیان لێ بگرەو لەبەریان هەڵسە و لە ڕۆیشتندا لێیان پێش مەکەوە.

---

[1] رواه البخاريفي صحيحه.

[2] حديث متفق عليه.

٥-کاتێك كە قسەیان لەگەڵدا دەكەیت زۆر ئەدەب بنوێنە، و قسەی نەرمیان لەگەڵدا بكەو قسە بەسەر قسەیاندا بەرزمەكەوە.

٦-دایكو باوكت زۆر خۆشبویٚ و دڵسۆزیان بۆ بكە و لەبەرامبەریاندا گەردن كەچ بە، خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴾ (الإسراء: ٢٤).واتە: باڵی بەزەیی بۆ دایك و باوكت ڕابخە وبڵێ: ئەی پەروەردگارم وەك چۆن ئەوان بەمنداڵی منیان پەروەردەكرد تۆش بەزەییت بەئەواندا بێتەوە.

٧-بەوە نیشانی بدە كە تۆ ئەوانت خۆش دەویٚ لەدوای مردنیان ڕاسپاردەكانی ئەوان جێبەجیٚ بكە ودۆستەكانی ئەوان بەسەربكەوە و زیارەتیان بكە وكار وپێویستیان بەجیٚ بهێنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ مِنْ أبَرّ البرّ أنْ يصِلَ الرجلُ أهلَ وُدّ أبيه}[1] واتە: چاكترین چاكە لەگەڵ دایك و باوكدا ئەوەیە سەردانی دۆستەكانی باوكت بكەیت و پێداویستیەكانیان جێبەجیٚ بكەیت[2].

جارێك كابرایەك گوتی:ئەی پێغەمبەر ﷺلەدوا وەفاتی دایك و باوكمدا من دەتوانم چاكەیان لەگەڵدا بكەم؟،پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵیٚ بەچوار شت دەتوانی

أ-دوعایان بۆ بكە وداوای لێبوردنی گوناهەكانیان لەخوا بۆ بكە

ب-پەیمان وبەڵێنیان جێبەجیٚ بكە.

ج-ڕێز لەدۆستەكانیان بگرە.

د- سەردان و پەیوەندی خزمەكانیان بەهێز بكە.

پیاوەكە گوتی: ئەمە شتێكی زێدە چاكە،پێغەمبەر ﷺ فەرموی: دەئیشی پێبكە.[3].

٨-خۆشی بهێنە بۆسەر دڵیان بەچاكەكردن لەگەڵیاندا، و دیارییان بۆ بكڕە و خۆتیان لەلا خۆشەویست بكە بەئەنجامدانی هەر شتێك كە ئەوان پێیان خۆشە.

٩-ماڵو سامانی دایك و باوكت بپارێزە و بەبیٚ پرسی ئەوان دەست لەكەلو پەلو ماڵ و سامانیان مەدە.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه(٢٥٥٢).

[2] بروانة: آداب المسلم ل: ١٧٩، والآداب للبيهقي،ل:٥ .

[3] الآداب للبيهقي،ل:٦ .

١٠-سومعەیان بپارێزە و مەهێڵە کەس جنێویان پێ بدا، عەبدڵڵەی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**من الكبائر شتم الرجل والديه، قالوا وهل يشتُمُ الرجلُ والِدَيْه؟ قال: نعم، يسُبُّ أبا الرجل فيسُبُّ أباه، ويسُبُّ أمّه فيسُبّ أُمَّه**}([1]).واتە: لە تاوانە گەورەکانە کە پیاو جنێو بەدایك و باوکی خۆی بدا، یارەکان گوتیان چۆن پیاو جنێو بەدایك و باوکی خۆی دەدا؟پێغەمبەریشﷺ فەرموی: بەڵێ: ئەم جنێو بەباوکی ئەو دەدا، ئەویش جنێو بەباوکی ئەم دەداتەوە، ئەم جنێو بەدایکی ئەو دەدا، ئەویش جنێو بەدایکی ئەم دەداتەوە.

١١-لەکاتی خەوتنی دایك و باوکتدائاگاداربە نارەحەتیان مەکە ودەنگە دەنگیانلەگەلدا مەکە، بەبێ پرس مەچۆ ژوری خەوتن و حەوانەوەیان.

١٢-لەگفتوگۆکردندا موناقەشە لەگەڵ دایك و باوکتدا مەکە و قسەیان پێ مەبڕە و لەبەردەم ئەواندا گاڵتەکردنو پێکەنین و قاقا مەکە.

١٣-لەهەموو کاروبارێکدا راوێژیان پێ بکە، و سود لەڕاو بۆچونیان وەربگرە و ئامۆژگاری ئەوان قەبوڵ بکە.

١٤-دوعا ونزا زۆر بۆ دایك و باوکت بکە، داوای لێبوردنی گوناهەکانیان لەخوا بکە، داوا لەخوا بکە کەخوا جل جلالە پاداشتی بەخێری پەروەردەو بەخێوکردنی ئەوان بە باشترین پاداشت بداتەوە.

١٥-دایك و باوکت کە وەفاتیان کرد زیارەت و سەردانی گۆڕەکانیان بکە،ودوعای بەخێریان زۆر بۆ بکە و زۆر باسیان بکەو بەزەییت پێیاندا بێتەوە.([2]).

١٦- بەبێ پرسی دایك و باوکت گەشت وسەفەر مەکە، شتێکی وامەکە ڕقیان هەڵبستێنی،خواردنی خۆش بەبێ ئەوان مەخۆ، لەپێشئەوانەوە دەست بۆ خواردن مەبە،ئەو کارانە مەکە کەدەبێتە هۆکاری ئەزیەتدانیان.([3]).

---

١حديث متفق عليه.

[2]الآداب الإسلامية للناشئة ب/١ ل: ٧٨-٧٩.ومنهاج الصالحين،ب١/ل:٢٥٢ .

٣منهاج الصالحين فيالآداب الإسلامية،ب١/ل: ٢٥٠ .

**{پرسیار ووەڵام}**

١-ئایادایك و باوك دەتوانن بەزۆرکچێك بۆ کوڕەکەیان بهێنن؟. وەڵام: نەخێر دروست نیەدایك و باوك بەزۆرکوڕەکەیان ناچار بکەن کەفلانە کچە بهێنێ.([1]).

٢-ئایا واجبە کوڕ بەقسەی دایك و باوکی بکات، وهاوسەرەکەی طە لاق بدا؟. وەڵام:کابرایەك بەئیمام ئەحمدی گوت:باوکم فەرمانی پێ کردووم ژنەکەم طلاق بدەم،ئایا بەقسەی بکەم؟،ئەویش لەوەڵامدا گوتی:نەخێر بەقسەی مەکە،دروست نیەطە لاقي بدەی، بەلامچاکەی لەگەڵدا بکە.([2]).

٣-ئایا ماڤ دایك وباوك، کامەیان پێشدەخرێ؟

وەڵام: ماڤ دایك پێشدەخرێ بەسەر ماڤ باوکدا.

٤- ئایا ماڤ دایك وباوك و ژن کامەیان پێشدەخرێن؟

وەڵام: ماڤ دایك وباوك پێشدەخرێ بەسەر ماڤ ژندا.(٣).

## سێزدەیەم: ئادابەکانی خوشك و برا لەگەڵ یەکتریدا:

گومانی تێدانیە بڕواداران تێکڕا برای یەکن، برای بڕوایی و ئیمانیش پەیوەندی و خزمایەتیەکی دەرونیە،خوای پەروەردگار لەناو بڕواداراندا دایناوە، بگرە بڕواداران هەموویان خوشك و برای یەکن و بەندەی خوای پەروەردگارن، چونکە هەمویان لەیەك دایك و باوك کە ئادەم و حەوایە دروست بوون، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿.... فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَانًا .... ﴾ (آل عمران: ١٠٣) واتە: خوای پەروەردگار ئولفەت و خۆشەویستی یەکتری خستە ناو دڵەکانتانەوە، بەهۆی نیعمەتی خواوە ئێوە بوون بەبرای یەکتر. لەبەرئەوە ئەرکی گەورەی بڕواداران ئەوەیە کە سۆز وبەزەیی و خۆشەویستی نێوانیان بپارێزن، لەبەر هیچ شتێکی دونیایی لەکیس خۆیانی نەدەن و پارێزگاری لێوە بکەن، ئەمەش بەوە دەبێت ئەم ئادابانەی لای خوارەوە ڕەچاو بکەن و لەنێوان خۆیاندا ئەنجامی بدەن.

---

[1] الآداب الشرعية لابن مفلح، ب١/ ٥٨٨.

[2] الآداب الشرعية لابن مفلح، ب١/ ٥٨٩.

[3] منهاج الصالحين فيالآداب الإسلامية،ب١/ل:٢٥٥.

## ئادابەکان:

١-سوربون لەسەر پارێزگاریکردن لەسەر سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی نێوان برایان و خوشکان،ئیبن عەبباس-رحمەالله-گوتویەتی:(خۆشەویسترین براکانم برایەکمە ئەگەر لەلای نەبم عوزرو بەهانەم بۆ بهێنێتەوەو ئەگەر بولای هاتمەوە وەرم بگرێتەوە)([1]).

٢-باڵی بەزەیی بۆ براکانت ڕابخە و تەوازوع بنوێنە،وخۆت بەگەورە مەزانە، خوای جل جلالە فەرمویەتی:﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (المائدة: ٥٤) واتە: ئەو بڕوادارانە بەرامبەر بەبڕواداران سادە وبێ فیز وبەڕێزن، بەڵام بەرامبەر بەبێباوەڕان ڕەق و زەبر وپیاون.

٣-ڕێز گرتن لە برا گەورەکان و سۆزو بەزەیی هاتنەوە بەبرا بچوکەکان، ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ليس منّا مَنْ لم يَرحَمْ صغيرنا ويُوقِّرْ كبيرنا**}([2]).

واتە: ئەو کەسەی کە بەزەیی بەبچوکەکانماندا نەیاتەوە،وڕێزو حورمەتی گەورەکانمان نەگرێ، ئەوە ئەو کەسە لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە.واتە:مسولمانی ڕاستەقینە نیە.

٤- لەگەڵ براکانتدا ڕەوشتت بەرز بێ،واتە:مامەڵەتلەگەڵیانداجوان بێ،لەگەڵیانداچاك بە، بەشداری ئێش وئازاریان بکە، پێغەمبەر ﷺوەصیەتی بۆ ئەبوذەر کردو فەرموی: {....**وخالِق الناسَ بخُلُقٍ حَسَنٍ**}([3])، واتە:بەڕەوشتە جوانەکان وخەصلەتە بەرزەکانەوە تێکەڵاوی خەڵك بکەو ژیانێکی خۆش و بەختەوەرانە ببەسەر.

عائیشە-رضی الله عنها- گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{**خيرُكُمْ خيرُكُمْ لأهْلِه، و أناخيرُكُم لأهلي**}([4]) واتە: چاکترینتان ئەوەیە بۆ کەس و کارو منداڵ و خێزانی خۆی چاکتر بێت، وە من بۆ کەس وخێزانەکانی خۆم چاکترینی ئێوەم.

٥- کە پێیان گەیشتی سەلامیان لێ بکە وتەوقیان لەگەڵدا بکە ولەڕویاندا ڕوگەش و لێو بە خەندەبە ، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: { **لاتَحْقِرنّ مِن المعروف شيئاً، ولو أنْ تَلْقَى أخاك**

---

[1] بروانة: آداب المسلم للشيخ عبد الرحيم مارديني، ل: ١٤٨.

[2] المسند الجامع لابي الفضل النوري، رقم ٨٥٨١،وأخرجه البخاري في الأدب المفرد(٣٥٥).

[3] أخرجه الترمذي في سننه، وحسّنه الألباني في صحيح الجامع، رقم:(٩٧).

[4] أخرجه الترمذي في سننه،وقال:حديث صحيح.

**بوجهٍ طَلِق**}([1]) واتە: لەچاکەداهیچ شتێك بەکەم مەگرە، هەرچەندە ئەوە بێت کە بەڕوویەکی گەش و کراوەوە بەبراکەت بگەی، وە فەرموویەتی: {**الكلمة الطيّبة صدقةٌ**} .
واتە :قسەی خۆش لەگەل خەلکداخێر وصەدەقەیە.

٦-چاودێری هەستی برایەکی غەمبارت بکە وهەستی بریندار مەکە، نان و ئاو مەخۆ لەبەردەم برایەکی ڕۆژوەواندا، لەلای برایەکی خەوتوت هەرا هەرا و دەنگە دەنگ مەکە.

٧-هەرچی خێر وخۆشی و چاکە هەیە، کە بۆخۆت گەرەکتە بۆ براکەشت بوێ،ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لايؤمنُ احدُكُم حتى يُحِبّ لأخيه مايُحِبّ لنفسه**}([2]) واتە: هەتا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ براکەت پێت خۆش نەبێ.
بڕواداری تەواو وکامڵ نی.

٨-کە چاکەت لەگەڵ خوشك وبراکانتدا کرد، دوایی منەتیان بەسەردا مەکە، چونکە خوا جل جلالە منەت کردنی قەدەغە کردوە.

٩-گرنگی بەکاروباری برا وخوشکەکانت بدە وحاڵ و ئەحواڵیان بزانە، وهەوڵ بدە یارمەتی و کۆمەکیان بکە، بەتایبەت ئەوانەیان کە هەژارن، یان خەریکی خوێندنن، یان خەریکی خانوکردنن.([3]).

١٠-ئەگەر براکەت لەسەر هەق بوو یارمەتی بدە، وە ئەگەر ستەم لێکراو بوو هەوڵبدە سەری بخە. ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**أُنْصُرْ أخاك ظالماً أو مَظْلُوماً**}واتە: یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بێ، یان ستەم لێکراو ، کابرایەکە گوتی: ئەی پێغەمبەر براکەم ستەم لێکراو بێ باشە، بەلاَم ئەگەر ستەمکار بێ چۆن یارمەتی بدەم؟
پێغەمبەرﷺفەرموی: {**تَحْجِزُهُ- أو تَمْنَعُهُ من الظلمِ، فإنّ ذلك نَصرُهُ**}([4]) واتە: لەستەم کردن قەدەغەی بکە، مەهێڵە با ستەم نەکات، بەراستی ئەوە یارمەتیدانیەتی.

١١- لەهەڵەو کەموکوڕی براو خوشکەکانت ببورەو چاوپۆشیان لێ بکەو عوزرو بەهانەیان وەربگرە وسەرکۆنە وسەرزەنشتیان مەکە، عەبداڵلەی کوڕی مەسعود-رحمه الله- دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: {**ألا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ تحرمُ عليه النارُ؟، تَحْرُمُ على كُلِّ**

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] حديث متفق عليه.

[3] منهاج الصالحين،ب١/ل:٤٦٠.

[4] أخرجه البخاري في صحيحه.

قريبٍ هيِّنٍ ليِّنٍ سَهْلٍ}([1]) واتە: با پێتان بڵێم دۆزەخ لەسەر کێ قەدەغەیە؟ دۆزەخ لەسەر هەمو کەسێکی نزیکی لەسەرەخۆ ونەرم وئاسان قەدەغەیە.

ئیبن مازن دەڵێ: بڕوادار عوزر هێنانەوەی براکەی پێخۆشە، بەڵام دوڕو هەڵخلیسکانی براکەی دەوێ. حمدونی قصاردەڵێ: ئەگەر براکەت کەم وکوڕیەکی لێ ڕودا تۆ حەفتا عوزر و بیانوی بۆ بهێنەوە.([2]). شێخ جبرین دەڵێ:ئەگەر برایەکت قسەیەکی کرد گومانی خەراپی پێ مەبە مادام قسەکەی خێر هەڵدەگرێ، خۆ ئەگەر ئەوقسەیە یەك چاکە ودەخەراپە هەڵبگرێ، ئەوە تۆ یەك چاکەکە هەڵبگرە نەك دەخەراپەکە، چونکە پێویستە تۆ گومانی چاك بەبراکەت بەری، نەك شتی خەراپ([3]).

١٢-ئەگەر دوبرا یان دوخوشك کێشەیان هەبوو زو کێشەکەیان چارەسەر بکە، هەوڵ بدەن دوبەرەکی و پشت لەیەکتر کردن وحەسودی و گومانی خراپ بەیەکتری نەمێنێ و ئەزیەت و ئازاری یەکتر نەدەن، نە بەزمان نەبەدەست،ئەبو هرەیرە گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إيّاكم والظنَّ، فإنَّ الظنَّ أكذبُ الحديث،ولا تجسّسُوا، ولا تنافَسوُا ولا تحاسَدوُا، ولا تباغَضوُا، ولا تدابَرُوا، وكُونوُا عبادَالله إخواناً كما أمَرَكُمْ}([4]) واتە: نەکەن گومان بەیەکتری مەبەن،چونکە گومان بردن درۆترین قسەیە،وحەسودی بەیەکتری مەبەن، ورق لەیەکتری هەڵمەگرن، پشت لەیەکتری مەکەن، ببن بەبەندەی خوا وبرای یەکتربن، وەك خوا فەرمانی پێ کردون.

١٣-هەول بدە هاوڕێیەتی خوشك وبرای ژیر وزانا ولەسەرەخۆ وپارێزکار(متقي) بکە،پایەبەرز ذنوني میصری دەڵێ:(خوا جل جلاله هیچ خەڵاتێك چاکتر لەژیری بە بەندەی خۆی نەبەخشیوە،وە هیچ خشلێك جوانتر لەزانست بەندەی خۆی پێ نەرازاندۆتەوە،وە هیچ بەندەیەکی بە جوانتر لەحیلم نەڕازاندۆتەوە،وە کەماڵو تەواویەتی ئەمانەش هەمو پارێزکاری وترسە لە خوا سبحانە.([5]).

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه رقم:٢٤٨٨،وهوصحيح،بروانه (السلسلة الصحيحة) (٢/٦٤٦-٦٥١)

[2] آداب العشرة لأبي البركات الغزي،ل:١،وآداب الصحبة لأبي عبدالرحمن السلمي،ل:٤٥.

[3] الآداب والأخلاق الشرعية، للشيخ عبد الرحمن الجبرين، ل:١٦ .

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] آداب الصحبة لأبيعبدالرحمن السلمي،ل:٥٢.

١٤-نەصیحەت وئامۆژگاری براکانت بکە،چونکە مرۆڤ چەندە پێویستی بەماڵ و سامانە ئەوەندەش پێویستی بەنەصیحەت وئامۆژگاری براکەیەتی،بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنّ الدّين النصيحة..**}([1])،واتە:ئاینی ئیسلام لەسەر ئامۆژگاری یەکتری بەندە.([2]).

١٥-ئێوە کەس و برای یەکن، نابێ ستەم لەیەکتری بکەن ونابێ یەکتری بدەنە دەستی دوژمنەوە،پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**المسلم أخو المسلم لايظلمُهُ ولايُسلمُهُ**}([3]) .

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە ستەمی لێناکات، ونایداتە دەستی دوژمنەوە، و شەرمەزاری ناکات، وە ئەگەرناحەزێك ویستی زەمی براکەت بکات وئابڕوی ببا،تۆ هەتا بۆت دەکرێ بەرگری لەبراکەت بکە،چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {هەرکەسێك دیفاع لەبراکەی بکات، ئەوە خوا جل جلالە لەڕۆژی دواییدا ئاگری دۆزەخی لێ دور دەخاتەوە}([4]).

١٦-کاتێك بەلێنت بەبرایەکتدا بەلێنەکەت ببەسەر،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**آية المنافق ثلاث.... وإذا وعد أخلف ....**}([5])،واتە: نیشانەکانی دوڕو سێ شتە، قسە بکادرۆ دەکا، کەبەلێنیدا بەلێنەکەی دەشکێنی،کەئەمانەتیان پێدا خیانەتی لێدەکات.

١٧-کاتێك لەبرایەکت توڕە دەبی، لەسێ ڕۆژ زیاتر دەنگی لێ وەر مەگرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لا يَحلّ لمسلمٍ أنْ يَهْجُر أخاه فوق ثلاث ليالٍ، يلتقيان فيَعْرِضُ هذا ويَعْرِضُ هذا، وخيرهما الذي يَبْدَأُ بالسلام**}([6])،واتە: لەسێ شەو زیاتر بۆ مسولمان دروست نیە دەنگ لەبراکەی دابڕێ،بەیەك دەگەن،وپشت لەیەکتری دەکەن،بەڵام چاکتریان ئەوەیانە کە سەلام لەبراکەی دەکات،وئاشت دەبێتەوە .

١٨-عەیب وعاری برا کانت داپۆشەو شتە جوانەکانیان بەدەر بخە، چونکە بۆتەوایەتی جوانی داپۆشینی عەیب وعارەکان،وبەدەرخستنی شتە جوانەکان ئەمەندە بەسە کە

---

[1] الجامع الصغير من حديث البشير النذيررقم:(١٩٦٨).

[2] آداب العشرة وذكر الصحبة والأخوة لأبي البركات الغزي،ل:٢.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] الآداب الاسلامية للناشئة،ل:٨١، ومنهاج الصالحين،ب١.ل:٤٤٨.

[5] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[6] المسند الجامع،رقم:(٣٥٤٥)،وأخرجه البخاري ومسلم وأحمد.

وەصفی خوا بەوە کراوە، لەپاڕانەوەدا بەندەکانی خوا دەڵێن:(**یامَنْ أظهَرَ الجميل وسَتَر القبيح**) واتە:ئەی ئەوکەسەی کە شتی جوانی بەندەکانت دەردەخەی، وشتە ناشیرینەکانیان دادەپۆشی.([1]).

## چواردەیەم: ئادابەکانی ڕێگەو بان:

ڕێگەوبان و شەقام و کۆڵانەکان شوێنی گشتین، بۆ هەموو کەس هەیە سوودی لێ وەربگرێت، بۆ تاکە کەس نییە ئەو شوێنانە بۆ سودی تایبەتی خۆی بەکاربهێنێ، ئاینی ئیسلام ئەوەندە گرنگیبە ڕێگەوبانداوە،هەتتا ئاینی ئیسلام لابردنی دڕك ودار و بەرد و قوڕ هتد...، لەسەر ڕێگەوبان بەبەشێك لە ئیمان وباوەڕی مرۆڤی داناوە،بگرە پاداشیشی لەسەر وەردەگرێتەوە، وەك لەفەرمودەی پیرۆزدا هاتوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە مسولمانان وگەنج ولاوەکان گرنگی زۆر بە ڕێگەوبانەکان وکۆڵانەکان بدەن، مافەکانیان پێشێل نەکەن وە ئەو ئادابانەی کەئاینی ئیسلام دایناوە بۆ ڕێگەوبان و کۆڵانەکان پێویستە ڕەچاوی بکەن وجێبەجێیان بکەن:

١-پاك و خاوێنی ڕێگەوبانوکۆڵانەکان بپارێزە،پیسی وخاشاك فڕێ مەدە ناویانەوە، لەسەر ڕێگەوبان وکۆڵانەکاندا سەرئاو مەکە،

٢-لەسەر ڕێگەوبان دامەنیشە، وەلەکۆڵان و پێچ و پەنایەکاندا رامەوەستە، وە دوکان و نوسینگەکان بەهەمان شێوە.

٣-مافەکانی ڕێگەوبان بدە وەك:چاونوقاندن لەنامەحرەم،وەلامیسەلامی خەڵك،وفەرمان بەچاکەوخەراپە لابردن،بەڵگەی ئەم دوخاڵەی سەرەوە ئەوەیە ئەبو سەعیدی خدری گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إيّاكُمْ والجلوسَ على الطُرُقات**} واتە: لەسەر ڕێگەوبان دامەنیشن، یارەکان گوتیان: ئاخر ناکرێ دانەنیشین، شوێنی خۆمانەو قسەی تێدا دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{**فإنْ أبيتم إلاّ المجالس فأعْطوا الطريق حَقّه**}واتە: مادام هەر دەبێ لەو شوێنە دابنیشن کەوابو دەبێ مافەکانی ڕێگەوبان بدەن، یارەکان گوتیان: مافی ڕێگەوبان چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {**غَضُّ البصر، وكَفُّ الأذى، وردُّ السلام، والأمْرُ بالمعروف، والنَّهْيُ عن المُنْكر**}([2]) واتە: لەقەدەغە کراوەکان چاوت

---

[1] منهاج الصالحين،ب١/ل:٤٥٦.

[2] حديث متفق عليه.

بنوقێنه،وتەماشای مەکه، و ئەزیەت و ئازاری کەس مەدە، وەڵامی سەلامی خەڵك بدەوە، فەرمان بەچاکە بکە، وخەراپەو خەراپەکاری رامالە و مەیهێلە.

٤-لەسەر ڕێگەوبان یارمەتی خەڵك بدە، بەپیر لێ قەوماوانەوە بڕۆو دەستیان بگرە، گومڕایان شارەزا بکە، یارمەتی و کۆمەکی ڕێبواران و داماوان بکە، دەستی ئینسانی کوێر بگرە، و دەستباری خەڵك بدە لەبار بارکردن و لەداگرتنیدا.

٥-لە ڕۆیشتندا زۆرخۆت بەکەم بگرەو لوت بەرز مەبە، خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾الفرقان:٦٣.واته:بەندەکانی خوا جل جلاله ئەوانەن کە لەسەر زەویدا بەسادەیی وبە هێواشیەوە ڕۆیشتن دەکەن وفیز و هەوایان نیه.

٦-لەڕۆیشتنی ڕێگەوباندا ئاگات لەخۆت بێت، خۆت بەهیچ شتێکدا نەکێشی، یان نەکەویە ناو چاڵەوە، لەکاتی ڕۆیشتندا بەبێ پێویستی بۆلای راست و چەپ و دواوەت ئاوڕمەدەوە.

٧-لەشوێنی قەرەباڵغ وپڕ لەسەیارە وعەرەبانە هەتا دڵنیا نەبیت لەجادە مەپەڕەوە، بۆ ئەوەی تووشی ناڕەحەتی و کاری چاوەڕوان نەکراو نەبیت.([1])

٨-لە ڕۆیشتندا زۆر پەلەپەل مەکەو زۆر بەهێواشیش مەڕۆ، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ ﴾ (لقمان: ١٩) واتە: لەڕۆیشتندا میانەڕەوبە وپەلە پەل مەکە وزۆر هێواشیش مەبە.

٩-لەڕۆیشتندا فیز مەکەو خۆت بەزل مەزانە، عەبدڵڵەی کوڕی عومەر گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {مَنْ تعظَّمَ في نفسه واختال في مَشيته لَقِي اللهَ وهو عليه غَضْبان}([2]) واتە: هەر کەسێك خۆی بەزل بزانێ و لەڕۆیشتندا فیز بەسەر خەڵکەوە لێ بدا ئەوە کاتێك کە بەخوا دەگات خوا لێی توڕەیە.

١٠-لە ڕێگەوباندا پارچە نان و هەر شتێکی تری خواردن لەسەر ڕێگەدا لاببە وهەڵی بگرەوە، یان پارچە وەرەقەو کاغەزی کەوتو لەڕێگەوباندا خێرا هەڵی بگرەوە، بەتایبەت ئەو وەرەقەو کاغەزانەی کەناوی خوای تێدا یە، یان ئایەتێکی قورئانی تێدا نوسرابێتەوە.

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١/ل:٣٥٩.

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

١١-لەسەرە ڕێگەدا نان مەخۆ چونکە خەڵک بەڕێزو حورمەت دەگەیەنیّ.

١٢-لەکاتی کڕین و فرۆشتندا ولەناو سەیارەدا لەڕێگەوباندا دەنگت بەرزمەکەوە و بەدنگی موبایل وتەسجیلەکەت خەڵك ناڕەحەت مەکە،وهەرا هەرا مەکە.([1]).

١٣-لەو کاتانەدا کە لەڕێگەوباندا بەسەر دەبەی، خۆت خەریك بکە بەم شتانەوە: زیکرو یادی خوا جل جلالە، بیرکردنەوە لە نیشانەو دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار، قورئان خوێندن، پێداچوونەوەی ئەو لەبەرکراو وئەرکانەی خوێندوتە و پێشتر لەبەرت کردوە، ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە دەڵیّ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مامنْ قومٍ جَلَسوا مجلساً لم يذكُروا اللهَ عزّ وجلّ فيه إلاّ كانتْ عليهم تِرةً، وماسَلَك رجلٌ طريقاً لم يَذكرِالله عزّ وجلّ فيه الاّ كانتْ عليه ترةً**}([2]) واتە: هەر کۆمەڵێك لەشوێنێك دابنیشن و زیکرو یادی خوا عزوجل نەکەنەوە، ئەوە ئەو دانیشتنەیان دەبێتە پەشیمانی و نوقسانی لەسەریان، وە هەرکەسێك ڕێگەیەك بگرێتەبەرو لەو ڕێگەدا زیکرو یادی خوا نەکات، ئەوە ئەو ڕۆیشتنەی لەو ڕێگەیەدا بۆی دەبێتە پەشیمانی و نوقسانی.([3]).

١٤-پێویستە ئافرەتان لەڕێگەوباندا جوانی ورازاوەیی خۆیان دەرنەخەن وبۆن وبەرامی خۆیان بۆ خەڵکی بلاْونەکەنەوە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ (الأحزاب: ٣٣). واتە: ئەی ئافرەتانی مسوڵمان ئێوە وەك ئافرەتانی سەردەمی نەفامی(جاهیلیەت) مەکەن،جوانی و ڕازاوەیی خۆتان بۆ خەڵکی دەرمەخەن.

هەروەها خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ ..... ﴾ (النور: ٣١) واتە: ئەی ئافرەتە بڕوادارەکان ئێوە لەئاست پیاوی نامەحرەمدا چاوتان داخەن و تەماشای پیاوی بێگانە مەکەن([4]).

١٥-برا وخوشکە بڕوادارەکان پێغەمبەر ﷺ لەڕێگەدا بەم شێوە ڕۆیشتوە کە باسی دەکەین، ئێوەش وەك ئەو برۆن بەڕێگەدا، ئیبن ئەبی هالە باسی ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ

---

[1] منهاج الصالحين،ب١/ل:٣٥٩.

[2] تحفة الأشراف بمعرفة الأطراف، رقم:٤٠١٨ ؛ تحقيق: عبد الصمد شرف الدين.والمسند الجامع،٩/٤٠٤؛وهو صحيح.

[3] بروانە: الآداب الإسلامية للناشئة.

[4] بڕوانة: آداب المسلم، ل: ١٣٣.

دەکات کە لەڕێگەدا ڕۆیشتوە ودەڵێ: {پێغەمبەر ﷺ کاتێك بڕۆیشتایە پێیەکانی زۆر بەهێزەوە هەڵدەگرت، ڕۆیشتنەکەی مام ناوەندی بوو، نەزۆر بەپەلە و نەزۆر بەهێواشی، زۆر بەشەرم ویقارەوە ڕۆیشتنی دەکرد، هەنگاوەکانی فراوان بوو،کورت نەبوو، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەرۆیشت هەر دەتگوت لەبەرزاییەوە دێتە خوارەوە،کاتێك ئاوڕی بدایەتەوە بەهەموو لاشەی ئاوڕی دەدایەوە، تەماشاکردنی بۆ زەوی زیاتر بوو، تاوەکو بۆ ئاسمان، تەماشاکردنەکەی زۆربەی تێڕوانین وتێبینی بوو، یارەکانی پێش خۆی دەدا، بەهەر کەسێك بگەیشتایە سەلامی لێ دەکرد}([1]).

١٦- لە ڕێگەوباندا لەخەڵك تووڕە مەبە، ولەسەرە خۆبە، ئەزیەت وئازاری خەلك هەڵبگرە و تۆڵەیان لێ مەکەوە.([2]).

## پانزەیەم: ئادابەکانی خوێندنگا ودەرس خوێندن:

عیلم وزانست زۆر پیرۆزە، داواکردنەکەی خواپەرستیە،یادکردنەوەی تەسبیحاتە، توێژینەوەی جیهاد وتێکۆشانە،فێرکردنی خەڵك خێر وصەدەقەیە،چونکە جیاکەرەوەی حەڵاڵ وحەرامە،......هەرشتێك لەئاسمان وزەویدایە هەموی داوای لێخۆشبون بۆ ئینسانی زانا دەکات هەتتا ماسیەکانی دەریا ومێرولەی سەر زەوی، چونکە عیلم وزانست دڵەکان لەنەزانی ڕزگار دەکات، چرای چاکانە، مرۆڤ بەهۆی زانستەوە دەگاتە پلە وپایەی چاکان وپیاوانی خوا جل جلالە.([3]).

لەبەر ئەوەیە کە خوا جل جلالە ڕێزو وحورمەتی زانایانی بەرز کردۆتەوە،وەك بڕواداوان وەك فەرمویەتی: ﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴾ المجادلة:١١.

واتە:خوا جل جلالە پلە وپایەی بڕواداران و زانایانی بەرز کردۆتەوە. وە لەفەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە فەرمویەتی: {طَلبُ العلم فريضةٌ على كلِّ مُسْلمٍ}([4]) واتە: داواکردنی زانست وگەڕان بەشوێنیدا لەسەر هەمو موسڵمانێك -پیاو یان ئافرەت-فەرزە و واجبە.

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه. بروانە: الآداب الإسلامية للناشئة، ل:٨٦.

[2] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٣٩٨.

[3] من كلام الصحابي الجليل، معاذ بن جبل رضي الله عنه.

[4] رواه ابن ماجه عن أنسٍ رضى الله عنه.بروانە: الجامع الصغير،ب٢،رقم:٥٢٦٤.قال الزركشي في اللآلئ : روي من

بەدەستهێنانی زانست و زانیاری و شت وەرگرتن و شت لەبەرکردن لەسەرەتای تەمەنی مرۆڤەوە زۆر پێویستی بەماندبوون وتێکۆشان وبەردەوام کۆشش کردن هەیە، بۆیە عمری کوڕی خەتتاب داوایکردوە وگوتویەتی:(تَفَقَّهوا قبل أنْ تُسوَّدوا)([1]) واتە:بەرلەوە ببن بەکاربەدەست وببن بەگەورەی خەڵك، لەئاینەکەتان تێبگەن و خۆتان شارەزا بکەن.([2]).

گەورەترین توێشویەك کە منداڵ لەمنداڵیەوە بەدەستی بهێنێ، قورئان خوێندن و قورئان لەبەرکردنە، وە دیارە منداڵ لەکاتی دەرس خوێندن و لەخوێندنگادا پێویستی بەکۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشتی بەرز هەیە، لەبەرئەوە پێویستە منداڵە خوێندکارە بەڕێزەکان ڕەچاوی ئەم ئادابانە بکەن،وجێبەجێیان بکەن.

## یەکەم: ئادابەکانی خوێندنگا:

١-پێویستە دایك وباوك شەو زوو منداڵەکەیان بخەوێنن، بۆ ئەوە زو لەخەو هەڵبستێ و دەستنوێژ بگرێ ونویژەکەیان بکەن وبەرێکەون بۆ خوێندنگاولەخوێندن دوا نەکەوێ و پێش زەنگ لێدانی دەرس خوێندن خوێندکار بگاتە خوێندنگا بۆ دەرس خوێندن.([3]).

٢-پێویستە خوێندکار سەلام لەمامۆستاکان وبرا خوێندکارەکانی خۆی بکات و ڕێزو حورمەتی خۆی بۆیان دەربرێت.

٣-پێویستە کتێب و دەفتەرەکانی بەگوێرەی بەرنامەی ڕۆژانەی لەخوێندنگادا ئامادە بکات و لەگەڵ خۆیدا بیانبات.

٤-لەناو دەرسەکەیدا زۆر ئاگادار بێت و هاوبەشی مامۆستاکەی بکات لەدەرسەکەیدا و ئاگاداری شیکردنەوەی مامۆستاکەی بێت کاتێك دەرسەکەی بۆ شی دەکاتەوە.

٥-خوێندکار دەبێ ئاگای لەڕەوشتە بەرزەکانی خوێندنگا بێت و پارێزگاری لەڕێ و ڕەسم ویاسای گشتی خوێندنگا وزانکۆ بکات و بیپارێزێت.

---

طرق تبل غرتبة الحسن،قال: وقال السيوطي:حديث حسن.

[1] روضة المحبين،ب١/رقم:٤٤، وفتح الباري ١/١٦٦ ) وإسناده صحيح.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ل:٩٢.

[3] تربية الأطفال بين البيت والمدرسة،أحمد حسن الخميسي،ل:٧٩.

٦-لەکاتی دەرس خوێندندا نابێ خوێندکار خۆی بەشتی لاوەکیەوە خەریك بکات و ئاگای لە دەرسەکەی نەمێنێ، یان قسە لەگەڵ خوێندکارەکانی تردا بکات.
٧-پێویستە خوێندکار ئەو ئەرکانەی کە پێی دەسپێرن لەدەفتەرێکی تایبەتدا بیان نوسێتەوە،ولەلای خۆی هەڵیان بگرێت، بۆئەوە لەماڵەوە بگەڕێتەوە لایان و ئامادەیان بکات بۆ کاتی خۆی.
٨-لەگەڵ خوێندکارە بچوکەکاندا بەشێوەیەکی جوان و ڕێكو پێك با خوێندکار یاری بکات، بەلأم لەگەڵ خوێندکارە گەورەکان بایاری نەکات، چونکە تەمەنیان جودایە.
٩-پێویستە خوێندکار زۆر گرنگی بەکاتی خۆی بدات،وکاتی خۆی بەفیڕۆ نەدات، و سود لەفورسەکان وەربگرێت، و هەر کارێکی پێویستی هەبێت لە فورسەکاندا جێبەجێی بکات، بۆئەوەی لەدەرس خوێندنەکەی دوانەکەوێت.
١٠-پێویستە خوێندکار خواردن وخواردنەوەی زۆر پاك و خاوێن بخوات، پێش نانخواردن ودوا نانخواردن هەردو دەستەکانی جوان بشوات، بەتایبەت ئەو کاتەی کە لەسەرئاودەست دێتە دەرەوە دەستەکانی جوان بەئاو وصابون بشوات.([1]).

١١-پێویستە خوێندکارزۆر خۆی لەگوناهو وتاوان بپارێزێ، وبەهیچ شێوەیەك نزیکی گوناهو خەراپە نەکەوێتەوە،چونکە گوناهو خەراپە کاریگەری زۆر خەراپی هەیە، خوا جل جلالە فەرمویەتی ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ ﴾ البقرة:٢٨٢، واتە: پاك وپارێزکاربن خوا زانستان فێر دەکات، ئیبن مسعود دەڵێ:ئینسان بەهۆی گوناهکردنەوە زانستی لەبیر دەچێتەوە.([2]).
١٢-نابێ خوێندکار بەبێ پرس کردن دەست لەکەل وپەلی تایبەتی خوێندکارەکانی تر بدات، ولەخۆیەوە بەبێ پرس شتێکیان لێ بخوازێت، وەکە شتەکەشی خواستپێویستە بیباتەوە وسوپاسیان بکات.
١٣-نابێ خوێندکار بەچاوی سوکەوە بۆ خوێندکارەکانی تربڕوانێ وگاڵتەیان پێ بکات، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن

---
[1] الآداب الإسلامية للناشئة،ب١/ل:٩٤-٩٥،وتربية الأطفال بين البيت والمدرسة، أحمد حسن الخميسي،ل:٧٩.
[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٠٥.

يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ ﴾ (الحجرات: ١١). واتە: نابێ هیچ کەس ومیللەتێك گاڵتە بەهیچ کەس و هیچ میللەتێکی تر بکات، چونکە نزیکە گاڵتە پێ کراوەکان لەوانیتر چاکتر وباشتر بن.

١٤- پێویستە خوێندکار هاوەڵی صالح وچاکورەوشت بەرز وزیرەك بۆ هاورێیەتی خۆی هەڵبژێرێت، ئەبوهرەیرە گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**المرء على دِين خليله، فلينظرْ احدُكُمْ مَن يخالِلْ**}(١) واتە: مرۆۃ لەسەر دین و ئاینی هاوەڵەکەیەتی، بۆیە ئێوە تەماشا بکەن، بزانن کێ دەکەن بەهاوەڵی خۆتان.

١٥- هەر لەسەرەتای ساڵەوە پێویستە خوێندکار خۆی بۆ تاقیکردنەوەکان ئامادە بکات، دەرسەکانی چاك بخوێنێ و چاك ڕەوانیان بکات، بۆئەوەی دەرسەکان بەسەریدا کەڵەکە نەبن و بۆی زەبت نەکرێت.

١٦- لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا نابێ خوێندکار پەنا بۆ غەش و قۆپی کردن ببات، یان بەهۆی کەسێکی ترەوە کۆشش نەکات.

١٧- لەکاتی دەست پێکردنی تاقیکردنەوەدا خوێندکار ئەم نزایە بخوێنێ زۆر شتێکی چاکە، وەك لەقورئاندا هاتووە فەرمویەتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴾ (طه: ٢٥-٢٦). واتە: ئەی پەروەردگارم دڵ و سنگم بۆ زانست و زانیاری بکەوە، کارەکەشم بۆ ئاسان بکە. (٢).

١٨ - زۆر پێویستە دایك وباوك لە منداڵەکەیان بپرسنەوە، ئایا منداڵەکەیان لەخوێندنگا دەخوێنێ؟ وەئایا بەشداری دەرسەکانی کردوە؟، وەئێستا ئەرکەکانی چیە؟، بەم شێوەیە پێویستە دایك وباوك بەم کارەوە هەڵبستن، وئاگایان لەڕۆڵەکەی خۆیان بێت. (٣).

---

١ أخرجه الترمذي في سننه، وأبو داود في سننه.

٢ الآداب الإسلامية للناشئة، ب١/ل: ٩٤، وتربية الأطفال بين البيت والمدرسة، أحمد حسن الخميسي، ل: ٧٩.

٣ تربية الأطفال بين البيت والمدرسة، أحمد حسن الخميسي، ل: ٨٠.

## دوهەم: ئادابەکانی خوێندکار لەماڵەوەدا:

١-پێویستە خوێندکار هەر کە لەخوێندنگا هاتەوە ماڵەوە خێرا ئەودەرسانەی کە خوێندویەتی پێیاندابچێتەوەوبیان نوسێتەوە، لێیان نەگەڕێ لەسەری کۆببێتەوە.
٢-پێویستە خوێندکار پێداچوونەوەی بەرنامەی رۆژانەی بکات،وبزانێ ئایا هەموو ئەرکەکانی خۆی نوسیوەتەوە یان نا؟، هەروەها دیراسەی بابەتەکانی رۆژی پێشوتر بکات،وخۆی ئامادە بکات بۆ بابەتەکانی رۆژی دواتر.
٣-زۆر گرنگی بەنوسین و ریزکردن و بابەت بابەت کردن و دێر دێر کردن بدات.
٤-زۆر گرنگی بەکتێب و دەفتەرەکانی بدات و بەرگی چاکیان تێ بگرێت، وهەوڵ بدات زۆر بەپاك وخاوێنیەوە بمێننەوە.
٥-زۆر کۆشش بکات بۆئەوەی لەدەرسەکانی پێش بکەوێت،وکاتەکانی خۆی بەبێ هودە نەباتە سەر. عائیشە دەگێڕێتەوە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنَّ اللهَ تعالى يُحِبّ إذا عَمِل أحَدُكُم عملاً أَنْ يُتقنه**}([1]) واتە: خوای پەروەردگار پێی خۆشە کاتێك ئێوە کارێك دەکەن جوان وچاك تەواوی بکەن.([2]).

## شازدەیەم: ئادابەکانی خوێندکار:

گەڕان و داواکردنی زانست و زانیاری و خوێندن دەبێتە هۆی چونە بەهەشتەوە، لەم بارەوە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ سَلَك طريقاً يطلُبُ فيه علماً سَلَكَ اللهُ به طريقاً إلى الجنّة**}([3]) واتە: هەر کەسێك رێگەیەك بگرێتە بەر داوای زانست بکات، ئەوە خوا عزوجل لەو رێگەوە ئەو کەسە بەرەو بەهەشت دەبات.
وەهەتتا فریشتەکان زۆر خوێندکاریان خۆشدەوێ و زۆر رێزی لێ دەگرن، ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنّ الملائكة لتضعُ أَجْنِحَتَها لطالب العلم رضاءً بما يَصْنَعُ، وإنّ العالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ له مَنْ في السموات ومَنْ في الأرض**}([4]) واتە: فریشتەکان باڵی خۆیان بۆ

---

[1] أخرجه البيهقي في سننه،وقال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم (١١١٣) : حديث صحيح.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ل:٩٦،وتربية الأطفال بين البيت والمدرسة، لخميسي،ل:٨٢.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه عن ابى هريرة، رقم: ٢٦٩٩.

[4] أخرجه ابن ماجه والترمذي وصححه الألباني في صحيح ابي داود رقم:٣٦٤١.

خوێندکار رادەخەن و زۆر خۆشحاڵ وزۆر رازین بەو کارەی کە خوێندکار دەیکات وە هەرچیەك لەئاسمانەکان ولەزەویداهەیە داوای لێبوردن بۆئینسانی زانا دەکات.

زانایان لە دونیا ولە دوارۆژدا بۆ خەڵك چرای روناکین، لەرۆژ و لەمانگ و لە ئەستێرەکان بەرزترن، چونکە هەور روناکی ئەمانە دەگرێ، بەڵام روناکی عیلم وزانست هیچ شتێك پێشی لێ ناگرێ،رۆژ بەشەو بزرە، مانگیش بەرۆژ بزرە، بەڵام عیلم وزانست نە بەشەو نەبەرۆژ بزر نابێت،رۆژ شت ڕەشدەکاتەوە، بەڵام زانست سپیدەکاتەوە،مانگ پۆشاك دەڕزێنێ، بەڵام زانست زانیاریەکان تازە دەکاتەوە،ئەستێرەکان جێگای دیدگای خەڵکن، بەڵام زانست جێگای دیدگای خوای خەڵکە.([1]).

لەبەرئەوە پێویستە خوێندکار و فێرخواز چاودێری ئەم ئادابانە بکات کە باسیان دەکەین:

## یەکەم: ئادابەکانی خوێندکار لەگەڵ زانستدا:

١)دۆزینەوە وسود بینین لە کۆڕەکانی زانست وزانیاری وهەڵبژاردنی ئەو بەروبومانەی کەپێگەییون. عبدالله ی کوڕی عباس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا مَرَرْتُمْ بِرِياض الجنّة فارْتَعُوا**} واتە: هەرکاتێك بەلای باخچەکانی بەهەشتدا رۆیشتن خۆتان تێر بکەن، یارەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کام باخچە ؟ ئەویش فەرموی: {**مجالس العلم**}([2]) واتە:ئەو باخچانە کۆڕەکانی زانست و زانیاری و زانینی حەڵاڵ و حەرامە.

٢)دورکەوتنەوەووازهێنان لەهەموو گوناهو وتاوان وبەدڕەوشتیەك، وئەو شتانەی کە خوێندکار مەشغول دەکات ودەبێتە بەربەست لەبەردەم زانستدا، ئیبن عباس-رحمەالله- گوتویەتی: گوناهو وتاوان ئەم خەراپانەی بۆمرۆڤ هەیە:ڕەشیەك لەدەم وچاودا، تاریکیەك لەدڵدا،فشۆڵیەك لەجەستەدا،تەنگیەك لەریزق ورۆزیدا،بەڵام چاکە وچاکەکاری ئەم پیرۆزیانەی هەیە:تیشك و روناکیەك لەدڵ ودەم وچاودا،هێز وپێز لەجەستەدا، فراوانی لەریزق و رۆزیدا، خۆشەویستیەك لەدڵی خەڵکدا.([3])

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١، ل:٩٤.

[2] رواه الطبراني عن ابن عباس،بروانە: كشف الخفاء للعجلوني، ل:١٠٠.

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٠٥.

کاتێك ئیمامی شافیعی – رحمه الله –بەرێگەدا دەرۆیشت چاوی بەئافرەتێك کەوت، هەستی کرد کەوا ئەوگوناهە زەرەری لێداوە، بۆیەرۆیشت بۆلای مامۆستاکەی، بەم شێوەیە گوتی:

شَكَوْتُ إلى وكيعٍ سُوءَ حِفْظى + فأرْشَدنى إلي تَرْكِ المعاصى

وأخْبَرَنِى بأنَّ العِلْم نورٌ + ونورُاللّه لايُهدَى للعاصى

واتە: لەلای وەکیعی مامۆستام سکاڵای خەراپی شت لەبەرکردنم کرد، ئەویش پێی گوتم:ئەی شافیعی گوناهو تاوان مەکە، چونکە عیلم وزانست روناکی خوایە،روناکی خواشبەگوناهکاروتاوانبار نادرێت.([1])

٣)یەکلابونەوە بۆ داواکردنی زانست و تەنها هەر لەبەرخوا هەوڵی زانست بدەیت، مەبەستیشت گوێرایەڵی فەرمانی پێغەمبەر بێت، عبدالله ی کوڕی عمر گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{مَنْ تعلّم علماً لغير الله أو أراد به غَيْرَ الله فليتبوأْ مقعدَه من النار}**([2]) واتە: هەر کەسێك زانستێك فێر ببێت لەبەرخوا نەبێت، ئەوە باشوێنی خۆی لەناو دۆزەخدا خۆش بکات.

٤)دڵ ودەرونت لەڕەوشتە نزمەکان وخەصلەتە خەراپەکانولەشوێن کەوتنی هەواو ئارەزوەکان پاکبکەوە،چونکە زانست عیبادەتی دڵەونزیکبونەوەی دەرونەلەخوا جلجلالە، هەروەك چۆن نوێژ بەپاکی نەبێ دروست نابێ، بەهەمان شێوە عیبادەتی دەرونیش کە زانستەبەپاکی نەبێدروست نابێ.

٥)پارێزگاریکردن لەسەر هەیئەتی جوان و رێکو پێك و لەسەرەخۆیی و راگرتنی شەرم و ویقاری زانستو زانیاریی، ئەبو هریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{تعلّموا العلمَ وعلّموه الناسَ وتعلّموا له الوقار والسكينة، وتواضعوا لمن تعلّمتم منه العلم}**([3])

واتە: زانست و زانیاری فێربن و فێری خەڵکیشی بکەن، ولەسەرە خۆیی و شەرم و ویقاریش بۆ زانست فێر ببن، وە بێ فیز بن لەبەرامبەر ئەو کەسەدا کە ئێوە زانستی لێ

---

[1] ديوان الإمام الشافعي،ل:٤٩.

٢رواه الترمذي وقال:حسن غريب.بروانة: كنز العمال،١٠/٣٦٤.

٣أخرجه البيهقي في (شعب الإيمان) رقم:١٧٨٩وابن عبد البرّ في العلم،بروانة:(كنز العمال)،رقم:٢٩٣٤٨.

فێر دەبن، ئیبن عباس جڵەوی هێسترەکەی زیدی کوڕی سابیتی دەگرت ڕایدەکێشاو دەیگوت:ئێمە بەم شێوەیە لەگەڵ مامۆستاکەماندا فەرمانمان پێگراوە.([1]).

٦)ئەو زانستە فێربە کە سود و قازانجی بۆ خۆت وگەل وولات هەبێت، خۆت بپارێزە لەو زانستانەی کە زەرەری بۆ ئایین و گەل وولات هەیە، زەیدی کوڕی ئەرقەم گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ خۆی لەزانستی بێسود دەپاراست و دەیفەرمو: {**اللّهمّ إنّي أعوذُبك مِنْ علمٍ لاينفعُ....**}([2]) واتە: ئەی خوایە من خۆم دپارێزم بەتۆ لەو زانستەی کە سودو قازانجی نیە،، ئەوزانستەش کە سودو قازانجی هەیەسەرەکیەکانیان ئەمانەن:

أ-قورئانی پیرۆزولەبەرکردنی.

ب- فەرمودەی بەپێز.

ج-عەقیدە وبیرو وباوەڕ.

د-فیقهی ئیسلامی.

هـ-سیرە و ژیانی پێغەمبەر ﷺ.

پاشان ئەوانیتر، بەتایبەت ئەوانەی کەبۆ گەنج و لاوەکان و قوتابیە بەڕێزەکان سود و قازانجی هەیە ([3]).

٧)مەبەستت بەفێربوونی زانست ئەوە بێ کە جەهل و نەزانی لەخۆت و خەڵکی تر لاببەی،چونکە بەراستی خەڵك بەزۆری لەناو گێژاوی نەزانیندایە،ئیمام ئەحمد گوتویەتی: (**العلم لايَعْدِلُهُ شيءٌ إذا صَحّت النيّةُ**) واتە:کاتێك نیازومەبەستەکەت دروست بێت ئەوە هیچ شتێك هاوتای زانست ناکاتەوە، پرسیاریان کرد:ئەیکەی نیازکردنەکە دروستە؟ ئەویش گوتی:(هەر کاتێك ئەو کەسە نیازی ئەوە بێ کە بەهۆی ئەو زانستەیەوە جەهل و نەزانی لەخۆی و لەخەڵکی تر لاببات).([4]).

٨)خوێندکار بەهۆی زانستەکەیەوە پێویستە تێکۆشەربێ وبەرگری لەشەریعەتی پاکی ئیسلام بکات، چونکە دەفتەرو کتێب بۆخۆی بەتەنها بەرگری ناکات،بەلکو دەبێ هەڵگری ئەو ئاین و شەریعەتە بۆخۆی بەرگری لەو ئاینو شەریعەتە بکات.

---

[1] رواه الحاكم والبيهقي، وقال الحاكم:صحيح الإسناد على شرط مسلم.

[2] رواه مسلم في صحيحه.

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٩٩.

[4] بروانة: شرح حلية الطالب للشيخ عثيمين رحمه الله.

٩)خوێندکار پێویستە بەهۆی زانستەکەیەوە لەهەمو بۆنەکان و مزگەوت وبازاڕ وشوێنە گشتیەکاندا بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ لای خوای پەروەردگار و بۆلای ئایینەکەی، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەدوا ئەوە کە خوا کردی بەپێغەمبەر هەڵسا بانگەوازی خەڵکی کرد لەهەموو شوێن و لەهەموو کاتێکدا بەبێ ماندوبوون و بەبێ ترسان لەهیچ کەس جگە لەخوا، بۆیە پێویستە هەڵگری زانست وهەڵگری ئیسلامیش وەك پێغەمبەر بکات ﷺ. ([1]).

١٠)پێویستە،خوێندکارزۆرهەوڵبدا بۆ بەدەستهێنانی زانست، وئارامگربێ لەسەر خوێندن و شت لەبەرکردن و موراجەعە کردنی دەرسەکانی هەتا پێدەگات،خواجلجلالە فەرمویەتی: ﴿ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾ (هود: ٤٩) واتە: ئارامبگرەو خۆراگربە، چونکە بەراستی دەرئەنجام و کۆتایی هەر بۆ پارێزکارانە([2]).

لەبەر ئەوەیە کە گوتویانە:(من **طَلَبَ العُلا سَهر الليالي**)واتە:کەسێك داوای پلەی بەرزبکات لەزانستدا،پێویستە تەرکی خەو بکات، وشەو نەخەوێ، چونکە پێشینە چاکەکان وایان دەکرد،ئیمام بخاری جاری واهەبوە لەشەوێکدا بیست جار هەستاوە، ونوسینەوەی کردوە و ئەمجا خەوتۆتەوە.([3]).

## دووهەم: ئادابەکانی خوێندکار لەگەڵ مامۆستادا:

قوتابی وخوێندکار چەند ئادابێکی هەیە لەگەڵ مامۆستادا پێویستە ئەو ئادابانە زۆر بەچاکی ڕەچاو بکاتو ئاگای لێیان بێت:

١-پێویستە خوێندکار لەگەڵ مامۆستاکەیدا بێ فیز بێت و لوت بەرز نەبێت هەرچەندە مامۆستاکە لەو منداڵتربێت، ئیبن عباس – رحمەالله- گوتویەتی: (بەقوتابیەتی خۆم ماندوو زەبون کرد، بۆیە بەمامۆستایەتی سەردارو گەورەبوم) ، هەروەها شعبە-رحمەالله-گوتویەتی: (لەهەر کەسێکەوە گوێم لەفەرمودەیەك ببوایە، هەتا مردن دەبوم بەبەندەی ئەو کەسە.([4]).

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢/ل:٥٢.

[2] الموسوعة الآم في تربية الأولاد في الإسلام ب٢ ل:١٨٨-١٨٩.

[3] منهاج الصالحين،ب١ /ل:١٠٤.

[4] بروانە: الاداب الإسلامية للناشئة ب٢ ل:٧٥.

٢- خوێندکارپێویسته ماموٚستاهەڵبژێرێ وزانست لەزانای لێهاتو وزۆر بەدین وبەپارێز وەربگرێ ، چونکە ئەنەس گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {**إنّ هذا العلم دِين، فَانْظُرُوا عمَّنْ تأْخُذُون دِينكُمْ**}([1]) واتە: بەراستی ئەو زا نستەی ئێمە ئایینە، ئێوە بزانن ئایینەکەتان لەکێ وەردەگرن.

٣- پێویستە خوێندکار زۆر ڕێزو حورمەت لەماموٚستاکەی بگرێت، و بەچاوی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای بکات، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ليس منّا منْ لم يرحَمْ صغيرَنا ويعرْف شَرَفَ كبيرنا**}وە لەڕیوایەتێکی تردا{**حقّ كبيرنا**}([2])واتە: ئەو کەسەی کەبەزەیی بەبچکۆلەکانماندا نەیاتەوەو ڕێزو مافی گەورەکانمان نەزانێ، ئەوە ئەو کەسە لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە. هەروەها عائیشە-رحمهاالله-دەگێڕێتەوە دەڵێ :{**أمرَنا رسولُ الله ﷺ أنْ نُنْزِل الناسَ منازِلَهم**}([3]) واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێمان کرد کەوا هەر کەسەو بەپێی پلەو پایەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

ئیمامی شافیعی دەڵێ: لەخزمەت ئیمام مالکدا بوم، بەهێواشی پەڕەکانی(**موطأ**)م هەڵدەدایەوە لەبەر سامو هەیبەتی ئەوئیمامە بەڕێزە.

زانای بەرێز رەبیع کە قوتابی ئیمام شافیعی بووە دەڵێ: هەتا ئیمام شافیعی تەماشای بکردمایە، نەمدەتوانی ئاوبخۆمەوە لەبەر شەرم لێ کردنی.([4]).

٣-پێویستە خوێندکار کاتێك ماموٚستاکەی دێ بۆلای لەبەری هەڵبستێ و ڕێزی لێ بگرێت ، عبدالله ی کوڕی عمر گێڕایەوە گوتی: ئێمە لەپێغەمبەر ﷺ نزیك بوینەوە و دەستمان ماچ کرد.([5]).

ياري ئازيز (ثابيت) بەئەنەسی گوت: تۆ بەدەستی خۆت دەستت بەپێغەمبەر کەوتووە؟، ئەویش گوتی: بەڵێ،(ثابيت)خێرا هەستا ودەستی ئەنەسی ماچ کرد.([6]).

---

[1] أخرجه مسلم في المقدمة،برواته: كنز العمال،رقم:٢٩٣٧٣.

٢المسند الجامع لابي الفضل النوري، رقم ٨٥٨١،وأخرجه البخاري في الأدب المفرد(٣٥٥).

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] منهاج الصالحين،ب١ /ل:١٠٢.

٥أخرجه أبو داود،كتاب الجهاد: باب في التولي يوم الزحف،حديث(٢٦٤٧).

[6] أخرجه البخاري عن ابن جدعان.

لە صهیبەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: بۆخۆم ئیمامی عەلیم دیتوە کە دەستو قاچی عەباسی مامی ماچ دەکرد([1]).

هەروەها ئەبو سعید گێڕایەوە گوتی: کە خەڵکی (**بنوقريظة**) رازی بون بەحوکمی سعدی کوڕی معاذ، پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای سەعددا و ئەویش هات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون: {**قُومُوا إلى سَيِّدِكُم.....**}([2]) واتە: هەستن برۆن بۆلای گەورەکەتان.

٤-پێویستە خوێندکار لە کۆڕودانیشتنی مامۆستاکەیدا زۆر بە ئەدەبەوە دابنیشێ و گوێ بگرێت، حەسەن بەکوڕەکەی گوت: هەر کاتێك لەگەڵ زانیاندا دانیشتی زیاتر سوربە لەسەرئەوە کە گوێ بگری، نەك قسە بکەیت.

٥-خوێندکار بەبێ پرسی مامۆستاکەی نابێ مامۆستاکەی بەجێ بهێڵێ، خوا عزوجل فەرمویەتی:﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (النور: ٦٢).

٦-پێویستە خوێندکار پرسیاری چاك و باش لەماموستاکەی بکات، چونکە مجاهد گوتویەتی: خوێندکاری شەرمن یان بە هەواوفیز، فێری زانست و زانیاری نابێت.

٧-پێویستە قوتابی بۆ دەرس خوێندن پرس بەمامۆستاکەی بکات و هەرچی مامۆستاکەی فەرمانی پێ بکا قوتابی ئەنجامی بدا، لەم بارەوە خواعزوجل فەرمویەتی:

﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ (الكهف: ٦٦) واتە: موسا بەهاوەڵەکەی گوت:ئایا دەکرێ شوێنت بکەوم و لەو زانستەی کەفێرکراوی منیش فێر بکەیت؟

٨-پێویستە قوتابی بەچاکترین شێوە هەڵبستێ بەبەجێهانی مافەکانی مامۆستاکەی، پێشینە چاکەکانی ئیمە-رحمهم الله- ئەو مافانەیان کۆکردۆتەوە،وە ئەمەی کە باسی دەکەم هەندێکە لەو مافانە، ئیمامی عەلی - رحمەالله- گوتویەتی: مافی زاناو مامۆستا

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

بەسەرتەوە ئەوەیە: کە پێی گەیشتی سەلامی تایبەتی لێ بکە، ولەبەردەمیدا دانیشە، بەدەستەکانت لەلایەوە ئاماژە مەکە، بەتیلەی چاوت تەماشای خەڵکی تر مەکە، مەڵێ فلأن کەس قسەکەی پێچەوانەی قسەی تۆیە، باسی خەڵکی لەلامەکە، هەوڵی ئەوە مەدە ماموستاکەت هەڵەبکات، ئەگەر هەڵەی کرد هەڵەکەی وەربگرە، لەبەرخوا ڕێزو حورمەتی لێ بگرە، ئەگەر ماموستاکەت پێویستیەکی هەبوو لەپێش خەڵکەوە بۆی جێبەجێ بکە، لەکۆڕی ئەودا بەچرپە قسە لەگەڵ خەڵکیتردا مەکە، پۆشاکی ماموستاکەکەت رامەکێشە، کاتێك کە ماموستاکەت بێتاقەت و ماندوو بوو زۆری لێ مەکە، لەهاوڕێییەتی ماموستاکەت تێرمەبە، چونکە ماموستاکەت وەك دارخورما وایە چاوەڕێی لێدەکرێ،کە چ کاتێك خورمای لێ دێتە خوارەوە بۆ سەر تۆ. هەروەها هەندێکی تر لەمافەکان ئەمانەن: زۆرچاك گوێ لەماموستاکەت رابگرە، دەنگت بەسەریدا بەرزمەکەوە، ئەگەر کەسێك پرسیاری کرد با ماموستاکەت وەلأم بداتەوە نەك تۆ، ئەگەر کەسێك غەیبەتی کرد تۆ بەرگری لێ بکە، سیفاتە بەرزەکانی ماموستاکەت بۆ خەڵکی دەربخەو باس بکە.([1]).

شەوقی شاعیرڕەحمەتی خوای لێبێت گوتویەتی:

**قُـمْ للمُعـلّمِ وَفِّـهِ التبجيلا + كادَ المعَـلّمُ أنْ يكـونَ رسـولاً.**

بۆ ماموستا هەستە، ڕێزی لێ بگرە + ماموستا نزیکە ببێتە پێغەمبەر.

**أرأيْتَ أعْظَمَ و أجَلّ منَ الذي + يَبْني ويُنْشِىء أنْفُسَاً وعُقُولاً.**

پێم بڵێ:کێ لەوکەسە گەورەترە کە چەند دڵ ودەرون،وچەند هۆشمەند وبیرمەند وژیر و بلیمەت و هەڵکەوتو پەروەردە دەکات و پێدەگەیەنێ([2]).

## حەڤدەیەم: ئادابەکانی خوێندەوار و زانا ( عالم ):

زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن (عليهم السلام)، پێغەمبەرانیش ماڵو سامانو کەلوپەلی دونیایان بەجێ نەهێشتووە،بەڵکو ئاینی خوا ورەوشتی بەرزوپاککردنەوەی دەرونەکان وژیانی گیانەکانیان بەجێ هێشتووە، ئەو ئاینەی کە لەسەر زانستو حیکمەت و ناسینی نیشانەکانی خوا وپاککردنەوەی دڵ و دەرون و پەیوەندی لەگەڵ دروستکەرەکەی دا و رازاندنەوەی رەو شتە بەرزەکانەوە وەستاوە.

---

[1] بروانة: الآداب الإسلامية للناشئة ، ب٢/ل:٧١ ، وآداب المسلم ل: ٦٨-٦٩.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة ، ب٢/ل:٨٢.

زانایانی میراتگر لەنوح -علیه السلام- سەبرو ئارامی و خۆراگری لەبەرامبەر ئەزیەتدانی میللەتەکەیەوەیان بەمیرات وەرگرتووە.
لە ئیبراهیم - علیه السلام - کۆچ و هیجرەت و ئازایەتی و قوربانیدان بەژیانی خۆی و مردنی بەلاوە هیچ بێت لەپێناو بەرزبونەوەی شەریعەت وشەی خوا لەزەویدا بەمیرات وەریان گرتووە.
لەموسا -علیه السلام- هێز ونەترسان لەملهوڕان وخەبات وتێکۆشان وئەمانەت و پاك و نەزیهیان بەمیرات وەرگرتووە. لەعیسا -علیه السلام-دونیانەویستی وبەزەیی ونەفس بەرزی ورۆح بلندی و خۆشەویستی بۆ خەلك وبۆخوایان بەمیرات وەرگرتووە.
لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ رەوشت بەرزی و رەحمەت بۆ جیهان و ئاین و شەرعی پاكو ئارامی و حیلم و جیهادو ماندبوون لەبەر خوایان بەمیرات وەرگرتووە.
ئەمانە و هەر کەسێکیش وەك ئەمانە بێت بەڕاستی پێیان دەڵێن: زانایان ئەوانەی کە چاك ئاین و بەرنامەی خوایان وەرگرتووە و تێگەیشتوون و لێی حاڵی بوون، ئەمانە بەڕاستی چرای هیدایەت ومەشخەلی ڕێگان وخەڵکی شارەزا دەکەن بۆ بەرنامەی خوا جل جلالە، ئەمانە سەرچاوەکانی خێر وبەختەوەری و سەرفیرازین، زانست و حیکمەت فێری خەڵك دەکەن، نەوو رەچە وەچەی تازە پێدەگەیەنن.([1]).

## لەبەرئەمە هەموو عالم و زانایەك چەند ئادابێکی بەرزی هەیە و پێویستە بیزانین و ئیشی پیٚ بکەین، بەم شێوەیە:

١-هەمیشە لەگەڵ زانستدابەوزانستت خۆشبویٚ و بەردەوام کاتی خۆت بۆ زانست سەرف بکە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ (طه:١١٤).
واتە: ئەی محمد ﷺ بڵیٚ: ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە.
عائیشە -رضي الله عنها- دەڵیٚ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: {ئەگەر رۆژێك بەسەرمدا بێتو زانستێك کە لەخوا نزیکم دەکاتەوە زیادی نەکەم ئەوە ئەو رۆژەم پیرۆز نیە}([2]).

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:١٠٨،والآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:٥٠ .

[2] رواه الطبراني في الاوسط وأبو نعيم في الحلية وابن عبدالبر في جامع العلم وآخرون بسند ضعيف من حديث عائشة به مرفوعا.

٢-ئیشکردن بەو زانست وزانیاریەی کە هەیەتی، چونکە خوا جل جلالە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾ (الصف:٢-٣) واتە: ئەی بڕواداران بۆ قسە دەکەن و کاری پێ ناکەن، ئەمە بەلای خواوە تاوانێکی گەورەیە وەفەرموویەتی: ﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾(البقرة: ٤٤)واتە: باشە ئێوە بەخەڵك دەڵێن چاکە بکەن، بەڵام خۆتان لەبیرکردوە، خۆ کتێبی خواش دەخوێننەوە، ئەوە بۆ هەر ژێر نابن؟ ئەبو هریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:- {**أشدّ الناس عذاباً يوم القيامة عالمٌ لم ينفعْهُ الله بعلمه**}([1]) لەرۆژی دواییدا ئەو زانایە سزاکەی لەهەموو کەس سەختترە کە زانستەکەی خۆی سودی بەخۆی نەگەیاندووە.

ئەبو بەرزە گێڕایەوە:پێغەمبەرﷺفەرموویەتی:{**مَثلُ الذي يعلّم الناس الخيرَ و ينسى نفسه مَثلُ الفتيلة تُضيءُ على الناس وتُحرّق نفسَها**}([2]).

واتە: ئەو زانایەی کە خەڵکی فێری چاکە دەکات، بەڵام خۆی لەبیربکات،وەك چرایەك وایە کە خەڵکی روناك دەکاتەوە، بەڵام خۆی دەسوتێنێ.

٣-هەر جارێك زانست وزانیاریت زیادیکرد، ترستلە خوا زیاد بکات،خوا جلجلالە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾ (فاطر: ٢٨) لەناو بەندەکانی خوا دا جل جلالە تەنها زانایان لێی دەترسێن.

ئیبن عمر-رحمە الله- هەرکاتێك باسی پێغەمبەری بکردایە دەستی دەکرد بەگریان.([3]).

ئیمامی عەلی -رحمە الله- گوتویەتی:(دو کەس پشتی منیان شکاندوە:١-زانایەکی فاسق وبێ دین٢-خواپەرستێکی گێل وناحاڵی و نەزان).([4]).

وەئیمامی عمریش-رحمە الله- هەمان قسەکەی ئیمام عەلی هەیە.

---

[1] رواه الطبراني في الصغير والبيهقي في شعب الإيمان من حديث أبي هريرة بإسناد ضعيف.

[2] ترتيب أحاديث الجامع الصغير على الأبواب، ١ /٣٥.وقال:حديث صحيح.

[3] الشفاء للقاضي عياض.

[4] منهاج الصالحين ب١ /ل:١١٢ .

٤-خۆ بەرز ڕاگرتن لەبەرامبەر ئارەزو بازیە بێ نرخەکانی دونیا وگاڵتە وفریودەرەکانی دونیاوە، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴾ (طه: ١٣١) واتە: چاو مەبڕە ئەو کەسانەی کە ئێمە خۆشی دونیامان پێداون بۆ تاقیکردنەوەیان، بەڵام ڕیزق وڕۆزی خوا جل جلاله چاکترە وپایەدارترە بۆ ئێوە. شێخ حسنی بصری بە مەوقوفی گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {هەر کەسێك زانستی زیاد بکات، پاشان سوربونی لەسەر دونیا زیاد بکات، ئەوە ئەو کەسە هەر دوورکەوتنەوە لەخوا زیاد دەکات}.([1]).

٥- پێویستە زانا بێ فیزبێ لە ڕاست بەندەکانی خوا، سۆز وبەزەیی بێتەوە بەفەقێ و خوێندکارەکانی، وەك منداڵەکانی خۆی بێ بۆیان، سوربێ لەسەر دەرهێنانیان لە تاریکایی نەزانی بۆ روناکی زانست و زانیاری و شارەزابونیان لەئاین، ئەبو هریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنّما أنا لكم مثل الوالد لولده**}([2]) واتە:من بۆ ئێوە وەك باوك وام بۆ منداڵەکانی، فێری زانستیان دەکەم ومشوریان دەخۆم.

٦-یەکلابونەوە وئیخلاص بۆ خوا لەفێرکردنی زانست و زانیاریدا بۆ خەڵك، تەنها مەبەست خوای پەروەردگار بێت ، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ﴾ (هود: ٢٩) واتە: ئەی گەلەکەم من لەبەرامبەر ئەم کارەم-کاری بانگەواز- ماڵ و سامانی ئێوەم ناوێ، ئەجرو پاداشتی من هەر لەسەر خوایە.

ئەبوهریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {هەر کەسێك داوای زانستێك بکات لەو زانستانەی کە مەبەست پێی خوایە، بۆئەوە کەلوپەلێکی دونیایی پێی دەست بکەوێت، ئەوە ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات لەرۆژی دواییدا}.([3])

٧-پێویستە زانا زۆر ئاگای لەکاتەکانی خۆی بێت، بەفیڕۆیان نەدا. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لَاتَزُولُ قَدَ مَاعَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَا هُوَ عَنْ عِلْمِهِ**

---

[1] رواه ابن حبان في(روضة العقلاء) موقوفاعلى الحسن، وهو صحيح ،بروانە: تخريج أحاديث الإحياء،١ /ل:١٤٠.

[2] رواه ابْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ وَالدَّارِمِيُّ وَأَبُوداوُد وَالنَّسائِيُّ وَأَبُو عَوَانَةَ فِي صَحِيحِهِ.وهو صحيح.

[3] أخرجه ابو داود وابن ماجهبإسناد جيّد.

فِيمَا فَعَلَ . وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلَاهُ}([1]). واتە:لە ڕۆژی دواییدا هیچ کەسێك پی لەبەرپێ نانێو هەتا پرسیاری تەمەن وعیلم وزانست و زانیاری وجەستە ولاشەی لیّ نەکرێت کەوا چی لەگەڵیاندا کردوە وچۆنبەرێی کردوون؟.([2]).

شێخی شافیعیەکان لەزەمانی خۆیدا کەناوی (سلیمی رازی) بوو لەسەر کاتەکانی خۆی زۆر سەرزەنشتی خۆی دەکرد،هەتتا نەیدەهێشت کاتێکی بەبیّ سود لێی بڕوا.([3]).

٨-بەحیلم ولەسەرەخۆیی وسنگ فراوانی وتوڕە نەبونیەوە پابەندبە، چونکە تەنها حیلم و ڕەوشتە بەرزەکانە کە زانست جوان دەکات ودەی ڕازێنێتەوە.(٤).

٩-پێویستە ئارام بگری لەسەر ئەزیەت و ئازاری خەڵکی نەزان و حەسود،خوا جلجلاله فەرمویەتی: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ ﴾ الأحقاف: ٣٥ واتە: وەك چۆن پێغەمبەرە گەورەکان ئارامیان گرتووە لەبەرامبەر ئەزیەتو ئازاری ناحەزەکانیانەوە تۆش ئەوها ئارام بگرە و پەلەیان لیّ مەکە وهەولیان لەگەڵ بدە.

عبدالله ی کوڕی مسعود گێڕایەوە گوتی: (هەروەك بڵێی تەماشای پێغەمبەر ﷺ دەکەم کە بەسەرهاتی یەکێك لەپێغەمبەرەکانی دەگێڕایەوە کە گەلەکەی لێیاندابو،خوێنیان لەجەستەی هێنابوو،ئەویش خوێنەکەی دەسڕیەوە و دەیگوت: ئەی خوایە لەگەلەکەم خۆشبە، چونکە ئەو گەلە گەلێکی نەزانن.([5]).

١٠-زانست بەکەسی شیاو بڵیّ وبۆی ڕونبکەوە، نەکەی زانست لەکەسی شیاو بشاریەوە، ئەبو هریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَن سُئِل عن علمٍ فكتمه أُلجِم يوم القيامه بلجامٍ مِن نارٍ}(٦) واتە: هەر کەسێك پرسیاری زانستێکی لیّ بکرێت، بەڵام بیشارێتەوە و پێی نەڵیّ، ئەوە ئەوکەسە لەڕۆژی دواییدا بەلغاوی ئاگر لغاو دەکرێت.

---

[1] أخرجهالترمذي، رقم(٢٦٠٢ ) وهوحديث صحيح.

[2] الوقت وأهميته في حياة المسلم لعلي بن نايف الشحود، ل:١ .

[3] منهاج الصالحين ب١ /ل:١١٣ .

[4] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:٦٠.

[5] حديث متفق عليه.

[6] أخرجه الترمذي وحسنه،و أبوداود وحسنه،وصححه الحاكم.

١١-قسەی هەق لەهەر کەسێکەوە بێت وەری بگرە، لەسەر هەڵە بەردەوام مەبە، ئیمامی شافیعی-رحمە الله- گوتویەتی: حەزم کردوە خەڵك سودیان لەزانستی من وەربگرتایە، باسی منیش نەکرایە، وەلەگەڵ هەر کەسێکدا گفتوگۆم کردبێت پێم خۆش نەبووە ئەو کەسە هەڵەبکات.(١).

١٢-خوێندکار بەپێی تێگەیشتنی خۆی زانستی پێ بدرێت ، بۆئەوە پلە بەپلە زانستەکە وەربگرێت، ئیمامی عەلی-رحمە الله- گوتویەتی: ئەوە بەخەڵك بڵێن کە دەیناسن ودەیزانن، ئایا پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەکەی بەدرۆ بهێندرێنەوە؟ بە تەئکید نەخێر.([٢]). وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{نحن معاشرَ الأنبياء أُمِرْنا أنْ نُنْزِل الناسَ منازلهم، ونُكلِّمُهم على قَدْرِ عُقُولِهِمْ}([٣]) واتە:ئێمە- پێغەمبەران-فەرمانمان پێکراوە خەلکی لەشوێنی خۆیان دابنێین و هەرکەسە بەپێی عەقلی خۆی بدوێنین،بۆیە دەبێ زانا فیراسەتی هەبێ بزانێ قوتابییەکەی توانایی چۆنە؟ وچی هەڵدەگرێ،ئەگەر نا خۆیان زۆر ماندو دەکەن.([٤]).

١٣-بەبێ ئاگاداری وبەبێ زانست لەخۆتەوە فتوامەدە، بەڵکو فتوا حەواڵە بکە بۆ کەسێکی لەخۆت زاناتر، یان پێت شەرم نەبێت بڵێی ئەو شتە نازانم، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ أفتى بغير عِلْمٍ كانَ إثْمُهُ على مَنْ أفتاه}([٥]) واتە: هەر کەسێك بەبێ زانست و زانیاری فتوابدا ئەوە گوناهو تاوانەکەی لەسەرئەو کەسەیە کەفتواکەی بۆ داوە.

١٤- منەت لەسەر خوێندکارەکان مەکە چونکە ئەجرو پاداشت نامێنێ، بەڵکو بزانە ئەو خوێندکارە پیرۆزە کە بۆتە هۆی بەرزبونەوەی پلەو پایەی تۆو زیادبونی زانست و چاکەکانت.

١٥-ڕێگەی پێغەمبەرﷺ بگرە لەسەرزەنشتکردنی تاوانباردا، ناوی کەسەکە مەهێنە، هەر بەئاماژە بێت،وەك ئەوە بڵێ:(مابال أقوام)، ئەو خەڵکە بۆ وایانکردوە؟ و شێوەی ئەمە.([٦]).

---

١ منهاج الصالحين،ب١ /ل:١١٤ .

٢ أخرجه البخاري في صحيحه.

٣ أخرجه أبو داود وغيره وحسنه الألباني.

٤ موسوعة الآداب الإسلامية،للشيخ أيمن المزين ومحمد حسان،ل:٨٤.

٥ رواه ابو داود والحاكم وقال:حديث صحيح.

٦-الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:٥٩.ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:١١٠-١١٥. وموسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ أيمن المزين ومحمد حسان،ل:٨٠-٨٦.

# بەشی دووەم

**ئەم بەشە تایبەتە بە فەقێی حوجرە وزانستە شەرعیەکان و بەو گەنج و لاوانەی لە قۆناغی ئامادەیین، کوڕان وکچان، پێویستە خۆیانی پێ بڕازێننەوە و بەجوانی بیانکەن بە سلوك و ڕەوشت و مەلەکەی ژیانیان.**

زۆر پێویست وزەروریە ئێمە هەڵبستین بەوە کە دڵ و دەرونی گەنج ولاو وتازە پێگەیشتوەکان پڕ بکەین لەخۆشەویستیان بۆ خوا جلجلالە وترسان لێی،ومورااقەبە وپارێزکاری لەترسی خوا،وبەئەدەب بوون لەگەڵ خوادا کە بەردەوام پەنا بۆ خوای پەروەردگار ببەن و لێی بپاڕێنەوە وبناڵێنەوە، خۆیان لەخوا نزیك بکەنەوە بەقورئان خوێندن ولەبەرکردنی وڕێز لێ گرتنی و ناسینی مافەکەی، و بیری لێ بکەنەوە ولێی وردببنەوە،وەلەکردەیی سلوك و ڕەوشتی خۆیاندا قورئان تەتبیق بکەن، گرنگیدان بەمانەی کە باسمان کردن، زۆر زەروریە، بۆئەوە جیل ونەوەیەك پێ بگات بڕوایەکی بەهێز و کردەوەی چاك و شیرینیان هەبێت، وسودیان بۆخۆیان و ماڵ و خێزان و دایك و باوك و کەسوکارو دەرودراوسێ و هەموو خەڵك و گەل و نیشتیمان هەبێت، ئەمەش ئەرك‌و واجبی سەرشانی دایك‌و باوك و سەرپەرشتیاران وهەموو پەروەردکاران و چاکەخوازانە، ئەمەش ناگونجێ ببێ، تاوەکو دەستوری خوای پەروەردگار و شەرع و یاساکەی لەدڵ و دەرونی خەڵکداولەهەمو ژیان و ژینگە و ورد ودرشتی ژیانی خەڵکدا پیادە نەبێت، بۆیە پێغەمبەرﷺ باوکان و دایکانی بانگهێشت کردوە بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانیان و دەیفەرموو: **{لَأَنْ يُؤَدِّبَ الرجلُ وَلَدَه خيرٌ منْ أنْ يَتصَدّقَ بصاعٍ}**(1) واتە: پیاو پەروەردەی منداڵەکەی بکات چاکترو باشترە لەوەی کە وا ڕبەیەك خواردن بکات بەخێرو سەدەقە. بە تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکان و دایکانی لەپەروەردەکردن و چاودێری کردنی کچەکانیان ئارەزومەند دەکردو دەیفەرموو: **{مَنْ كانتْ له ابنةٌ فأدّبَها فأحْسَن تأديبها، و علّمها فأحْسَن تعليمها، و أوسَع عليها منْ نِعَمِ الله التى أسبغ عليه إلّا كانتْ له مَنَعةً وسِتْراً من النار}**(2).

---

(1) أخرجه الترمذي (٤/٣٣٧) ،رقم:(١٩٥١) ،وقال :حديث غريب.

(2) أخرجه ابن ماجه، بروانه: الجامع الصغير،١ /٣٣١ و قال: حديث صحيح.

واته: هەر کەسێك کچێکی هەبێت و چاك و جوان پەروەردەی بکات، و فێری قورئان و زانستی بکات و رزق و رۆزی پێ بدات ئەوە ئەو کارەی بۆی دەبێتە پەردە و ڕێگر لەئاگری دۆزەخ.

سورەی لقمان بخوێنەوە ئەو سورەتە گەورەترین نمونەی پەروەردەیی و دڵسۆزی و بەپەرۆشی بۆ ڕۆڵەکانی تێدایە، هەر ئەو سورەتە بەسە بۆ ئەوەی دایکان و باوکانی دڵسۆز وپەروەردکارانی بەسۆز بیکەنە پێشەنگی خۆیان بۆ پەروەردە کردنی رۆڵەکانیان وبۆ پێگەیاندنیان لەسەر جوانترین و چاکترین شێوازی پەروەردەکردن.

## ئەمەش چەند گوڵێکە لە گوڵزاری ئادابەکانی ئیسلام بۆ قۆناغی ئامادەیی ، پێویستە بەچاکی ڕەچاو بکرێن:

## یەکەم: ئادابەکانی کەسایەتی خودی مرۆڤ:

مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خودی خۆیدا چەند ئادابێکی هەیە پێویستە پێیانەوە پابەند بێت و بۆیان تێبکۆشێ و راستیان بکاتەوە، و پاکیان بکاتەوە، و پەلە بۆ پاڵفتە کردنیان و چارەسەریان بکات، خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ الشمس: ٩ - ١٠ واتە: ئەو کەسەی کە خۆی پاککردۆتەوە سەرفیرازو سەرکەوتووە، وە ئەو کەسەش کە خیانەتی لەخۆی کردوە زەرەرمەند و تێشکاو ودۆڕاوە.

وەفەرمویەتی:﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ ﴾ البقره:٢٣٥.

واتە: ئەوەی لەدڵتاندایە خوا دەیزانی ئاگاتان لەخۆتان بێت.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**كُلّ الناس يغدُو، فبائعٌ نفسَه فمُعْتقُها، أو مُوبقُها**} ([1]).

واتە: هەمو خەڵك کەبەیانی دەکاتەوە خۆی دەفرۆشی، جایان خۆی ئازاد دەکات وخۆی رزگار دەکات، یان بەدەستی خۆی خۆی دەفەوتێنێ وخۆی لەناو دەبات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**حُفَّتِ الجنّة بالمكاره،وحُفَّتِ النار بالشَهَوات**} ([1]) .

[1] أخرجه مسلم في صحيحه .

واتە: بەهەشت بەشتە بەزەحمەت وناڕەحەتیەکانەوە دەورە دراوە، ئاگری دۆزەخیش بەشتە خۆش و ئارەزولێکراوەکانەوە دەورە دراوە.

هەروا فەرمویەتی: {لايؤمنُ أحدُكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئتُ به}([2]) واتە: هەتا ئێوە بەشوێن ئەو ڕێبازە نەکەون کەمن بۆئێوەم هێناوە ئەوە بڕواتان تەواوو کامڵ نابێت.

لەبەرئەوەیە کە پەروەردکاران زۆر گرنگیان بە پەروەردەی خودی مرۆڤ داوە و دەستنیشانی نەخۆشیەکانیان کردوە، و چارەسەریان بۆ داناوە،وە هەموو مرۆڤێك بۆ خۆی ئەم ئادابانە لەخۆیدا جێبەجێ بکات زەروریە.

**بۆیە پێویستە ڕەچاوی ئەم ئادابانەی کە باسیان دەکەین بکرێت، ئادابەکانیش ئەمانەن:**

١-سەرزەنشتی خۆت بکە، وبەردەوام موحاسەبەی نەفسی خۆت بکە،خواجلجلالە فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾الحشر:١٨ .ئەی بڕوادارەکان پارێزی بکەن، وبزانن چیتان بۆ بەیانی-دوارۆژ-داناوە ؟.

وەعمری کوڕی خەتتاب-رحمه الله- دەیگوت:( **حاسِبوا أنفسَكُمْ قبل أنْ تُحاسَبُوا، وزِنوا أعْمالكم قبل أنْ تُوزَنَ عليكم**)([3]).واتە: پێش ئەوە کە حیسابتان لەگەڵدابکرێ ئێوە موحاسەبەی خۆتان بکەن،وەکردەوەکانتان بکێشن، پێش ئەوەی بکێشرێن.

٢-بەردەوام هەوڵبدە پێچەوانەی نەفس وشەیتان بکە، وبەقسەیان مەکە چونکە دورت دەخەنەوە لەخوا وە لەو ڕەوشتە نزم و عادەت و نەریتە خەراپانەی کەلەگەڵ شەرعی خواو سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ یەکناگرێتەوە دڵ ودەرون و نەفسەکەت تەزکیە بکەو پاکی بکەوە ،خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن

---

[1]أخرجه مسلم في صحيحه كتاب الجنة وصفة نعيمها رقم: ( ٢٨٢٢ ).

٢فتح الباري ١٣/٢٨٩ ) و رجاله ثقات، وقال فيه : ١٣ / ٢٨٩ : صحّحه النووى رحمه الله فى آخر الأربعين المنسوب إليه .

[3]الآداب الإسلامية، للمصري، ل:٦٤ .

دَسَّىٰهَا ﴾ الشمس: ٩ - ١٠. واتە:ئەوكەسەی خۆی پاککردۆتەوە سەرکەوتو و سەرفیرازە، وە ئەو کەسەی کەخۆی پاکنەکردۆتەوە تێشکاو ودۆڕاوە.

وەخوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ ....إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ..... ﴾ یوسف: ٥٣. واتە :بەراستی هەمیشە و بەردەوام نەفسەکەم فەرمانی خەراپەم پێدەکات، مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی بێتەوە پێم.([1])........

**{ئاگاداریەك}** پاککردنەوە وتەزکیەی دڵ ودەرون بەم هەنکاوانەی خوارەوە دێتەدی پێویستە مسوڵمان بەم شێوە جێبەجێی بکات:

أ-تەوبەکردن و پەشیمان بونەوە لەهەمو گوناهو تاوانەکان و عەزمی ئەوە بکەی کە جارێکیتر نەچیتەوە سەر ئەوتاوانانە.

ب-لەهەمو کات وساتێکدا پێویستە مسوڵمان دەرون و نەفسەکەی بە موراقەبەی خواوە بگریٚ و پێیەوە پابەندبکات، ویەقینی هەبیٚ کەخوا جل جلاله ئاگای لەنهێنیەکانیەتی، و دەزانیٚ چی دەکات و خەریکی چیە؟.خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ ......إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء:١.خوا جل جلاله هەمیشە بەسەر ئێوەوە موراقیبە و ئاگای لێتانە.وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ **أنْ تَعْبُدَ اللهَ كأنّك تراه، فإنْ لم تكن تراه فإنّه يراك**}([2]) . واتە: وابەندایەتی خوا بکە وەك ئەوە دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوە ئەو تۆ دەبینیٚ.([3]).

ج-لەئاخیری هەمو رۆژێکەوە موحاسەبەی خۆت بکەو لەسەر کەموکوڕیەکانت سەر زەنشتی خۆت بکە. چونکە مسوڵمان لەم دونیایەدا هەوڵی خۆشی وبەختەوەری دەدات بۆخۆی، فەرزەکان بە سەرمایە دەزانیٚ، وەسوننەتەکانیش بەسود وقازانج دەزانیٚ، گوناهو تاوانیش بەگەورەترین خەسارەت وتێشکان دەزانێت،بۆیە پێویستە موحاسەبەی خۆی بکات ، وەك باسمان کرد.

---

[1] الآداب الإسلامية، محمود المصري،ل:٦٥ .

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] منهاج المسلم للشيخ أبي بكر الجزائري، ل:٧٠ وموسوعة الآداب الإسلامية،ل:٩٢.

د –بە جیهاد وتێکۆشان، چونکە مسولمان دەزانێ دەرون ونەفسەکەی ئارەزوی خەراپە دەکات، حەزی لەخێر نیە، بۆیە مسولمان هەوڵدەدا و تێدەکۆشێ بۆ چاکە وخێر و خۆش بەختی و هەوڵدەدا خۆی لەخەراپە ونەگبەتی بپارێزێ، پێغەمبەر ﷺ ویارەکانی چۆن جیهاد وتێکۆشانیان کردوە ئەمیش هەوڵدەدا ئەوها بێت، پێغەمبەر ﷺ شەو هەتا بەیانی شەونوێژی دەکرد، پێیەکانی ئاوسابو، ئەمجا دەیفەرموو: { **أفلا أُحِبُّ أنْ أكُونَ عبداً شَكُوراً** }([1])، واتە: بۆمن پێم خۆش نەبێ کە بەندەیەکی سوپاسگوزار بم بۆ خوا ؟ ئیمامی عەلی باسی یارەکانی کردوە،ودەیگوت: (یارەکانی پێغەمبەرﷺچڵکن و کوڵکن، بە شەو نوێژ کردن و بە ڕۆژیش تێکۆشان،قورئاندەخوێننەوە، وکەباسی خوا بکرێت لەترسا فرمێسک هەڵدەرێژن ).([2]).

٣–پێویستە هەڵوێستە لەسەر کەم وکوڕی وعەیبەکانی دەرون ونەفسەکەت بکەیت، وچارەشیان بۆ بدۆزیەوە:کەم وکوڕی وعەیبەکانیش زۆرن، هەرئەمانەباس دەکەین:

أ –نەفس هۆگری هەق وراستی وخواپەرستی نیە.چارەشی دورکەوتنەوەیە لە ئارەزوەکانی نەفس.

ب–نەفس بێئاگاو وتەمبەڵە.

ج–بەئیشەکانی خۆی سەرسامە وشانازی پێوە دەکات، چارەش ئەوەیە:وابزانی کارەکان بەدەست خوایە،نازو نیعمەتەکانیش هەرئی خوایە.

د–هەر رواڵەتی خۆی دەرازێنێتەوە،گرنگی بەدڵ ودەرونی نادا، چارە ئەوەیە:دەبێ بزانی خوا هەرتەماشای دڵ ودەرون دەکات، تەماشای جەستە ومال و سامان ناکات.

ه–تام وچێژی خوا پەرستی وەرناگرێ،چارە ئەوەیە:خواردنەکەت باحەلاڵ بێت وحەرام نەبێ.

و–نەفس تەماعی زۆرە، وسەرپێچیشی هەر زۆرە،چارە ئەوەیە:تۆبەیەك بکەو کاری چاکە بکەس.

ز–نەفسەکەت مەدحی بکەی پێی خۆشە، زەمی بکەیت پێی ناخۆشە، ([3]).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[2] المصدر السابق، ل:٧٢ .

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية ، ب١ / ل:٨٧ –٨٩ .

٤-هەمیشە تەماشای کەسێك بکە کەلەخوار خۆتەوەیە، تەماشای کەسێك مەکە کە لە سەروی خۆتەوەیە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {إذا نَظَر أحدُكم إلى مَنْ فُضِّل عليه في المال و الخُلُق، فلينظُرْ إلى مَنْ هو أسفل منه ممَّنْ فُضِّل عليه}([1]).واتە:کاتێك ئێوە تەماشای ئەوانە دەکەن کەلەماڵ ولەرەوشتدا لەئێوە بەرزترن، باتەماشای ئەوانە بکەن کە لەو دوو شتەدا لە ئێوە نزمتر ولەخوار ئێوەوەن.

٥-هەوڵبدە نەفسەکەت هەڵبنێ بۆ رەوشت وکارە بەرزەکان، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{إنّ الله يُحِبُّ معالِيَ الأُمور و أشرافها، وي كْرَه سَفْسَافها}([2]) واتە: خوا جل جلاله کارە بەرز و پیرۆزو ڕەوشتە بەرزەکانی پێخۆشە، کار و ڕەوشتە پەست وخەراپەکانی پێناخۆشە.([3]).

٦- تەنها ڕێگە بۆ تەزکیە و پاککردنەوەی دەرون ونەفست ئەوەیە: بەردەوام زیکر و یادی خوابکەوەو زۆر ئیستیغفار و تەسبیحات والحمد لله ولاإله إلا الله بکە، وزۆر صلاوات لەپێغەمبەر ﷺبدە ،خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ فاذكروني أذكركم﴾واتە: بەندەکانم ئێوە زیکر ویادی من بکەنەوە، منیش زیکر ویادی ئێوە دەکەمەوە، خۆ هەر کەسێکیش خوا یادی بکاتەوە، ئەوە خوا پاکی دەکاتەوە وبەزەیی پێیدا دێتەوە.([4]).

٧- گەشبینبە وچاوەڕێی ئایندەیەکی گەش وجوانبە، ڕەشبینی وترس لەشە یطان و لە دوژمن ڕاماڵە،خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقره :٢٦٨. واتە:شەیتان بە هەژاری ونەداری دەتانترسێنێ،......بەلام خوا جل جلاله بەلێنی لێبوردنی خۆی و پیرۆزیەکانی خۆی بەئێوە دەدات و دەتانداتێ.

٨-کات وساتە پیرۆزەکانی وەك:مانگی ڕەمەزان،ودەی یەکەمی مانگی قوربان،ونیوە شەو بقۆزەوە بۆ دەستکەوتنی لوتف وبەزەییەکانی خوا، وە هەربەوەش دەرون و نەفسەکەت تەزکیە دەبێ وپاك دەبێتەوە.([5]).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

[2] رواه الطبراني في الكبير(٣ /١٣١ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(١٨٩٠ ).

[3] الآداب الإسلامية، محمود المصري، ل:٦٨ .

[4] موسوعة الآداب الإسلامية، محمد حسان وايمن المزين، ل:٩٨ .

[5] موسوعة الآداب الإسلامية، ل:٩٨ .

٩ –بە هیممەتی بەرز و بە صەبر وئارامی بەردەوامەوە خەریکی دینداری خۆتبە و سوربە و کۆڵ مەدە و تێبکۆشە و ببەخشە ، تاوەکو دەچیە ڕیزی سەرکەوتوان و براوەکانەوە ، خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ فإذا عزمت فتوکل علی الله﴾، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ **احْرِصْ علی ماینفعك، واستَعِنْ بالله، و لا تعْجَزْ**}([1]) واتە: لەسەر ئەو شتەی سودی هەیە سوربە و یارمەتیش لەخوا وەربگرە، وەقەت بێتوانا وناتەوان مەبە.

١٠– تێبکۆشە بەردەوام بیر وباوەڕەکەت زیاد بکە، وکردەوە چاك وجوانەکانت فراوانتر بکە و پشتیوانیشت هەرخوابێت، وبیر لەئایات و نیشانەکانی خوا بکەوە، وەبەقسە و خوتخوتەی شەیتانی وهاوەلی خەراپ مەکە،([2]).

١١– هەموو هەفتەیەك سوننەتە جارێك–ڕۆژی جومعە– خۆت بشۆ وپارێزگاری لەپاکو خاوێنی خۆت بکە، سمُرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ توضّأ یومَ الجمعة فبِها و نِعمَتْ، و مَنْ اغتسَلَ فالغُسْلُ أفْضَلُ**}([3]) واتە: هەر کەسێك ڕۆژی جومعە دەستنوێژ بشورێت ئەوە کارێکی چاکی کردوە، بەڵام خۆشۆرین پیرۆزترو چاکترە ئەنجام بدرێت.

١٢–هەموو هەفتە جارێك نینۆکی قاچ ودەستەکانت بکە، نەهێڵی درێژ ببن، بەتایبەت نینۆکی کچان، چونکە بن نینۆکەکان دەبێتە شوێنی کۆبونەوەی چڵك و چەپەڵی،وچڵکەکەش ناهێڵێ ئاوی دەستنوێژ بگاتە بن نینۆکەکان.

١٣–هەوڵ بدە لای ڕاستت پێش بخە لەخۆشۆرین ودەستنوێژ گرتن و تەوقەو وپۆشاك لەبەرکردن وپێڵاو لەپێ کردن و نینۆك کردن و خواردن و خواردنەوە ووەرگرتن و بەخشیندا، بەڵام جگە لەمانە وەك پۆشاك دانان و پێڵاو دانان وتارەت گرتن و دەست دان لەعەورەت و غەیری ئەمانە لای چەپت بەکاربهێنە عائیشە –ڕەزای خوای لێبێت– گێڕایەوە گوتی: {**کان رسُولُ اللهﷺ یُعْجِبُهُ التیمّنُ في شأنه کُلّه، في طُهُوره وترجّله و تنعّله**}([4]) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لای ڕاستی پێ خۆشبوو بەکاری بهێنێ بۆ هەموو کاروبارەکانی خۆ پاککردنەوە وسەروریش بەشانەکردن و پێڵاو لەپێ کردن.

---

[1] المصدر السابق، ل: ٩٨ .

[2] التفسیر المیسر للدکتور عائض القرني.

[3] رواه الترمذي وقال: حدیث حسن.

[4] حدیث متفق علیه.

وه عائيشه-رضي الله عنها- گێڕایەوە گوتی: {**كانتْ يَدُ رسولِ الله ﷺ اليُمنى لطُهُوره و طعامه وكانت اليُسرى لخلائه و ماكان مِنْ أذىً**}([1]) واته: پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی بۆ خۆپاككردنەوە و نانخواردن بەكاردەهێنا وە دەستی چەپیش بۆ سەرئاو و بۆ ئەو كارانەی كە ئەزیەتیان هەبوایە.

١٤-لەكاتی تف كردن و چڵم هەڵدان و شتەكانی تری شێوەی ئەمانەڕوو لەقیبلە(مەككە) مەكە، بەڵكو ئەمانە بەپەڕۆیەك یان شتێكی تر بەلای چەپدا فڕێیان بدە، بۆئەوە ئەزیەتی خەڵك نەكرێت.([2]).

١٥-لەكاتی پژمیندا ڕوو لەخەڵك مەكە، وڕوو لەخواردن وئاو وچایی مەكە، بۆ ئەوە پرێشكی پژمینەكەیان بەرنەكەوێت، وەدەستی خۆت یان پارچە پەڕۆیەكی پاك لەسەر دەمت دابنێ و دەنگت نزم بكەوە، ئەبوهرەیرە گێڕایەوە گوتی: {**كان رسول الله ﷺإذا عَطَسَ وَضَع يدَه على فمه، وخَفَض بها صوته**} ([3]) واته: پێغەمبەر ﷺ كاتێك كە دەپژمی دەستی لەسەردەمی دادەنا، و دەنگیشی نزم دەكردەوە.

١٦-لەدوای پژمینەوە سوپاس و ستایشی خودا جلجلاله بكە،وبڵێ:(الحمدلله).

١٧-كەسی پژمیوسوپاسی خودا دەكات،وسوننەتە تۆش پێی بڵێی:(**يرحَمُك الله**) - خودا بەزەیی بێتەوە بێتدا-، پاشان ئەو كەسە پێی دەڵێتەوە:خودا هیدایەتت بدا ودڵ ودەروونت چاك بكات، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اذا عَطَس أحدُكُم فليقل: الحمدلله، وليقل له أخُوه أو صَاحِبُهُ: (يرحمك الله) فاذا قال له يرحمك الله، فليقل: يهديكم اللهُ ويُصلِح بالكم**})([4]).ئەمە ماناكەی لەسەرەوەیە.

١٨- لەكاتی باوێشكدا دەست لەسەر دەمت دابنێ: دەنگیشت نزم بكەوە، ئەگەر بۆت بكرێت هەر مەهێڵە باوێشك بێت، وە لەدوا باوێشكەوە ئیستیغفار بكە و بڵێ: **استغفرالله**-خوایە لێم ببورە- چونكە باوێشك هاتن نیشانەی تەمەڵی و سستیە و لە شەیتانەوەیە وخودا پێی ناخۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إنَّ الله يحبّ العطاسَ و يَكْره التثاؤبَ، فإنْ عَطَسَ أحدُكُم وحَمِدَالله تعالى كان حقاً على كل مسلمٍ سَمِعه أنْ يقول له:**

---

[1] رواه ابو داود،و قال الإمام النووي في الرياض ١ / ٢٥١ : رواه أبو داود وغيره بإسناد صحيح.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة، ب١/ل:١٠١.

[3] رواه الترمذي، بروانه: الجامع الصغير ،٢ / ل:١٩٣،وقال: حديث صحيح.

[4] أخرجه البخاري في صحيحه.

**يرحمك الله، وامّا التثاؤب فانّما هو من الشيطان، فإذا تثاءب أحدُكُم فليردّه ما استطاع، فإنّ أحدَكُم إذا تثاءبَ ضَحِك منه الشيطانُ**}(1) واتە: خوای پەروەردگار پژمینی بەلاوە خۆشە، باوێشکی بەلاوە ناخۆشە، جا ئەگەر یەکێك لەئێوە پژمی و سوپاسی خودای کرد، ئەوە هەقە هەر مسوڵمانێك گوێی لێ بێت بڵێ: (يرحمك الله) بەڵام باوێشك هاتن لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێك باوێشکی هات با بەگوێرەی توانا باوێشکەکەی بگێڕێتەوە، چونکە کاتێك یەکێك لەئێوە کە باوێشکی دێت ئەوە شەیتان پێی پێ دەکەنێ.

١٩-کە تەماشای ئاوێنەتکرد زۆر شوکر وسوپاسی خودا بکەوئەم دوعایەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنە{**الحمدلله اللهمّ كما حَسّنتَ خَلْقي فحَسّنْ خُلُقي**}(2) واتە: شوکر وسوپاس بۆ خوا ئەی خوای پەروەردگار وەك چۆن جەستەو لاشەمت چاك و جوان کردوە خوو ڕەوشتیشم چاك و جوان بکە.

٢٠-لەسەرکردەوە چاکەکانی وەك: خواپەرستی ،خێرو سەدەقەکردن ، سوننەت کردن، چاکە وچاکەکاری و زیکرو ویرد وقورئان خوێندن، هتد پارێزگاری بکە، وبەردەوامبە، وازیان لێ مەهێنە، عائیشە – ڕەزای خوای لێبێت –گێڕایەوە گوتی: {**كان أحَبُّ الدِّين إلى رسُولِ الله ﷺ ما داوَمَ صاحِبُهُ عليه**}(3) واتە: خۆشەویسترین دینداری بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.

٢١- گرنگی بەچاککردنی خودی خۆت بدە و کەم و کوڕیەکانی خۆت لەبەرچاو بێت، هەوڵبدە ڕاستیان بکەوە، خۆت لەشتی خەڵك و لەشتی زیادە هەڵمەقورتێنە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مِنْ حُسْنِ إسْلام المَرْءِ تَرْكُهُ مالايَعْنيه**}(4) .واتە: وازهێنان لەو کارانەی کە مەبەستی مرۆڤ نیە لەچاکی وجوانی ئیسلامەتیەکەیەتی.

٢٢-ئامۆژگاری هەموو کەسێك بە چاکە وبەو شتانەی کە بەرژەوەندی دونیاو ئاینی تێدایە بکە، چونکە: مەداری ئاین لەسەر ئامۆژگاریە.

---

[1] الجامع الصغبر٣ /٦١ ، وقال: حديث صحيح.

[2] أخرجه الخرائطي في مكارم الأخلاق هكذا من رواية بن مسعود أي عبدالله، و هكذا رواه ابن حبان في صحيحه، و رواه أحمد من حديث عائشة، بروانه:تخريج أحاديث الإحياء ٦ /٣٢٥ .

[3] حديث متفق عليه.

[4] رواه الترمذي، بروانه: الجامع الصغبر، ٢ /ل:٢٩٩ ، وقال: حديث صحيح.

٢٣-هەر کەسێك ئامۆژگاری کردی وەریبگرە،ودان بەهەقدا بنێ،وزوو بۆلای هەق بگەڕێوە، ودان بەهەڵەکانی خۆتدا بنێ و لەسەر هەڵەکانت بەردەوام مەبە، چونکە دانایی و ڕاستی گومکراوی بڕواداره کە بەردەوام بەشوێنی دا دەگەڕێت.([1]).

٢٤-هەوڵ بدە ژیانێکی سادەو ساکارت هەبێت ، بەشتی کەم ڕازی ببەو قەناعەت بکە، عائیشە ڕەزای خوای لێبێت -گێڕایەوە گوتی:{**كان فراش رسول الله ﷺ مِنْ أُدْمٍ حَشْوُهُ ليفٌ**}([2]) واتە: ڕاخەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەرم بو، ناوەکەشی ڕیشاڵی دارخورمای تێدابوو.

٢٥-لەهەموو کارەکانتدا بۆ خوای پەروەردگار یەکلا ببەوە، و ئامانجی گەورەت تەنها ڕەزابونی خوا بێت، خوا جل جلاله فەرموویەتی:﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾(الأنعام: ١٦٢).واتە: هەرچی نوێژ وخواپەرستی و ژیان و مردنم هەیە بۆ خوایە ئەو خوایەی کە هاوبەشی نییە،([3]).

## دوهەم: ئادابەکانی مروئەت و پیاوەتی مرۆڤ :

مروئەت و پیاوەتی مرۆڤ واتە: مرۆڤ خۆی بەو ڕەوشت وسیفاتانەوە بڕازێنێتەوە کەوا مرۆڤ لە ئاژەڵ و لەشەیتان جیا دەکەنەوە، چونکە لە دەرون و نەفسی مرۆڤدا سێ داواکارییەکتر پەلکێشکەر هەیە:

أ-داواکارێکە نەفس پەلکێش دەکات بۆ سیفاتە شەیتانیەکانی وەك: خۆبەزلزان، حەسودی، ستەمکردن،گەندەلی، غەش وفێڵکردن و هتد....

ب-داواکارێکە نەفس پەلکێش دەکات بۆ سیفاتە ئاژەڵیەکانی وەك:ئارەزوبازی و تێر نەخواردن و هتد...

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة،ب١ /ل:١٠٣ .

[2] أخرجه مسلمٌ في صحيحه.

[3] الآداب الاسلامية للناشئة،ب١ /٩٧ ، وآداب المسلم ل: ١٧٥- و منهاج المسلم أبي بكر الجزائري ل: ١١١، و منهاج الصالحين، ب١ /ل:٨٣ ، الآداب الإسلامية للمصري،ل:٦٣.

ج-داواكاريكه نەفس پەلكيش دەكات بۆسيفاتە فريشتەييەكانى وەك:چاكەكردن، گويرايەلى، ئامۆژگارى، هتد، جامروئەت ئەوەيە: ڕقت لەيەكەم ولەدوەم ببيتەوە، و هەولى سييەم بدەيت.([1]).

## ئەمەش ئادابەكانى مروئەتە دەبێ ڕەچاو بكرێن:

١-پێويستە ئەوكەسە زۆر لەسەرەخۆبێ، وئالۆز نەبێ، لەرۆيشتندا زۆرپەلە پەل نەكات، و زۆر ئاوڕنەداتەوە.

٢ -لەكاتى توڕەبون و لەكاتى زۆر خۆشيدا زەبتى خۆت بكە و لەخۆشى و لەناخۆشيدا مامناوەندبە، نەشل ، نەتوند.

٣ -هەميشە ڕاشكاوانە مامەڵە بكە، موجامەلە ودوڕوويى بەكار مەهێنە.

٤-ئەوكەسەى قسەت بۆ دەكات زۆر چاك گوێى بۆبگرە،وقسەكەى مەبڕە، چونكە ئەوە گرينگيدانە بەوكەسە.

٥-نهێنيەكانى خەڵك بپارێزە و بەهيچ شێوەيەك بلأوى مەكەوە.

٦-خۆت لەقسەى نابەجێ وكردارى ناپەسەند بپارێزە، وخۆت دوربگرە.

٧-ڕێز وحورمەتى خەڵك بپارێزە، وەك چۆن بۆخۆت پێت خۆشە ڕێز و حورمەتت بپارێزرێ وەخۆت لەخەڵك بەگەورەتر مەگرە لەهيچ شتێكدا.([2]).

٨ -خۆت لەوشتانە بەدور بگرە كەمروئەتت دەروشێنن، وە ئەوانەى كەمروئەتت دەڕوشێنن زۆرن، لەم زەمانەدا بەتايبەت زۆرينەى خەلك لەبارەى پاراستنى مروئەتەوە كەم وكوڕيان هەيە، وە ئەوانەى كەمروئەتت دەروشێنن ولەكەدارى دەكەن ئەمانەن:

أ-زۆر پێكەنين وزۆر سوعبەتكردن مەكە-گوفتارى بێ يان كردارى، ئيمامى عمر بۆ كارمەندەكانى نوسى: گوتى: مەهێلن خەڵك مەزاح وسوعبەت بكەن، چونكە مروئەت ناهێلێ و كينە و ڕقيش دەخاتە ناو دل ودەرونەوە، بەلأم پێغەمبەر ﷺ مەزاح و سوعبەتى كردوە، بەلام هەر قسەى هەقى كردوە، وشتى نابەجێ وناهەقى نەكردوە، پێغەمبەر ﷺ مەزاح و سوعبەتەكانى دەرەجە يەك بوە، خەڵك شكاندن وگاڵتەكردن بە خەڵك و بريندار كردنى خەلكى تێدانەبوە، بۆيە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتى:{**ويلٌ للذي**

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ /ل:١٤٦.

[2] المصدر السابق، ب٢ /ل:١٤٩ -١٥٠ .

**يحدّث القوم، ثمّ يكذب لِيُضحِكَهُمْ، ويلٌ له، ويلٌ له}.([1]).واته:دۆڵی دۆزەخ-بۆ ئەوکەسەی قسە بۆ خەڵك دەکات، ودرۆیان بۆ دەکات بۆ ئەوە پێبکەنن.وەیل بۆ ئەو کەسە، وەیل بۆ ئەو کەسە.([2]).**

**ب-نانخواردن بەڕۆیشتنەوە و لەبازاڕدا، مەگەر بەڵام ئەگەر ناچار بێ یان خەڵکی لێنەبێ یان لەناو دوکاندا بێ ئەوە قەیدی نیە.**

**ج-بچوکەکان ڕێزی گەورەکان نەگرن، وەك: لەپێشەوە باسمانکرد.**

**د- میزکردن بەپێوە و بەبێ ناچاری.**

**ھ- بالپبونەوە لەبەردەم خەڵکدا و بەبێ ناچاری.**

**و-دەرۆزە کردن و سواڵکردن بەبێ ناچاری.**

**ز-هاوڕێیەتیکردنی خەڵکی سوك وخەراپ و چونە شوێنی خەراپ.**

**ح-پێکەنینی زۆر و بەقاقا لەناو شوێنە گشتیەکاندا.**

**ط-رەقصکردن و چەپڵە لێدان لەنا وخەڵکدا.**

**ی-ماچکردنی ژنەکەی خۆی لەناوخەڵکدا.**

**ك-سەر تاشین یان چاککردنی بەشێوەیەکی سەیر و سەمەرە.**

**ل-مامەڵەی ناخۆش و ناڕێك لەگەڵ خەڵکدا وخەڵك تورە کردن.([3])**

**م- قرقێنە هاتنەوە لەناو خەڵکدا، ئەبو جوحەیفە گوتی: تریتی نان و گۆشتم خواردو هاتم بۆلای پێغەمبەرﷺ خەریك بوو قرقێنەم بێتەوە،پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

**{ قرقێنەکەت کورت بکەوە، چونکە برسیترین خەڵك لە دوارۆژدا ئەوانەن کە لەدونیادا تێرترینی خەڵك بوون}([4]).**

---

[1] رواه الترمذي وأبو داود والبيهقي وحسّنه الألباني في الترغيب(٢٩٤٤) وصحيح الجامع(٧١٣٦).

[2] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:١٥٠ .

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ /ل:١٥٢ -١٥٦ .

[4] رواه الترمذي وحسّنه، بروانه:ترتيب أحاديث الجامع الصغير،٢ /١٠٩ ، وقال: حديث حسن.

## سێهەم: ئاداب و خەصڵەتەکانی فیطرەتی ئینسانی:

ئیسلام ئایینی پاکی وجوانی وخاوێنیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ الله طيّبٌ يحبّ الطيّب، نظيفٌ يحبّ النظافة}(١)،واتە: خوا جل جلاله پاکە وشتی پاکی خۆشدەوێ، وەخوا خاوێنە و شتی خاوێنیشی خۆشدەوێ. وەپێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {الطهور شطر الإيمان}(٢)، واتە: پاك وخاوێنی نیوەی ئیمان وباوەڕە.بەم پێیە دەرکەوت کەئیسلام ئایینی پاکی وجوانی وخاوێنیە.وە لەبارەی خەصڵەتەکانی فیطرەت و خۆڕسکی ئینسانی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : {عشرٌ من الفطرة: قصّ الشارب، وإعفاء اللحية،والسواك،واستنشاق الماء، وقصّ الأظافر، وغسل البراجم، ونتف الإبط، وحلق العانة، وانتقاص الماء} يعني الاستنجاء، قال الراوي: ونسيت العاشر، الاّ أن تكون {المضمضة}. (٣).

واتە: خەصڵەتەکانی فیطرت و خۆرسکی مرۆڤ دەیە: بەرسمێڵکردن- ڕیش هێشتنەوە- دەم پاککردنەوە و سیواککردن-ئاو لەلوت وەردان- نینۆك کردن- شۆرینی بەینی پەنجەکان- بنهەنگڵ کردن- پاککردنەوەی دەوری عەورەت- خۆپاك کردنەوە لەسەر ئاودا- ئاو لەدەم وەردان.

وە لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {الفطرة خمسٌ: الاستحداد، والختان، و قصٌ الشارب و نتفال إبط و تقليم الأظافر}(٤) خەصڵەتەکان پێنجن چوار لەودەیانە و پێنجەمەکەیان خەتەنەکردنە، بۆیەهەندێ لەئادابەکانی ئەم دەخەصڵەتانە باس دەکەین بەم شێوەیە:

١-بەرسمێڵ کردن،سوننەتێکی زۆر خێرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {خالفوا المشركين وفّروا اللُحى، واحْفوا الشوارب}(٥).واتە: پێچەوانەی هاوبەشکاران بکەن، ڕیش مەتاشن بیهێڵنەوە، بەرسمێڵ بکەن،بەلاّم ئایا سمێڵ دروستە بتاشرێ؟ لیژنەی دائیمە وەلاّمی

---

[1] حسنه الألباني في تخريخ المشكاة (٤٤٨٧ ).

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه، وأبوداود وغيرهما.

[4] أخرجه البخاري ومسلم.

[5] حديث متفق عليه.

داوەتەوە:کە تاشینی سمێڵ لەپێغەمبەر ﷺو یارەکانیەوە ئیسپات نەبوە، تەنها بەرسمێڵکردن هەیە، وەك فەرمودەکە باسیکرد.([1]).

٢ –ڕیش هێشتنەوە، هەندێ لەزانایان دەلێن:ڕیش هێشتنەوە واجبە، بەڵام **قاضي عياض** دەڵێ: ڕیشتاشین و کردنی کەراهەتی هەیە وە گرتنی لەدرێژی و پانی چاکە ودروستە، وە ناوبانگ دەرکردن بەریش واتە: زۆر درێژکردنی خەراپە، وە بۆ ئافرەت ڕیش لابردن سوننەتە، وە ڕەنگ کردنی ریش بەسور و زەرد و بەخەنەو ووسمە سوننەتە، بەڵام بە ڕەنگی ڕەش نابێ، تەنها بەلای هەندێ لەزانایانەوە نەبێ وەك: ئیمام زوهری.([2]).

**{سودێك}** تووکی سەر ئەگەر پیاو بیهێڵێتەوە پێویستە خزمەتی بکات، بەشانەکردن و ڕۆن وزەیت لێدان، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **من كان له شعرٌ، فليكرمه** }([3]).
واتە: کەسێك توکی سەری هەیە بارێزی لێبگرێ، بەلام ئافرەت دروست نیە سەری بتاشێ، چونکە خۆ وەك پیاو لێکردنە.([4]).

٣–سیواککردن، لەباسی دەستنوێژدا باسکراوە، تەماشای بکە.

٤–ئاو لەلوت ودەم وەردان، ئاو لەدەم وەردان، واتە: دەم شۆرین و ئاوتێدا ڕادانی زۆر بە چاکی وە ئاو لەلوت وەردان، ئەوەیە ئاوەکە هەڵمژی بۆناو لوت ، پاشان بەهەناسەوە فڕێی بدەیەوە.

٥–نینۆك کردن سوننەتە ،دواکردنی شۆرینی ژێرەکەی هەر سوننەتە،لەپێشەوە نینۆکی دەستەکان، پاشان پێیەکان، ئەمجا لای ڕاست، پاشان لای چەپ بکرێ سوننەتە.
درێژ کردنی نینۆك دروست نیە بە هیچ شێوەیەك، دواکردنی سوننەتە نینۆکەکە دەفن بکرێت . ([5]).

٦–بن هەنگڵکردن، هەڵکەندنی توکەکەی سوننەتە، هەڵکەندنی لەتاشینی چاکترە، بن هەنگڵی لای ڕاست، پاشان لای چەپ دەکرێت.([6])

---

[1] موسوعة الآداب الإسلامية، ل:٢١٩،ومنهاج المسلم للجزائري، ل:١١١.
[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ /ل:١٦٩ –١٧٠.
[3] رواه أبوداود(٤١٣٣ ) والإمام أحمد (٢ / ٤ ،٣٩ ).وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود رقم: (٣٥٠٩ ).
[4] منهاج الصالحين ب٢ / ل:١٧٣ .
[5] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ /ل:١٦١.وفتاوى علماء البلد الحرام.
[6] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل:٢٢٢.

٧-لابردنی تووکی عەورەت، پیاوان وئافرەتان، دواوە وپێشەوە ، زانایان دەڵێن: بۆپیاو تاشینی باشترە، بەلام بۆئافرەت هەڵکەندنی تووکەکەی چاکترە لەبەر بەرژەوەندی خۆی و هاوسەرەکەی.[1].

٨-خەتەنە کردن سوننەتێکی گەورەیە وسوننەتێکی کۆنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : { اخْتَتَن إبراهيمُ خليلُ الرّحمن بعد ما أَتَتْ عليه ثمانون سنة}[2]. واتە: ئیبراهیمی خۆشەویستەکەی خوا لەدوا هەشتا ساڵ خەتەنەی کرد.

زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی خەتەنەکردنەوە، زانایانی شافیعی و حەنبەلیەکان پێیان وایە: خەتەنە کردن بۆ هەردو ڕەگەزەکە واجبە، وە حنفیەکان دەڵێن: بۆ هەردوکیان سوننەتە، وەئیمام أحمد پێی وایە بۆپیاو واجبە ، بۆئافرەتان هەر ڕێزە، بۆیە شەوکانی دەڵێ: هەق وراستی ئەوەیە کە بەڵگەیەکی صەحیح نیە لەسەر ئەوە کە واجب بێت، ویەقین ئەوەیە کەسوننەتە وەك فەرمودەکە ی{خمس من الفطرة}وە واجبیش ئەوەیە لەسەر یەقین بوەستین هەتا بەڵگە پەیدا دەبێ،وەشێخ مصطفى عدوى دەڵێ: بۆ خەتەنەی ئافرەتان بەڵگەیەکی دروست نیە کەواجب بێ لەسەریان ، ئەوەی دەیکا بۆی هەیە، ئەوەش نایکا هیچ گرفت نیە لەسەری.[3].

٩-شۆرینی نێوان پەنجەکان سوننەتێکی گەورەیە، هەروەها شۆرینی لوێچەکانی گوێچکە و ناو لوت وهەرشوێنێکی تری جەستە بەهەمان شێوە سوننەتە.[4].

١٠- خۆپاککردنەوە لەسەر ئاو، لەباسی تایبەتدا باسکراوە.

---

[1] شرح مسلم للنووي ج٢/ص ١٥٣ ، ومنهاج الصالحين في الآداب الإسلامية. ب٢ /ل:١٦٣.

[2] أخرجه البخاري ومسلم .

[3] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل:٢١٧.

[4] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب٢ /ل:١٦٥.

## چوارەم: ئادابەکانی خۆپاککردنەوە وخۆشۆرین:

ئاینی ئیسلام چۆن گرنگی بە دروستکردنی مرۆڤی مسوڵمان دەدات لەڕوی بیروباوەڕ و ڕەوشتی بەرزەوە بەهەمان شێوەش گرنگی بەدروست کردنی مرۆڤی مسوڵمان دەدات لەڕوی جەستەولاشە و پۆشاك و پاك و خاوێنیەوە، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴾ (التوبة: ١٠٨) واتە: لەو مزگەوتەدا – مزگەوتی قباء– کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە، پێیان خۆشە خۆیان پاك بکەنەوە، وەخوا جل جلاله پاکانی خۆشدەوێ.

هەروەها عائیشە–رضي الله عنها–گێڕایەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**تنظَّفُوا فإنَّ الإسلامَ نَظيفٌ**}[1] واتە: پاكو خاوێن بن، چونکە ئاینی ئیسلام پاكو خاوێنیە.

پاكو خاوێنی لەئیسلامدا دانراوە بەنیوەی بیروباوەڕ، ئەبو مالیکی ئەشعەری گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {**الطُّهُورُ شَطْرُ الإيمان**}[2] .

واتە: پاکی، خۆشۆرین،دەستنوێژ گرتن، نیوەی بیروباوەڕە.

### لە بەرئەوەی کە باسمان کرد پێویستە ئاگاداری ئەم ئادابانە بن و ئەنجامیان بدەن:

١–لەکاتی دانانی پۆشاکدا بۆ خۆشۆرین (بسم الله)بکە هەرچەندە لەشگران بیت ، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**سَتْرُ مابين أعْيُنِ الجِنّ وعورات بَنِي آدمَ أَنْ يَقُولَ الرجلُ المسلمُ إذا أراد أَنْ يَطْرحَ ثيابه: بسم الله الذي لا إله الاّ هو**}[3]واتە: پەردەی نێوان چاوی جنۆکە و نێوان عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە لەکاتی پۆشاك داناندا مسوڵمان بڵێ: **بسم الله الذي لا إله الاّ هو.**

---

[1] رواه ابن حبان عن عائشة مرفوعا، **بروانە**:المقاصد الحسنة في الأحاديث المشتهرة للسّخاوي.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه

٣رواه الترمذي(٦٠٦)، وأخرجه الطبراني في الأوسط (١/١٤٧ ،رقم ٤٦٥) وصححه الألباني في صحيح الجامع، رقم: ٣٦١٠.

٢-لەکاتی خۆشۆریندا عەورەتت داپۆشە، چونکە دەرکەوتنی عەورەت لەبەردەم خەڵکیدا لەشەریعەتی خوادا قەدەغەیە،هەر وەك چۆندەرکەوتنی عەورەتبەبێ پێویستی قەدەغەیە ، ئەمەش لەبەر شەرم کردن لەخوا و ڕێزگرتن لەفریشتەکانی سەرشانی مرۆڤ. وە عەورەتی پیاو بۆ پیاو نێوان ناوك و ئەژنۆیەتی وە ژنیش بۆ ژن بەهەمان شێوەیە.([1]).

بەڵام ڕانی مرۆڤ بەعەورەت دانراوە، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**الفخذ عورةٌ**}([2]) واتە: ئەژنۆی مرۆڤ عەورەتە، نابێ تەماشای بکرێت. وەبەهزی کوری حەکیم لەباوکی لەباپیریەوە دەڵێ:(گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەورەتی ئێمە کامەیان حەلاڵە و کامەیان حەرامە؟ ئەویش فەرموی: {عەورەتت بپارێزە تەنها لەهاوسەرەکەت نەبێ}، گوتم: ئەی ئەگەر خەڵکەکە لە ناویەکدا بن؟ ئەویش فەرموی :{ئەگەر دەتوانی باکەس عەورەتت نەبینێ}، گوتم: ئەی ئەگەر ئینسان بەتەنها بێت؟ فەرمووی: {ئەگەربەتەنهاش بێت باکەس عەورەتی نەبینێ و چونکە خوای پەروەردگار زیاتر شایەنترە بەوە کە شەرمی لێ بکرێت}([3]).

٣-بەبێ لەبەرکردنی پەشتەماڵ نابێ بچیە ناو حەمامەوە،عائیشە -**رضي الله عنها**- گێڕایەوە گوتی: {**نَهى رسولُ الله ﷺ عن دخول الحمّامات، ثم رخّص للرّجال أنْ يَدْخُلوها في المآزر**}([4]) واتە: پێغەمبەر ﷺ خەڵکی لەچونی حەمامەکان قەدەغە کرد، بەڵام پاشان بۆ پیاوان ڕێگەیدا کە پەشتەماڵ لەبەر بکەن ئەمجا بچن.

پێشەوامان عمر-**رضي الله عنه**-دەیگوت:بەبێ پەشتەماڵ چون بۆ ناو حەمام حەرامەو قەدەغەیە. پەشتەماڵ واتە:ئەوەی عەورەت دادەپۆشێ.([5]).

٤-نابێ ئافرەتان بچنە حەمامە گشتیەکانەوە تەنها مەگەر تایبەت بێ بەئافرەتانەوە، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**ما مِنْ امرأةٍ تخلع ثيابَها في غَيْر بيتها، إلاّ هتكتْ مابينها وبينَ الله**

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة، ب٢ /ل:١٣.

[2] أخرجه الترمذي (٢٧٩٦ ) وحسنه و أحمد في مسنده، رقم:١٤٢٤١ باسناد صحيح.

[3] أخرجه البخاري ٤٥٨/١ في الغسل. باب من اغتسل عرياناً وحده في الخلوة، و من تستر فالستر أفضل معلقاً بصيغة الجزم. وأخرجه أحمد ٣/٥، ٤.

[4] الآداب للبيهقي،٢٧٣/٢.

[5] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٤٠.

تعالى} .([1]). واته:هەر ئافرەتێك جگە لە ماڵی خۆیان پۆشاکەکانی دابنێ ئەوە خوا جل جلاله ئابڕوی دەبات.

٥-چاوت لەتەماشاکردنی عەورەتی خۆت و عەورەتی خەڵکی بنوقێنە و تەماشایان مەکە، خوای پەروەردگار لەقورئاندا فەرمویەتی:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ (النور:٣٠) واته: ئەی محمد ﷺ بەبڕواداران بڵێ: چاویان لەنامەحرم بگرنوشەرەفو عەورەتی خۆیان بپارێزن، ئەوە بۆ ئەوان چاکتر وپاکترە.

ئیمامی عەلی-رضي الله عنه- گوتویەتی: خوای پەروەردگار لەعنەت و نەفرینی لە تەماشاکەر و تەماشاکراو کردوە.

٦-هەوڵ بدە لەشوێنی چۆڵ خۆت بشۆ، ومەهێڵە خەڵك تەماشات بکات یان بەڕوتی خەڵك بتشۆرێت، تەنها دایكو باوك نەبێت بۆ بچکۆلەکانیان دروستە، یەعلی کوڕی ئومییە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ کابرایەکی دیت بەبێ پەشتەماڵو بەڕوتی خۆی دەشۆری، پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەرو سوپاسی خودای کردو پاشان فەرموی :{إِنَّ اللهَ حييٌّ سِتّيرٌ يُحبُّ الحياء والسِتْرَ، فإذا اغتسَلَ أحدُكُم فليستَتِرْ}([2]) واته: خوای پەروەردگار زیندوە و داپۆشەرە، شەرم و داپۆشینی خۆشدەوێت، جا کاتێك ئێوە خۆتان شۆری باخۆتان داپۆشن. وە عمری کوڕی خەتتاب-رحمه الله- لەشوێنی چۆڵ خۆی دەشۆری و نەیدەهێشت کەس تەماشای بکات.

٧-لەناو حەمامدا و لەکاتی خۆشۆریندا قسە لەگەڵ خەڵکدا مەکەو سەلامکردن یان وەڵامی سەلام مەدەوە و قورئان مەخوێنە.

٨-لەکاتی ناوحەمامدا نان و ئاوی سارد مەخۆ، هەروەها لەدوانان خوردنەوە خێرا مەچۆە ناو حەمامەوە، چونکە زەرەری بۆ هەزمکردنی خواردنەکەت هەیە.

٩-لەناو حەمامدا و لەکاتی خۆ ڕوتکردنەوەدا هەر بیر لەمردنو دوارۆژ بکەوە و خۆت بەخوا بپارێزە لەئاگری دۆزەخ.([3]).

---

[1] صحيح سنن أبي داود للألباني(٤٠١٠)ورواه الترمذي وحسه، رقم:٢٨٠٣.

[2] رواه أحمد في مسنده،وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود، رقم:٤٠١١.

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٤١.

١٠-لەبەر زۆر ناچاری نەبێت بۆ حەمامە گشتیەکان مەچۆ چونکە خەڵك تەماشات دەکات و تۆش تەماشای خەڵك دەکەیت.

١١-لەکاتی خۆشۆریندا ئاو سەرف مەکە، چونکە ئیسراف کردن شتێکی حەرامە و خەراپە هەرچەندە لەسەر روبارێکیش بیت.وەك باسمان کرد.

١٢-کاتێك کە خۆت دەشۆری ئاو بەهەموو جەستەتدا بکەو ئاوەکە بگەیەنە بەهەموو پێچ و شوێنی مووەکان، عائیشە-رضي الله عنها- گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە خۆی لە لەشگرانی -جنابة- دەشۆری دەستی پێ دەکرد وهەردوو دەستەکانی دەشۆری ، پاشان بەدەستی راستی ئاوی دەکرد بەدەستی چەپیدا و تارەتی هەڵدەگرت و پەنجەکانی دەبردە ناو مووەکانیەوە، هەتا کاتێك کەدەیبینی موو پێستەکەی تەڕبووە سێ لوێچی ئاو دەکرد بەسەر سەریدا، پاشان ئاوی دەکرد بەهەمو لاشەو جەستەیدا، پاشان قاچەکانی دەشۆری.([1]).

١٣-کاتێك تۆ لەشگرانیت -جنابة- هەیە نابێ ئەم پێنج کارەبکەیت:

ا-/نابێ هیچ نوێژێك بکەیت.     ب-/نابێ قورئان بخوێنی.

ج-/نابێ دەست لەقورئان بدەی، یان هەڵی بگری، مەگەر ناچاربیت.

د-/نابێ طەوافیماڵی خوا بکەیت.

هـ-/لەبەر عوزر نەبێ نابێ لەمزگەوتدا بمێنیەوە.

وە کاتێکیش تۆ دەستنوێژت نەبێ نابێ ئەم سێ کارە بکەیت:

ا-)نابێ نوێژ بکەیت.

ب-)نابێ طەوافی ماڵی خوا بکەیت.

ج-)نابێ دەست لەقورئان بدەی یان قورئان هەڵبگری، مەگەر لەبەر کاری ناچاری بێت ئەو کاتە دروستە.([2]).

١٤-هەر کاتێك لەشگرانیت بەسەرداهات خێرا پەلە بکە و ئەو لەشگرانیە لەسەرخۆت لابە و خۆت بشۆرە، چونکە با بەلەشگرانیەوە وەفات نەکەیت.([3]).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم .

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٤٢.

[3] بۆ ئەم بابە تە تە ماشای (الآداب الإسلامية للناشئة)بکە، ب٢ /ل:١٩.

## پێنجەم: ئادابەکانی مزگەوت:

لەسەر زەویدا پاکترین جێگە تەنها هەرمزگەوتە، چونکە مزگەوت ماڵی خوای بەڕێزەو شوێنی خواپەرستیە، هەر کەسێك خوای خۆشبوێ، ئەوە ماڵەکەشی خۆشدەوێ و ڕێزی لێ دەگرێ وبەچاوی ڕێز وحورمەتەوە تەماشای دەکات، بۆیە خۆشویستنی مزگەوت و هاموشۆکردنی بۆ خواپەرستی نیشانەی ئیمان و باوەڕی ئەو کەسەیە، ئەبو سعیدی خدری گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إذا رأيْتُمُ الرجلَ يَعْتادُ المساجدَ فاشْهَدُوا له بالإيمان، قال الله تعالى: ﴿إنّما يعمُرُ مساجدَ الله مَنْ آمَنَ بالله واليوم الآخر...} ([1]) واتە: هەر کاتێك کەسێکتان دیت هاموشۆی مزگەوتی دەکرد، ئەوە ئێوە شایەتی ئیمان وبڕوای بۆ بدەن، چونکە خوا جل جلالە فەرمویەتی: تەنها ئەو کەسەی کە بڕوای بەخوداو بەرۆژی دوایی هەیە مزگەوتەکان ئاوەدان دەکاتەوە.

ئەو کەسەی دڵی بەمزگەوتەوە بەندە ئەوە لەرۆژی لێ قەوماندا حەساوەیە ولەژێر سێبەری عەرشەکەی خوادایە، ئەبو هریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {سبعةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ في ظِلِّه يوم لا ظِلَّ إلاَّ ظِلُّهُ.....ورجلٌ قلبُهُ معلّقٌ في المساجد} ([2]) واتە: حەوت کەس لەژێر سێبەری خوای پەروەردگارن لەرۆژێکدا کە تەنها سێبەری خوا هەیە، پێغەمبەر ﷺ هەمویانی ژمارد هەتا گەیشتە حەوتەم و فەرموی: ئەوە پیاوێکە دڵی بە مزگەوتەکانەوە بەندە و نوێژەکانی هەر لەمزگەوتدا دەکات.

**ئەمەش چەند ئادابێکی چونە ناو مزگەوتەپێویستە ئێمە ڕەچاویان بکەین و جێبەجێیان بکەین:**

١)لەکاتی رۆیشتندا بۆ مزگەوت ئەم دوعایەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنە: {**اللهم اجْعَلْفي قلبي نوراً،واجعل في لساني نوراً،واجعل في سمعي نُوراً،وفي بصري نُوراً، وعن أمامي نوراً وعن يميني نُوراً، وعن يساري نُوراً، و من تحتي نوراً، ومن خلفي نُوراً، اللهمّ و أعظِمْ لي نُوراً**} ([3]).

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه رقم:٢٦١٧، وقال: حديث حسن.

[2] حديث متفق عليه.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

٢)لەکاتی چونە ژوورەوەت بۆ مزگەوت قاچی راستت پێش بخەو بڵێ: **بسم الله، اللهم صلّ علی محمد، اللهم افتحْ لی أبواب رحمتك.**

٣)لەکاتی هاتنەدەرەوەت لەمزگەوتدا قاچی چەپت پێش بخەو بڵێ: **بسم الله، اللهمّ صلّ علی محمد، اللهمّإنّی أسألك منْ فضلك**،چونکە لەم بارەوە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە.([1]).

٤)خۆشویستنی مزگەوت و رێز حورمەت لێ گرتنی و تەماشاکردنی بەچاوی رێزو حورمەتەوە چونکە مزگەوتماڵی خوایە دروست کراوە بۆ خواپەرستی و زیکرو یادی خواو قورئان خوێندن و بلاْوکردنەوەی پەیامەکەی خوا تێیدا، وناسینی شوێنکەوتوانی خوا لەمزگەوتدا.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾(الحج: ٣٢) واتە: هەر کەسێك دروشمە بەرزەکانی خوا بەگەورە بزانێ، ئەوە نیشانەی پارێزکاری دڵەکانە.

هەر لەم بارەوە ئەبو دەردارء گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**المساجد بیوت المتقین، فمَنْ کانت المساجدُ بُیوتُهُ ضَمَنَ اللهُ له بالرّوْح والرحمة والجواز علی الصّراط إلی الجنّة**}([2])

واتە: مزگەوت خانوی پارێزکارانە، خوای پەروەردگاریش بەبەزەیی خۆی و بەپەڕینەوە لەپردی سیراط بۆ لای رەزامەندی خۆی و بۆ بەهەشتێ کەفیلایەتی دەکات بۆ ئەو کەسەی کە مزگەوتی کردبێت بەماڵی خۆیی و ئەرکەکانی بەندایەتی تێدا بەجێ بهێنێ.

٥)کاتێك کە دەچیتە ناو مزگەوتەوە سوننەتە نیەت بهێنیو بڵێی: ئەی خوایە نیەتم وایە هەتا لەم مزگەوتەدابم ئیعتیکاف بکەم بۆ تۆ.([3]).

٦)هەتا بۆت دەکرێ ئیش بۆ دروستکردنی مزگەوت بکەوهەوڵیبۆ بدە وخەڵکیش هەڵبنێ بۆ دروستکردنی لەبەر رەزامەندی خوا، ئیبن عباس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ بَنی لله مسجداً ولو کمفْحَص قطاة لبیضها بنَیَ اللهُ له بیتاً في الجنّة**}([4])

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] رواه ابن حبان وصححه والحاكم وصححه،وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود، وصحيح الجامع رقم:٣٠٤٨.

[3] آداب المسلم،٣٤.

[4] رواه احمد وابن حبان **بروانه**: المسند الجامع رقم:٨٥٦٥،والحديث صحيح.

واتە: کەسێك بۆخوا مزگەوتێك دروست بکات هەرچەندە وەکو هێلانەی قەتیە وابێ، ئەوە خوا جل جلالە لەبەهەشتدا خانویەك بۆ ئەو کەسە دروست دەکات.

٧)مزگەوت هەرچەندە دووربێت لەماڵەکەتەوە هەوڵبدە هەر لەمزگەوتدا نوێژبکەیت هەرچەندە سەرماو گەرما و تاریکەشەو بێت، ئەبو موسا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ أعظمَ الناس أجْراً في الصلاة أبْعَدُهُم إليها مَمْشيً فأبعدُهُم}([1]) واتە: گەورەترین کەس لەپاداشتی نوێژدا پاداشتی ئەو کەسەیە کە لەمزگەوتەوە دورتر بێت و هەر بۆمزگەوت بیت.

هەر لەم بارەوە ئەبو بورەیدە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {بشّرالمشّائين في الظُلَم إلى المساجد بالنور التامّ يوم القيامة}([2]) واتە: ئەو کەسانەی کە بەشەوانی تاریك دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان موژدەی ڕوناکی تەواویان پێ بدەن لەڕۆژی دواییدا.

٨)بابەتارەت ودەستنوێژی جوان وسیواك کردن وپۆشاکی پاك و نینۆك کردن ومو بەشانەکردن وبۆنی خۆشەوە ئامادەی مزگەوت ببیت، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ...... ﴾ (الأعراف: ٣١) واتە: ئەی نەوەکانی ئادەمیزاد لەکاتی چونتان بۆ هەموو مزگەوتێك پۆشاك وجوانی خۆتان وەربگرن و خۆتان پاك وخاوێن ڕابگرن و خۆتان بۆنخۆش بکەن.

ئەبو هریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ تطَهَّر في بيته ثم مَضَى إلى بيتٍ مِنْ بُيوت الله ليقضي فريضةً من فرائض الله، كانت خُطْوتاه إحداهما تحطّ خطيئةً و الأخرى ترفَعُ درجةً}([3]) واتە: هەر کەسێك لەماڵەکەی خۆیدا خۆی پاك بکاتەوە، پاشان بۆ یەکێك لەماڵەکانی خوا بڕوا بۆ ئەوە فەرزێك لەفەرزەکانی خوا جێبەجێ بکات، ئەوە بەهەنگاوێکی، تاوانێکی لادەچێ وبەهەنگاوەکەی تریش پلەو پایەیەکی بەرز دەبێتەوە.

٩)هەر کاتێك گوێت لەبانگ بوو و بانگدرا یەکسەر واز لەهەموو کارو کردەوەکانی دونیاییت بهێنە و خێرا وەڵامی بانگەکە بدەوە و بەهێواشیەوە بڕۆ بۆ مزگەوت، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] أخرجه ابو داود والترمذي وقال:صحيحٌ مُسْنَدٌ ومَوْقُوفٌ إلى أصحاب النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

يُحۡيِيكُمۡ ... ﴾ (الانفال: ٢٤) . واتە: ئەی بڕواداران ئێوە وەڵامی خواو پێغەمبەرەکەی بدەنەوە کاتێ بانگی ئێوە دەکەن بۆ ئەو کاروکردەوانەی کە ئێوە لەدونیا ولەدوارۆژدا بەختەوەر و سەرفیراز دەکەن. وەئەبوهریرە گێڕاویەوە گوتی: کابرایەکی کوێر هاتە لای پێغەمبەر وگوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکم نیە دەستم راکێشێ بۆ مزگەوت، ئایا دەتوانم بۆ مزگەوت نەچم؟ پێغەمبەریش ﷺ رێگەی دا وفەرمووی: مەچۆ،کاتێك ئەم پیاوە رۆیشت، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردەوە و فەرمووی: گوێت لەبانگی نوێژ دەبێت؟ کابرا کوێرەکەش گوتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ دوابکەوی لەمزگەوت.([1]).

١٠)کاتێك کە چویە مزگەوتەوە دامەنیشە دورکات نوێژی سەلامکردن لەمزگەوت (تحية المسجد) بکە، ئەگەر کاتی نوێژی سوننەتی راتیبە نەبوو، ئەبو قتادە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا دَخَل أحدُكُم المسجدَ فلا يجْلِسْ حتى يُصلِّي ركعتين**}([2]) واتە: کاتێك کە چویە ناو مزگەوتەوە هەتا دوو ڕکات نوێژ نەکەی دامەنیشە.

١١)کاتێك کە دەتەوێ نوێژ لەمزگەوتدا بکەیت سیرو پیازو شێوەی ئەمانە مەخۆ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ أكَل ثُوماً او بَصَلاً فلْيَعْتزِلْنا أو فليعتزِلْ مسجدنا**}([3]) واتە: هەر کەسێك سیرو پیازی خوارد باخۆی کەنارەگیر بکات لەمزگەوتەکانمان.

١٢)پێش ئەوەی بچیە سەر فەرشەکانی مزگەوت بزانە باگۆرەویەکانت بۆگەنیان لێ نەیات، ئەگەر بۆگەنیان لێ هات لەدەرەوە فرێیان بدە.

١٣)پێویستە مزگەوت بپارێزی لەپیسی و لەخوێن، هەروەك چۆن میزکردن لەمزگەوتدا حەرامە، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: ئەو پیاوە دەشتەکیەی کە لەناومزگەوتەکەی مەدینەدا میزی کرد پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: {**إنّ هذه المساجد لاتصلُحُ لشيءٍ من هذا البول و القذر، انّما هي لذكْرالله تعالى وقراءةِ القرآن**}([4]) .

واتە: ئەم مزگەوتانە بۆ میز تێداکردن و پیس کردنیان نیە، ئەم مزگەوتانە تەنها بۆ زیکر ویادی خوایە و بۆ قورئان خوێندنە تێیدا.

---

١أخرجه مسلم في صحيحه.

٢حديث متفق عليه.

٣حديث متفق عليه.

٤أخرجه مسلم في صحيحه.

١٤)نابێ مزگەوت تف و چڵم و شێوەی ئەمانەی تێدابکرێت، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {البُصَاق في المسجد خطيئةٌ، وكفَارتها دَفْنُها}([1]) واتە: تف کردن لەمزگەوتدا تاوانە: کەفارەتی ئەو تاوانەش ئەوەیە کە تفەکە بکەیە خۆڵی مزگەوتەوە، برای عەزیزم ئەمە بۆ ئەوکاتەبووە کە ناو مزگەوتی مەدینە هەر خۆڵ و گڵ بووە، بۆیە ئێستا پێویستە تف بسردرێتەوە، چونکە مزگەوتی ئێستا بەزۆری هەر کاشی و چیمەنتۆیە.

١٥-نابێ لەمزگەوتدا یاری بکەیت و غەڵبەغەڵب و هەراهەرا و شەڕە قسەبکەیت ونابێ دەنگت بەرزبکەیەوە با قورئان خوێندنیش بێ بەشێوەیەکی وا کەسەر لەنوێژ خوێنەکان و زیکر خوێنەکان‌و دەرس خوێنەکان تێك بدرێ، لەمزگەوتی مەدینەدا دو نەفەری خەڵکی طائیف دەنگیان بەرزکردەوە، عمری کوڕی خەتتاب پێی گوتن: ئەگەر ئێوە خەڵکی شاری مەدینە بونایە ئەزیەتم دەدان، چونکە ئێوە لەمزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ دەنگ بەرزدەکەنەوە.([2]).

هەروەها ئەبو سعیدی خُدری گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتی مەدینەدا ئیعتیکافی دەکرد، گوێی لێ بوو یارەکان بەدەنگی بەرزەوە قورئانیان دەخوێندەوە، پێغەمبەریش پەردەکەی لادا وفەرموی: {ألَا كلُّكُم مناجٍ ربّه فلا يُؤذِينَّ بعضُكُم بعضاً، و لا يرفَعْ بعضُكُم على بعضٍ في القراءة، أوفي الصلاة} ([3]) واتە: خۆ ئێوە هەموتان لەخوا دەپارێنەوە دەئەزیەتی یەکتری مەکەن، و هەندێکتان با دەنگی بەرز نەکاتەوە بەسەر هەندێکتاندالەقورئان خوێندندا ولەنوێژکردندا.

١٦)لەمزگەوتدا خۆت بەکێشەو کارەکانی دونیاوە خەریك مەکە، کڕین و فرۆشتن و باسی گومبو مەکە، ئەو هۆنراوانەش کە جنێوو باسی دڵداری و ستەمیان تێدا هەیە لە مزگەوتدا مەیانڵێ، جگە لەمانە قەیدێ ناکا، لەم بارەوە عبداللە ی کوڕی عمر – ڕەزای خوایان لێ بێت – دەڵێ: {نَهَى رَسُولُ الله ﷺ عن البيع والشراء في المسجد، وأَنْ تُنْشَدَ

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

[3] روضة المحدثين،١١ /٢١١،وقالالحافظفي " النتائج " ٢ / ١٤ : صححه ابن خزيمة والحاكم من طريق عبدالرزاق بهذا و رجاله رجال الصحيحين .

**فيه الأشعار، وأنْ تُنْشَدَ فيه الضالّة**}([1]) واتە: پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتدا کڕین و فرۆشتنی قەدەغە کردووە،وەهۆنراوە خوێندنەوەو بانگڕاهێشتنی گومبوشی لەمزگەوتدا قەدەغە کردوە.

١٧) لەدوا بانگدانەوە لەمزگەوت دەرمەچۆ مەگەر عوزرو بەهانەیەکی ناچاریت هەبێ، لەم بارەوە ئەبو شەعسا گوتی: ئێمە لەناو مزگەوتی مەدینەدا لەلای ئەبوهریرە دانیشتبوین، بانگی دا لەو کاتەدا کابرایەك هەستاو لەمزگەوتەکە ڕۆیشتە دەرەوە ئەبوهریرەش تەماشای دەکرد کە چۆ دەرەوە، گوتی: ئاگاداربن ئەم پیاوە لەمزگەوتدا ڕۆیشتە دەرەوە ئەوە گوناهو تاوانی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ.([2]).

١٨)لەمزگەوتدا دامەنیشە و دەست بکەی بەغەیبەت و درۆو بوهتان و باسی خەراپەی خەڵك، چونکە مزگەوت بۆ ئەم کارانە نیە.

١٩)هەتا بۆت دەکرێت مزگەوت بپارێزە، باپاك وخاوێن بێت، هەروەها کەل و پەل و قورئانەکان و کتێبەکانی مزگەوت بپارێزە، لەم بارەوە عائیشە گێڕایەوە گوتی:

( **أَمَرَ رسولُ الله ﷺ ببناء المساجد في الدُور، وأَنْ تُنظّف وتُطيّب**) ([3]) واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد لەناو ماڵەکاندا مزگەوتەکان دروست بکرێن و بەپاك و خاوێنی رابگیرێن.

٢٠)منداڵی زۆر بچوك وشێت نابێ بێنە مزگەوتەوە، بەڵام منداڵی حەوت ساڵانە پێویستە بهێندرێن بۆ مزگەوت و فێری ئادابەکانی مزگەوت بکرێن وە لەناو مزگەوتیشدا ئاگاداری بکرێن، نەوەك هەرا هەراو بێعاری و کاری نابەجێی تێدا ئەنجام بدەن.([4]).

٢١)ئەو ژنانەی کە دێن بۆ مزگەوتەکان با لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ نەبن، و خۆیان نەرازێننەوە بەبۆنی خۆش لەخۆدان وبەخۆ روتکردنەوە، زینبەی ثقفیە گێڕایەوە گوتی:

---

[1] روضة المحدثين، ١١ /٧٩ ،ونتائج الأفكار ١/٣٠١ )وقال :حديث حسن.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه،**بڕوانە**:منهاج الصالحين،ب١/ل:١٦١.

[3] أخرجه أحمد وأبوداود، **بڕوانە**: روضة المحدثين،١ /١٢٠، وقال في فتح الباري ١/٣٤٢ ) :حديث صحيح.

[4] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:٣٥ .

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەئێمە کردوفەرموی:{إذا شَهِدَتْ إحداكنّ المسجد فلا تَمَسّ طِيباً}([1]) واتە: هەرکاتێك ئێوە – ئەی ژنان – هاتن بۆ مزگەوت بۆنی خۆش لەخۆتان مەدەن. چونکە سەرنجی خەلکی ڕادەکێشێ.([2]).

## شەشەم: ئادابەکانی نوێژی بەکۆمەڵ ( صلاة الجماعة ):

مرۆڤ بەسروشتی خۆی کۆمەڵایەتیە، ئەو کۆمەڵەی خۆشدەوێ کە ڕێکە لەگەڵیدا و پرسیار لەکاروبارەکانی دەکات، هەموو مرۆڤێك لەژیانیدا پێویستی بەکۆمەڵێك هەیە کە لەگەڵیدا بژیا، جا ئەو کۆمەڵەی کە فەرمان بەچاکەی پێدەکات و یارمەتی لەسەر پارێزکاری (تقوی) دەدات، ئەگەر ئەو کۆمەڵەی دەست نەکەوت، ئەوە کۆمەڵێکی تر دەیقۆزێتەوە کە فەرمانی خەراپەی پێدەکات و خەراپەو گوناهو تاوانی بۆ دەرازێنێتەوە و تووشی ئاگری دۆزەخی دەکات، وەك خوای پەروەردگار بەئێمەی ڕاگەیاندوە کە تاوانباران بەرەو دۆزەخ بەڕێدەکرێن،هەرلەبەرئەوەیەکە خوای پەروەردگارفەرمانی بەئێمە کردوە ئێمە لەگەڵ کۆمەڵی بڕوادارو ڕاستگۆیاندا بین و فەرمویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ (التوبة: ١١٩) واتە: ئەی بڕواداران ئێوە لەخوا بترسن و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن.

ئاینی ئیسلام ئاینی کۆمەڵ وکۆمەڵگایە، فەرمان بەکۆمەڵ دەکات و پەرتەوازەیی قەدەغە دەکات، ئیسلام کاتێك کە هات عەرەبەکان پەرتەوازەبون هەموویانی کۆکردەوە، پێغەمبەر ﷺ هەتا لەشاری (مەککە)دا بوو نوێژی بەکۆمەڵی ئەنجام نەدا، بەڵام کە هاتە شاری (مەدینە) دەستی کرد بەنوێژی بەکۆمەڵ(جماعت)هەر کەسێك پابەندی نوێژی بەکۆمەڵ نەبوایە نیشانەی دوڕوویی تێدا لەسەردروست دەبو، بۆیە بەڕاستی نوێژی بەکۆمەڵ زۆر زەروریە، حیکمەت و نهێنی زۆری تێدا هەیە.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] بروانة: الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢/ل: ٣٠-٣٥، وآداب المسلم ل: ٣٤-٣٥.وآداب المساجد، للغامدي. و منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية.

**لەبەرئەوە نوێژی بەکۆمەڵ کۆمەڵێك ئادابی هەیە پێویستە ڕەچاو بکرێن و ئەنجام بدرێن:**

١/پارێزگاریی لەسەر نوێژی بەکۆمەڵ بکە، لەماڵەوە بەدەستنوێژگرتن خۆتی بۆ ئامادەبکە،ئەبو هریرە گێراویەوە:پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**صلاة الرجل في جماعةٍ تضعُفُ على صلاته في بيته وفي سُوقه خمساً وعشرين ضعفاً**}واتە:نوێژکردنی بەکۆمەڵ ولەمزگەوتدا،بیست وپێنج جاردوچەندانە خێری زیاترە،ئەوەش لەبەرئەوەیە،چونکە کاتێك دەستنوێژێکی جوان هەڵدەگری، وتەنها لەبەر نوێژەکەشی بڕۆی بۆ مزگەوت،هەرهەنگاوێك پلەیەکت بۆ بەهەشت بەرزدەبێتەوە،وتاوانێکت لێ ڕەش دەبێتەوە،کاتێك کە نوێژ دەکەیت، بەردەوام فریشتەکان هەتا لەو شوێنەدابێت داوای ڕەحمەتت بۆ دەکەن،ودەڵێن: ئەی خوایە سەلاواتی خۆتی بۆ سەر بڕژێنە، ئەی خوایە بەزەیی خۆتی پێ بکە،مادام دەستنوێژەکەت بمێنێ و شتێك نەکەیت، ئێوە هەتا چاوەڕێی نوێژ کردنبن، ئەوە ئەو کاتەتان هەر بەنوێژکردن بۆ حیسابە.([1]).

٢/کاتێك گوێت لەبانگ بوو خێرا پەلە بکە و تەمبەڵی مەکە،وخۆت بەشتی ترەوە خەریك مەکە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ سوێندی خواردو فەرموی:{**لقد هَمَمْتُ أنْآمُرَ بحَطَبٍ فيُحْتطب ثمَّآمُر بالصلاة فيؤذن لها، ثمَّآمُر رجلاً فيؤمَّ الناس، ثمَّ أُخالِفُ الى رجالٍ، فأُحرِّق عليهم**}([2]) واتە: نیازم کرد کۆمەڵە چیلکەدارێك بێت، پاشان فەرمان بەکەسێك بکەم نوێژ بۆ خەڵك بکات، ئەمجا بۆ خۆم بڕۆم بۆلای ئەو کۆمەڵە پیاوەی کە نایەن بۆ نوێژکەیان کۆمەڵە چیلکەدارەکەیان بەسەردا بسوتێنم.

٣/هەوڵ بدە وسوربە لەسەرئەوە کە نوێژی عیشا و بەیانی لەمزگەوتدا و بەکۆمەڵ بیکەیت، عثمانی کوڕی عفان گێراویەوە گوتی: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: {**مَنْ صلّى العشاء في جماعةٍ فكأنّما قام نصف الليل،ومَنْ صلّى الصُبح في جماعةٍ فكأنّما صلّى الليل كلّه**}([3]) واتە: هەر کەسێك نوێژی عیشا بەجەماعەت بکات ئەوە وەکو ئەوە

---

[1] حديث متفق عليه.

٢حديث متفق عليه.

٣أخرجه مسلم في صحيحه.

وایه کەوا نیوەی شەوەکەی شەونوێژی کردبێت، وە هەر کەسێك نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکات، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە شەوێکی تەواو شەو نوێژی کردبێت.

٤/کاتێك کە گوێت لەبانگ بوو وەڵامی بانگدەر بدەوە وواز لەزیکرو قورئان خوێندن بهێنە،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: ((إذَ اسَمِعْتُمْ الْمُؤَذّنَ فَقُولُوا: مِثْلَمَا يَقُولُ)) ([1]) واتە: هەر کەسێك گوێی لەبانگەوە بوو بانگدەر چی دەگوت ئێوەش ئەوە بڵێنەوە.

٥/کە چویە ناو مزگەوتەوە یەکەمجار دورکات نوێژبکە وەك سەلامکردن لەمزگەوت، پاشان سەلام لەخەڵکەکە بکە، هەروەها لە دوانوێژ کردنەکەوە لەو کەسانەش بپرسە کە نەهاتوون بۆ نوێژ کردن.([2]).

٦/زوو بڕۆ بۆ مزگەوت بۆئەوە بچیە ریزی یەکەمی نوێژەوە، چونکە ئەبوهریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{لو يَعْلَمُ الناسُ مافي النداء والصفّ الأوّل ثمّلم يَجِدُوا إلاّ أنْ يَسْتهمُوا عليه (لاَسْتهمُوا}([3]) واتە: ئەگەر خەڵکی ئەو خێرە گەورەیەی کەوا لەبانگدان و لەریزی یەکەمدا هەیە بیانزانیایە، پاشان بەتیروپشکیٚ نەبوایە دەستیان نەکەوتایە ئەوە خەڵکی تیرو پشکیان بۆ دەکرد.

٧/لەناو نوێژدا لەناو ریزی نوێژ خوێنانەوە هاتوچۆ مەکە و لەبەردەم نوێژخوێنانەوە مەڕۆ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{لو يَعْلَمُ المارُّ بين يَدَيِ المصلّى ماذا عليه -من الإثم- لكان أنْ يقفَ أربعين خيراً له مِنْأَنْ يَمُرّ بين يَدَيْه}([4]) واتە: ئەگەر ئەو کەسەی کە لەبەردەم نوێژ خوێنەوە دەروا بیزانیایە چەند گوناهە ئەوە چل بوەستایە بۆی باشتر بوو لەوەی کە لەبەردەم نوێژ خوێنەوە بڕۆیشتایە ڕاوی دەڵیٚ: نەمزانی چل رۆژە ، یان چل مانگە ، یان چل ساڵە

٨/ لەنوێژدا پێویستە ئیمام چی کرد تۆش ئەوە بکەیت، و پێشکەوتن لێی حەرامە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {إنّما جُعِل الإمامُ لِيُؤْتَمّ به فلا تختلفوا عليه، فإذا كبّر فكبّروا، واذا رَكَع فارْكَعوا، وإذا قال: سمع الله لمن حمده فقولوا:

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:١٥٧ .

[3] حديث متفق عليه.

[4] حديث متفق عليه.

**اللهم ربنا لك الحمد، واذا سجد فاسجدوا..}**([1]) واتە: ئیمام تەنها بۆئەوەیە نوێژی لە دواوە بکرێت، نابێ ئێوە لێی جیاوازبن، ئەگەر (الله اکبر)ی کرد ئێوەش (الله اکبر) بکەن، ئەگەر کورنوشی برد ئێوەش کورنوش بەرن، ئەگەر گوتی: سمع الله لمن حمده ئێوە بڵێن: اللهم ربنا لك الحمد، ئەگەر سوجدەی برد ئێوەش سوجدە ببەن.([2]).

٩/لە نوێژی بەکۆمەڵدا هەوڵ بدەن ریزەکان زۆر رێك و پێك بن، شان بەشانو قاچ بەقاچ بەیەکەوە بلکێن و نابێ نێوانیان بۆشایی تێدا هەبێت، سوننەتە ئیمام فەرمان بەمە بکات چونکە ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی نوێژ دابەستێ روی تێ دەکردین و دەیفەرموو:{**تراصُّو و اعتدلوُا**}([3])واتە: خۆتان بەیەکەوە بلکێنن و رێك بوەستن.([4]).

١٠/هەوڵبدە بەسەر خەڵکدا هەنگاو مەهاوە بۆئەوە بگەیە ریزەکانی یەکەم بەڵکو لەکوێ جێگەت هەبوو لەوێ نوێژ بکە.

١١/بەتەنها دور لەریزەکانی نوێژ مەوەستە، بەڵکو ئەگەر لەریزەکەدا جێگەت دەبۆوە بچۆ ئەو ریزەوە وە ئەگەر جێگەت نەبۆوە ئەوە کەسێك لەریزەکەدا رابکێشە بۆلای خۆت و با ئەوکەسەش بێت بۆلات و بەیەکەوە نوێژ بکەن، چونکە ئەمە یارمەتیدانە لەسەر چاکە.([5]).

١٢/پێویستە لەنوێژی بەکۆمەڵدا زۆر درێژە بەنوێژەکەنەدرێت،بۆ بەزەیی هاتنەوە بەپیرو پەککەوتە ونەخۆش و خاوەن ئیش و کارو رێبوار، بەلام کەبەتەنهانوێژ کرا، یان کۆمەڵێك بون کە ڕازیبوون بەدرێژ کردنەوە ئەوە لەم کاتەدا دەتوانی نوێژەکە درێژ بکرێتەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{**إذا أمَّ أحدُکُم الناسَ ليخفّفْ،فإنّ فيهم الصغيرَ، والكبيرَ، والضعيفَ، والمريضَ، وذا الحاجة، و إذا صلّى لنفسه فليُطوِّلْ ماشاء**}([6]).ماناکەی نوسراوەتەوە لەسەرەوە.

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] آداب المسلم للماردیني،ل:٤٠.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] آداب المسلم للماردیني،ل:٣٩.

[5] المصدر السابق،ل:٣٩ .

[6] متفق عليه.

١٣/كاتێك كه نوێژی بەکۆمەڵ تەواوبوو زۆر پەلە مەکە بۆ دەرچوون لەمزگەوتدا بۆئەوە خەڵکی ئەزیەت نەکەیت، وە بۆئەوە دابنیشی بۆ خوێندنی ویردەکان و بۆ قورئان خوێندن.

١٤/پێویستە ئەو کەسەی کە لەهەموو نوێژخوێنەکان بەتەمەنتر وبەپارێزتر وزیاتر قورئانی لەبەربێت ئەو کەسە لەریزی یەکەم ولەدوا ئیمامەوە بوەستێ، لەدوا ریزی پیاوانەوە ئەمجا مندالأن و پاشان ئافرەتان بوەستن، بەلأم ئافرەتان بەتەنها بوەستن باشترە بەتایبەت لەم رۆژەدا.

١٥/ئافرەتان دەتوانن بێن بۆ مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ بکەن بەلأم نابێ خۆیان بۆن خۆش کردبێت و خۆیان رازاندبێتەوە، ئەبوهریرە گێرایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : {لاتمنعُوا إماءَالله مساجدَ الله ولْيَخرُجْنَ تَفِلاتٍ}([1]) واتە: ئێوە ئافرەتان لە مزگەوتەکان قەدەغە مەکەن وە ئەوانیش با بەبێ خۆ بۆنخۆش کردنەوە بێن بۆ مزگەوتەکان.([2]).

١٦/کە قامەتکرا لەناو مزگەوتدا مەکەوە پەلەپەل وخۆمشەوەشکردن، زۆر بەلەسەرەخۆییەوە وەرە بۆ جەماعەتەکەت،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{إذا سمعتم الإقامة فامْشُوا إلى الصلاة، وعليكم السكينةُ والوقارُ...}([3])واتە:کاتێك قامەتکرا ئێوە بۆ نوێژ وەرن،پەلەپەل مەکەن ولەسەرەخۆبن، وبەشەرم ویقارەوە رێگە بکەن.

(سود وبەهرەیەك) ئەگەر لەماڵەوە نوێژت کرد، ودوایی هاتی بۆ مزگەوت، سوننەت مەکە ، بەڵکو لەگەڵ خەڵکەکەدا جەماعەت بکە،چونکەدوپیاو کەلەماڵەوەنوێژیان کردبو و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون: سوننەت مەکەن، وەرن لەگەڵ خەڵکەکەداجەماعەت بکەن، بۆتان بەسوننەت حیسابە.([4]).

---

[1] أخرجه احمد وأبو داود بروانة: المسند الجامع ١٠ /٤٨، والحديث صحيح .

٢ بروانة: الآداب الإسلامية للناشئة ب٢ / ٤٠ -٤٧ وآداب المسلم ل:٣٩-٤٠.

[3] آداب المسلم،ل:٤٠.

[4] أخرجه الترمذي، بروانة:آداب المسلم،ل:٣٨.

## حەوتەم: ئادابەكانی رۆژی جومعە:

رۆژی جومعە بەلای خوای پەروەردگارەوە رۆژێكی پیرۆز وگەورەیە، لەقورئاندا سورەتێك بەناوی سورەی جومعەوە هاتووە، پێغەمبەریشﷺ لەبارەی گەورەیی رۆژی جومعەوە فەرمویەتی: ((رۆژی جومعە بەلای خواوە جل جلالە سەرداری رۆژەكانیترە، لەجەژنی قوربان ورەمەزان گەورەترە،ورۆژی جومعە پێنج كار وخەصلەتی گەورەی تێدایە:

أ- ئادەم لەو رۆژەدا دروستكراوە، ب- لەو رۆژەدا لەبەهەشتەوە هاتە سەر زەوی.

ج- لەو رۆژەدا ئادەم وەفاتی كرد. د-لەو رۆژەدا سەعاتێك هەیە، هەر كەسێك داوای هەر شتێك بكات خوا پێی دەدا مادام داواكەی تاوان و پچراندنی سیلەی رەحم نەبێت، هـ- لەو رۆژەدا رۆژی دوایی هەڵدەستێت و بەرپا دەبێت، هەرچی فریشتەكانو ئاسمان و زەوی و باو چیا و بەرد هەیە هەمویان لەرۆژی جومعە دەترسێن)).([1]).

خوا جل جلالە لەم رۆژەدا نوێژی جومعەی فەرز كردوە وئەو رۆژەی كردۆتە جەژنەیەكی هەفتانە و كردویەتیە كەفارەتی تاوانی ئەو هەفتەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الصلوات الخمس و الجمعة إلى الجمعة و رمضان الى رمضان مُكَفِّراتٌ لما بينهُنّ إذا اُجْتُنبتِ الكبائر**}([2]) واتە: پێنج نوێژە فەرزەكان و ئەم جومعە هەتا جومعەكەی تر، ئەم رەمەزان بۆ ئەو رەمەزانەكەی تر دەبن بەكەفارەتی تاوانی نێوانەكانیان كاتێك تاوانە گەورەكان ئەنجام نەدرێن. وازهێنان لەنوێژی جومعە هەرەشەی گەورەی لێكراوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لينتهينّ أقوامٌ عن وَدْعِهِم الجُمُعاتِ أو ليختمنّ اللهُ على قلوبهم ثم ليكُونُنّ من الغافلين**}([3]) واتە: ئەو كۆمەڵە خەڵكەی كە جومعەكانیان ناكەن دەبێ لەوە وازبهێنن، یان خوا جل جلالە دڵیان مۆر دەكات و پاشان دەچنە ریزی بێ ئاگایەكانەوە.

لەبەر پیرۆزی رۆژی جومعە ونوێژەكەی چەندەها ئاداب هەیە بەم شێوەیە باسیان دەكەین پێویستە رەچاو بكرێن:

---

[1]أخرجه البخاري في التأريخ ، وأحمد في مسنده(١٥٤٨٥)وحسنه حمزة الزين في تخريج المسند/١٢ /٢٢٥ .

[2]أخرجه مسلم في صحيحه عن أبي هريرة.

[3]أخرجه مسلم عن ابن عمر وابي هريرة.

## ئادابەکان:

١)بەیانی رۆژی جومعە خۆت بشۆ، لەبەیانیەوە هەتا کاتی بانگی جومعە دەتوانی خۆت بشۆی، ئەبو سعیدی خودری دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**غسل يوم الجمعة واجبٌ على كلّ مُحْتَلِمٍ**}[١] واتە: خۆ شۆرین لەرۆژی جومعە لەسەر ئەو کەسەی کە ئیحتیلامی بووە واجبە. عبداللە کوری عمر-رضي **الله عنهما** -گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا جاء أحدُكم الجمعةَ فليغتسِلْ**}[٢] واتە: کاتێك یەکێك لە ئێوە چو بۆ نوێژی جومعە با ئەو کەسە خۆی بشۆرێت.

٢)لەرۆژی جومعەدا خۆت پاك و خاوێن بکەوە، نینۆکەکانت بکەو خۆت بۆنخۆش بکەو مووەکانی بەرو بن هەنگڵت بتاشەو جوانترین پۆشاك لەبەربکەو با ئەو پۆشاکەش پۆشاکی سپی بێت، سلمان گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {هەرکەسێك لەرۆژی جومعەدا خۆی بشۆریَ و خۆی پاك بکاتەوە، سەروریشی بەرۆن چەوربکات، وخۆی بۆنخۆش بکات، پاشان بچێ بۆ مزگەوت بەبێ ئەوەی خەڵکی ئەزیەت بکات، ئەوەندەی دەتوانێ نوێژ بکات هەتا بانگ دەدا، کە وتاربێژ قسەی کرد بێدەنگ بێت، ئەوە خوای پەروەردگار لەتاوانی نێوان ئەو دوو جومعەی دەبورێت}.[٣].

٣)لەشەو ورۆژی جومعەدا سوننەتە سورەتی کهف بخوێنی، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ قَرَأَ سورة الكهف في يوم الجمعة أضاء له من النور مابين الجمعتين**}[٤] واتە: هەر کەسێك لەرۆژی جومعەدا سورەتی کهف بخوێنیَ ئەە نورو روناکی نێوان ئەو دوو جومعەی بۆ روناك دەکاتەوە.

٤) لەشەورۆژی جومعەدا دوعا زۆربخوێنە، چونکە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**فيها ساعةٌ لا يوافقها عبدٌ مسلمٌ وهو قائمٌ يصلّي يَسْأَلُ اللهَ تعالى شيئاً إلاّأعطاه إياها**}[٥]. واتە: رۆژی جومعە سەعاتێکی تێداهەیە، هەر بەندەیەکی مسوڵمان کە نوێژ دەکات لە خوا

---

١ حديث متفق عليه.

٢ حديث متفق عليه.

٣أخرجه أَحمد فِي«مُسْنده» وَأَبُو دَاوُد فِي «سنَنه» وَأَبُو حَاتِم بن حبَان فِي «صَحِيحه» وَالْحَاكِم فِي مُسْتَدْركه عَلَى الصَّحِيحَيْنِ، وهوحديث صحيح.

٤رواه النسائي والبيهقي والحاكم مرفوعا وموقوفا وقال: هذا صحيح الإسناد.

٥أخرجه البخاري في صحيحه.

بپاڕێتەوە بۆهەر شتێك ئەو پارانەوەیە لەو سەعاتەدا بێت ئەوە خوای پەروەردگار ئەو شتەی دەداتێ، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی کرد بەوە کە ئەو سەعاتە ماوەکەی کەمە.

**{سودێك}** قسەی بەهێز ئەوەیە ئەو سەعاتەی ڕۆژی جومعە لەدوا نوێژی عەصرەوەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: **{یوم الجمعة ثنتا عشرة ساعةً لایوجد مسلمٌ یَسألُ اللهَ شیئًا إلاّ آتاه اللهُ، فالتَمسُوها آخر ساعةٍ بعد العصر}** ([1])واتە: ڕۆژی جومعە دوازدە سەعاتە، هەر مسولمانێك داوای هەر شتێك بكات تێیدا خوا جلجلالە دەیداتێ، ئەوسەعاتەش لە ئاخیری کاتی عەصردایە. ([2]).

٥)لەشەوو ڕۆژی جومعەدا سوننەتە زۆر سەلاّوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{إنّ منْ أفضل أیامکم یوم الجمعة فأکْثِروُا علیّ من الصلاة فیه، فإنّ صلاتکم معروضةٌ علیّ}** ([3])واتە: پیرۆزترین ڕۆژەکانی ئێوە ڕۆژی جومعەیە زۆر سەلاّواتم لێ بدەن، چونکە صەلاّواتەکانی ئێوەم پێدەگات.

٦) زۆر چاك گوێ لەووتاری وتاربێژ ڕابگرە، ئەو زانست وحیکمەتەی کە ووتاربێژ باسی دەکات وەریبگرە وئیشی پێ بکە و لەکاتی ووتارەکەدا قسە لەگەڵ ئامادەبواندا مەکە، ئەبوهریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{منْ قال یوم الجمعة والإمام یخطُبُ: أنصتْ فقد لغا}** ([4]) واتە: کەسێك لەکاتی ووتاردا بەهاوەڵەکەی بڵێ: بێدەنگ بە ئەوە قسەی زیادەی کردوە.

٧)لەدوا نوێژی جومعەوە چوار رکات نوێژی سوننەت بکە، چونکەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **{إذا صلّی أحدُکُم الجمعة، فلیُصلّ بعدها أربعاً}** ([5]) واتە: چوار رکات نوێژی سوننەت بکە لەدوا نوێژی جومعەوە.

٨)لەڕۆژی جومعەدا کاتێك کە چویە ناو مزگەوتەوە دورکات نوێژی سوننەت بکەو بەلاّم درێژی مەکەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:- **{إذا جاء أحدُکُم یوم الجمعة والإمام یخْطُبُ فلیرکَعْ رکعتَیْن ولِتجوّزْ فیها}** ([1]).

---

[1]رواه الحاكم وصححه على شرط مسلم ١ /٢٧٩ ،ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود، رقم: ١٠٤٨.

[2]منهاج الصالحين ب١ /ل:١٨٢.

[3]أخرجه أبو داود والنسائي وغيرهما وصححه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم والنووي وآخرون.

[4]رواه البخاري ومسلم وأحمد و الترمذي و النسائي.

[5]أخرجه مسلم في صحيحه.

٩/بەیانی ڕۆژی جومعە یان دوا عەسرەکەی برۆ بۆ کوڕی زانست و زانیاری بەم ڕۆیشتنە دوو پیرۆزی گەورەت دەستدەکەوێت یەکەم زوو بەخۆکەوتن بۆ خواپەرستی، دوهەم: شارەزابون لەئاینی ئیسلام ئەنەسی کوری مالیك لەتەفسیری ئایەتی﴿**فاذا قُضِيت الصلاة فانْتشِروُا في الأرض وابتغُوا مِنْ فَضْل الله**﴾ دەڵێ:داواکردنی فەزڵی خوا داواکردنی دونیا نیە، بەڵکو فێربونی زانست و سەردانی برایەکی خۆتو ئامادەبونی جەنازەیەك و سەردانی نەخۆش و ئەو کارە چاکانەیە.([1]).

١٠) نوێژی جومعە مەفەوتێنە ئەگەر ناچارو بێچار نەبی مەڕۆ بۆ گەشت و بۆ سەفەر، ئیبن عمر گێڕایەوە: پێغەمبەر فەرمویەتی:{**مَنْ سافَر يوم الجمعة دعا عليه ملكاه**}([3]) واتە: هەرکەسێك ڕۆژی جومعە گەشت و سەفەر بکات نوێژەکەی بروا هەردوو فریشتەکەی سەرشانی دوعای لێدەکەن.

١١) بەتەنها ڕۆژی جومعە تایبەت مەکە بەڕۆژو گرتنەوە ناپەسەندە ، ئەبوهریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايصُومَنّ أحدُكم يوم الجمعة إلا يوماً قبله أو بعده**} ([4])، بەتەنها ڕۆژی جومعە بەڕۆژو مەبن مەگەر ڕۆژێك لەپێشیەوە، یان ڕۆژێك لە دوایەوە بەڕۆژو ببن.

١٢)لەکاتی وتاردا دامەنیشەوەدەست لەچۆکەکانتەوە وەربێنی،چونکە {**نهى رسولُ الله عن الحَبْوَة يومَ الجمعة والإمامُ يخطُبُ**}([5]). واتە:پێغەمبەر ﷺدانیشتنی بەچۆکەوەی قەدەغە کردوە لەکاتی وتاری جومعەدا، چونکە ئەودانیشتنە خەو یان وەنەوزە بۆ نوێژخوێن دەهێنێ.

---

[1]أخرجه مسلم في صحيحه.

[2]الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:١٧٠ .

[3]قال العراقي في تخريج الإحياء ١٨٨/١: أخرجه الدار قطني في الأفراد وفيه ابن لهيعة وقال غريب، والخطيب في الرواة عن مالك من حديث أبي هريرة بسند ضعيف"

[4]حديث متفق عليه.

[5]صحيح سنن أبي داود للألباني رقم:١١١٠.

## هەشتەم: ئادابەکانی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان:

چەژن بۆنەیەکی گەورەی ئیسلامە، ویەکێکە لەدیاردەکانی خۆشی وشادی دەربڕین و بەختەوەری وکامەرانی مرۆڤەکان، چونکە دەبێتە هۆکاری کۆبونەوەی مسوڵمانان و صەفای دڵەکان وبڵاوبونەوەی خۆشەویستی ویەکگرتن وئولفەت وهۆگری وزیاتر پەیوەندی نێوانیان.

بەڕاستی ئەمە فەزل ولوتفی خوایە کەوا چەژنی کردوە بەمایەی خۆشی وشادی، و فرسەتێکی گەورە بۆ دەربرینی خۆشی و ئیسراحەت و هەندێ لەیاری حەلال و خواردن و خواردنەوەی شتە حەلاڵ و پاکەکان وحەسانەوە و بوژانەوەی دڵەکان و دروست بونەوەی تین و تەوژمێکی تازە وچونەوە مەیدانی کار وهەولدان وتێکۆشان،ئیبن مسعود -رحمە اللە- دەڵێ:(وەك چۆن جەستە ماندو دەبێت، بەهەمان شێوە دڵەکانیش ماندو دەبن،بەڵام ئێوە بەشتە تەڕو شیرینەکانی زانست وحیکمەت دڵەکانتان ببوژێننەوە و گەشیان بکەنەوە).([1]).

مسوڵمانان دوو جەژنی سەرەکیان هەیە: جەژنی ڕەمەزان لەدوا بەجێهێنانی ڕۆژو گرتنەوە، جەژنی قوربان لەدوابەجێهێنانی فەریزەی حەجکردن، پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە هاتە شاری مەدینە خەڵککە دو ڕۆژیان هەبو یاری و سەیران و خۆشیان تێدا دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ئەم دوو ڕۆژە چیە؟ خەڵکەکە گوتیان: لەسەردەمی نەفامیەوە ئەم دوو ڕۆژەمان کراوە بەرۆژی یاری وخۆشی، پێغەمبەریش ﷺ لەوەڵامدا فەرموی: {**إنّ اللهَ قد أبدلكما بهما خيراً منهما عيدَ الفطرِ وعيدَ الأضْحَى**}([2]) واتە: خوا جلجلالە ئەو دو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بەدو ڕۆژی زۆر چاکتر کە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە.

لەبەرئەوە ئەو دوو جەژنە کۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشتی بەرزیان هەیە دەبێ ڕەچاویان بکەین و ئەنجامیان بدەین بەم شێوەیە:

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:١٨٥ .

[2] ترتيب أحاديث الجامع الصغير على الأبواب الفقهية ١ /٢٧٢ ،وهو حديث صحيح.وصححه الألباني في سنن أبي داود رقم:١١٣٤.

**ئادابەکان:**

١-زیندوکردنەوەی شەوی جەژن بەزیکرویادی خوا و نوێژکردن و تەسبیحات وقورئان خوێندن وهتد،لەپێغەمبەر ﷺدەگێڕنەوە فەرمویەتی: {**مَنْ أحْيا ليلة الفطر وليلة الأضحى، لم يَمُتْ قلبُهُ يوم تموت ُالقُلوبُ**}(١) واتە: هەر کەسێك ئەو دوشەوە چەژنی ڕەمەزان وقوربان زیندوبکاتەوە بەخواپەرستی و بەقورئان خوێندن وهتد ، ئەوە لەورۆژەدا کە دڵەکان دەمرن دڵی ئەونامرێ.

٢-لەشەوی جەژندا وپێش نوێژی بەیانی سوننەتە خۆشۆرین وخۆ بۆنخۆش کردن وخۆ ڕازاندنەوە ولەبەرکردنی جوانترین پۆشاك.(٢).

٣-لەنوێژی بەیانیەوە دەست دەکرێت بەگوتنی الله اکبر، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (البقرة: ١٨٥). وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**زَيِّنُوا العيدَيْن بالتهليل والتكبير والتحميد والتقديس**} (٣).

٤- لەپێش نوێژی جەژنی ڕەمەزانەوە سوننەتە سەرفیترە بەهەژارو نەدارەکان بدرێت وە لە سەرەتای ڕەمەزانیشەوە هەر دروستەئیبن عباس گێڕایەوەپێغەمبەر ﷺفەرمانی کرد کەوا زەکاتی سەرفیترە لەپێش دەرچونی خەلکەوەبۆ نوێژی چەژن بدرێ بە هەژار و نەدارەکان.(٤).

٥-خێرکردنی زۆر ودڵخۆشکردنی دڵی هەژارەکان وبێوەژنەکان و نەدارو قەرزارەکان وهەروا بەتایبەت دەستهێنان بەسەری هەتیوەکاندا،کابرایەك لەلایپێغەمبەر ﷺ سکاڵای دڵڕەشی خۆی کرد، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: {**إمْسَحْ رأسَ اليتيم وأطْعِم المسْكين**}(٥)،واتە: دەست بەسەری هەتیو دابێنەو خواردەمەنیش بەهەژار ونەدارەکان بدە.

---

١أخرجه الطبراني في الأوسط (١/٥٧ ،رقم ١٥٩) . قال الهيثمي (١٩٨/٢) : فيه عمر بن هارون البلخي والغالب عليه الضعف وأثنى عليها بنمهدي وغيره، ولكن ضعفه جماعة كثيرة والله أعلم .

٢ منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:١٨٦ .

٣ كشف الخفاء ١ /٤٤٣ وقال:قال ابن الغرس قال شيخنا: حديث حسن.

٤أخرجه البخاري ومسلم وابو داود وأحمد وابن ماجه والحاكم.

٥رواه أحمد في مسنده، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة، رقم:٨٥٤.

٦-بەیانی زوو بچۆ بۆ مزگەوت وسوننەتە لە ڕێگەیەکەوە برۆیو لە ڕێگەیەکیترەوە بێیەوە چونکە پێغەمبەرﷺ وایکردوە،وەبۆئەوەش ئەو دو ڕێگەو ئەو فریشتانە کە لەو ڕێگەو بانەدان شایەتی چاکەت بۆ بدەن،ئیمامی عەلی -رحمه الله- دەڵێ: لەسوننەت دایە کەوا بۆ نوێژی جەژن بەپیادە بڕۆی.([1]).

٧- کە چوی بۆ نوێژی چەژن بەهێواشی ولەسەرەخۆ بڕۆ، پەلەپەل مەکە.

٨-پێش دەرچون بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان سوننەتە شتێکی شیرین وەك خورما بخۆی،، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: {پێغەمبەر ﷺ هەتا هەندێ خورمای بەتاك نەخواردایە نەدەرۆیشت بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان}.([2]).

٩-لەدواهاتنەوە لەنوێژی جەژن سوننەتە سەلام بکەیت لەماڵەوە و لەدەرو دراوسێ و دۆست و برایان و هەرچی پێی دەگەی پیرۆزبایی لەخەلك بکە وبڵێ: خوا لەئێمەش و لەئێوەش وەربگرێت.([3]).

١٠-لەدوا نوێژکردنەوە سوننەتە سەردانی گۆڕستان بکەیت بەتایبەت گۆڕی دایكو باوك و خزمەکان و دوعاکردن بۆیان.

١١-سەردانی خزمان ودایك و باوك وزانایان ودۆستەکانت بکە، بەتایبەت ئەوانەی کە نزیکترن،چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{مَنْ سَرَّه أنْ يُبْسطَ له في رزقه أو يُنْسأَ له في أَثَرِه فليصِلْ رحِمَهُ})([4])،واتە:هەرکەسێك پێی خۆشە ڕیزق ورۆزی فراوان بێت وتەمەنیشی درێژ بێت، با سەردانی خزمەکانی بکات وپەیوەندیان لەگەلدا بەهێز بکات.

١٢-لەرۆژی چەژندا ئەویاریانەی کەگوناهیان تێدا نیە دروستە بکرێن، لەلای عائشە- رضي الله عنها-دوکەنیزەك گۆرانیان دەگوت، ئەبوبەکری صدیقیش پێیناخۆشبوو بەدەنگ هات وگوتی: لەماڵی پێغەمبەردا چۆن ئەمە دەبی؟،بەلام پێغەمبەرﷺ فەرموی: {دَعْهما

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:١٧٧ .

[2] أخرجه البخاري و أحمد والترمذي وقال: حسن صحيح.

[3] منهاج الصالحين،ب١/ل:١٨٩.

[4] أخرجه البخاري في صحيحه،وذكره الألباني في صحيح الجامع،رقم:٦٢٩١.

**يَا أَبَابكر،فَإِنَّهَا أَيَّام عيد**}[1]،واته: ئەی ئەبوبەکر لێیان گەڕێ قەیدیێ ناکا، چونکە ڕۆژی جەژنە،وهەندێ شت لەجەژنداقەیدیێ ناکا.

## (چەند سودو بەهرەیەك)

١/لەجەژنی قورباندا لەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە(الله اكبر) دەکرێت هەتا عەسری ڕۆژی چوارەمی جەژن خوا جلجلاله فەرمویەتی: ﴿واذكُروُا الله في ايامٍ معدوداتٍ﴾ واتە: لەو چەند ڕۆژەی حەجدا زیکرو یادی خوا بکەنەوە.

٢/نوێژی جەژنی قوربان لەبەر قوربانی کردن سوننەتە زو بکرێت، بەڵام نوێژی جەژنی ڕەمەزان سوننەتە دوابخرێت، لەم بارەوە ئەبو **حویریث**گێڕایەوە: پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ عەمری کوری حەزم نارد وفەرموی: {**أَنْ عَجِّلِ الأضحَى وأخِّرِ الفطر**}(٢) واتە: نوێژی جەژنی قوربان زوو ئەنجام بدە بەڵام نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوابخە.(٣).

٣/کەسێك دەوڵەمەند بێت سوننەتە قوربانی بکات، وە سوننەتە هەتا ڕۆژی جەژن ئەو دەرۆژە مو ونینۆك نەکەیت ئوم سلمە –ڕەزای خوای لێ بێت –گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ئەو کەسەی کە قوربانی دەکات لەسەرەتای مانگی (**ذي الحجة**)وە نابێ موو و نینۆکەکانی بکات هەتا قوربانیەکەی دەکات)).([4]).

٤/گۆشتی قوربانی دەکرێت بەسێ بەشەوە بەشێکی بۆ خۆت و منداڵەکان،وبەشێکی تری بۆ خزمان ودۆستان، وبەشێکی تریشی بۆ هەژارو نەدارەکان، نوبەیشە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:– {**أيامُ التشريق أيامُ أكْلٍ وشُربٍ وذِكْرِالله تعالى**}([5]) واتە: سێ ڕۆژەکانی دوا ڕۆژی جەژنی قوربان ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەی شتە حەلال و زەلال وشتە پاکەکانە وکاتی زیکرو یادی خوایە.([6]).

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه الشافعي في الأم١/٣٨٦" وهو حديث مرسل.

[3] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية ،ب١/ل:١٨٩.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] أخرجه مسلم في صحيحه.

[6] بروانة: الآداب الاسلامية للناشئة ب٢/ل:١٨٠.

## نۆیەم: ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئان:

قورئانی پیرۆز قسەی خوایە کە بەهیچ شێوەیەك شتی بەتاڵ وپوچ ڕوی تێناکا، هەر کەس قسەی پێ بکات ڕاست دەکات، هەرکەسێك حوکمی پێ بکات دادپەروەری دەکات ئەهلی قورئان ئەهلی خوایە، ئەو کەسانەی دەست بەقورئانەوە دەگرن سەرکەوتوو سەرفیرازن، ئەوانەی پشت لەقورئان دەکەن خەسارەتمەند و تێشکاون و فەوتاون.

پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی فەزڵ و پیرۆزی قورئانی کردوە، وەك ئەمانە:

١-{إِقْرَؤُا القرآن فإنّه يجئ يوم القيامة شفيعاً لأصْحابه}([1]) واتە:قورئان بخوێننەوە چونکە لەدوا ڕۆژدا قورئان تکابۆخاوەنیدەکات.

٢- {خيرُكُم مَنْ تَعلَّمَ القرآنَ وعَلَّمَه}([2]) چاکترینتان ئەوانەن کە فێری قورئان دبن، و خەڵکیش فێری قورئان دەکەن.

٣- {أهلُ القرآن أهلُ الله وخاصّتُه}([3]) واتە: ئەهلی قورئان ئەهل و کەسی خوایە، و خەڵکی تایبەتینلەلای خوای تعالی.

٤-پێغەمبەر ﷺ بەئەبو ذە ڕي فەرموو: {عليك بتلاوة القرآن فإنّه نورٌ لك في الأرض وذُخْرٌ لك في السماء}([4])واتە: پابەندی قورئانبە، چونکە قورئان بۆتۆ لەزەویدا روناکیە، ولەئاسمانیشدا زەخیرەیە.([5]).

لەبەرئەوە مرۆڤی مسوڵمان زیاد لەوە کە حەلاڵەکانی قورئان بەحەلاڵ دەزانێ وحەرام و قەدەغە کراوەکانی بەحەرام وقەدەغە کراو دەزانێ، و پابەندی ئادابەکانی دەبێت،وخۆی بە ڕەوشتەکانی قورئانەوە دەڕازێنێتەوە زیاد لەمانە قورئان خوێن پابەندی ئەم ئادابانەش دەبێت کە باسیان دەکەین:

---

[1]أخرجه مسلم في صحيحه.

[2]أخرجه البخاري في صحيحه.

[3]رواه احمد في مسنده (١٢٨/٦).

[4]رواه احمدفي مسنده(١١٧١٣) وحسنه الألباني في صحيح الجامع، رقم:٥٢٤٣.

[5]منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١/ل:٦٥.

## ئادابەكان:

١-لە قورئان خوێندندا ئیخلاصت تەنها بۆ خوابێت،چونكە ئیخلاص روح وگیانی كردەوەكانە، وهۆكاری قەبولبونیانە، یەكێك لەپیاوچاكان دەلێ:ئیخلاص ئەوەیە:مەدح و ستایشی خەلكت بەلاوە خۆش نەبێ.

وەیەكێك لەوانەی كەخوا جل جلاله بەدرۆیان دەهێنێتەوە لەدوارۆژدا قورئانخوێنێكە كە قورئانی خوێندوە،خوا پێی دەفەرمێ:تۆدرۆ دەكەی قورئانت بۆ خوا نەخوێندوە، بەڵكو بۆ ئەوەت خوێندوە كەپێت بڵێن :فلانكەس قورئانخوێنی چاكە.([1]).

٢-بەپاك و خاوێنیەوە قورئان بخوێنە،پێویستە قورئانخوێن جەستە و پۆشاك و جێگاكەی پاك بێت، چونكە پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشبوە ژیكری خوا بكات و پاك نەبێت، خۆ قورئانیش پیرۆزترین وگەورەترین ژیكرە،هەندێك لەزانایان دەڵێن: بۆ قورئان خوێندن دەستنوێژ واجبە. ([2]).

٣-لە قورئان خوێندندا سیواك بەكار بهێنە،چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**طيّبوا أفواهكم بالسّواك، فإنّها طُرُق القرآن**}([3]).دەمتان بەسیواك بكەنەوە،چونكە دەمتان ڕێگەی قورئانە.

٤-سوننەتە قورئانخوێن ڕو لەقیبلە قورئان بخوێنێ،ودەستنوێژی هەبێ وپۆشاكی پاك بێت و خۆی بۆنخۆش بكات، بۆ قورئان خوێندن و بۆ پاڕانەوە لەخوا عزوجل.([4]).

٥-پێش دەست كردن بە قورئان خوێندن بڵێ {**أعوذ بالله من الشيطان الرجيم**} خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ (النحل: ٩٨) كاتێك ویستت قورئان بخوێنی بڵێ: **(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)**.

وە لەبارەی (بسم الله)كردنەوە ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **((كلّ أمْرٍ ذي بالٍ لا يبدأ ببسم الله فهو أبتر أوأقطع))**([1]) واتە: هەر كارێك خاوەن شتێك بێو(بسم الله)ی تێدا نەكرێت ئەوە بڕاوەیە، یان دوابڕاوە و پیرۆز نیە.

---

[1] المصدر السابق،ل:٦٧ .

[2] المصدر السابق،ل:٦٨ .

[3] بروانة: صحيح الجامع،رقم:٣٩٣٩.

[4] موسوعة الآداب الإسلامية،محمد حسان، ل:٢٠٦ .

٦-بەردەوامی لەسەر قورئان خوێندن بەدانانی ویردێکی ڕۆژانە و خۆپاراستن لە لەبیر چونەوەی قورئان، ئەبو موسا گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**تعاهَدُوا هذا القرآن، فوالذي نَفْسُ محمّدٍ بيده لهو أشَدُّ تفلّتاً مِنَ الإبلِ في عُقُلها**([2]) واتە: لەگەڵ ئەو قورئانە بن، سوێند بەو کەسەی کە محمدی بەدەستە قورئان چاکتر لەحوشتر لەدەستی ئینسان بەردەبێت ، ئەگەر لەگەڵیدا نەبیت.([3]).

٧-سوننەتە دەنگتبە قورئان خۆش بکەیت، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ما أَذِنَ اللهُ لشيء ما أَذِنَ لنبيٍّ حَسَن الصوت يتغنّى بالقرآن يَجْهَرُ به**}([4]) واتە: خوا عزوجل گوێ بۆ هیچ شتێك ڕاناگرێ، وەك ئەوە کە گوێ بۆ پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش رادەگرێ کە قورئان بەئاواز وبەدەنگی بەرزەوە بخوێنێ.

**(سودێك)** دەنگ وئاوازی خۆش لەقورئانخوێندندا شتێکی زۆر چاکە،پێغەمبەر ﷺزۆر پێیخۆش بوە،کابرایەك لەمزگەوتدا قورئانی دەخوێند دەنگی زۆر خۆشبو،پێغەمبەر ﷺ فەرموی:ئەوە کێیە؟ گوتیان: عبدالله ئیبن قیسە، ئەمجا فەرموی:{**لقد أُوتِي هذا مزمارًا من مزامير آل داود**}([5]). واتە:ئەمپیاوەدەنگوئاوازی ئالی داودی پێدراوە. واتە:ئەوەندە دەنگی خۆشە.

٨-لەقورئان خوێندندا لەسەرەخۆبە،پەلەپەلمەکە، وەك: منشاوی و غامدی و کەناکیری چۆن قورئان دەخوێنن تۆش ئەوها بیخوێنەوە، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ (المزمل: ٤) واتە: قورئان بخوێنەوە بە لەسەرخۆیی و تێڕامان و بە تەجویدەوە.

---

[1] رواه ابو داود في سننه وهوحديث حسن.

٢حديث متفق عليه.

[3] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:٩١.

[4] حديث متفق عليه.

[5] حديث متفق عليه، ورواه أحمد في مسنده مختصرا(٩٧٦٨)بإسناد صحيح (٣١٦/٩) وابن ماجه بإسناد رجاله ثقات(١٣٤١).

عائیشه گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الماهر بالقرآن مع السَفَرة الكرام البَرَرة، والذي يقرأ القرآن ويَتَعتَعُ فيه وهو عليه شاقٌ له أجران**}([1]) واتە: ئەو کەسەی کە تەواو شارەزایی بەقورئان هەیە ئەوە لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکاندایە، وە ئەو کەسەش کە بەنارەحەتی قورئان دەخوێنێتەوە دو پاداشتی هەیە.

٩-ئەگەر قورئانخوێنەکان زۆر بون سوننەتە بەیەکەوە بیخوێننەوە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**ماجتمع قومٌ في بيتٍ من بيُوت الله يتلوُن كتاب الله و يتدارسونه بينهم،إلاّ نَزلتْ عليهم السكينة و غَشيّتهم الرحمةُ وحفّتهم الملائكةُ و ذَكرَهم اللهُ فيمَنْ عنده**} ([2]). واتە:هەر کۆمەڵێك لەیەکێك لەماڵەکانی خوا کۆببنەوە، وقورئان بخوێنن ودیراسەی بکەن، ئەوە ئارامی دێتە سەریان، وبەزەیی خوا دایاندەپۆشێ، وفریشتەکانیش دەورەیان دەدەن وخواجلجلالە باسیاندەکات لەلای فیشتەکانی خۆی([3]).

١٠-لەکاتی قورئان خوێندندا دڵت لەخوا بترسێ و ئەندامەکانیشت ئارام بن و لەترسی خوا بگریە، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ ..... ﴾ (الحشر: ٢١) واتە: ئەگەر ئێمە ئەو قورئانەمان بۆسەر کێوێك بناردایەتە خوارەوە ئەوە ئەو کێوەت دەبینی لەترسی خوا. کەرت وپەرت وشەق شەق دەبوو.

ئیبن مسعود گێڕایەوە گوتی کاتێك کە قورئانم بەسەر پێغەمبەردا خوێندەوە ئاوڕم دایەوە سەیرم کرد چاوەکانی فرمێسکیان لێدەهاتە خوارەوە.([4]).

١١-ئیش بەقورئانی پیرۆز بکە و بەفەرمانەکانی قورئان فەرمان بکە و لە قەدەغە کراوەکانی خۆت قەدەغە بکە، ڕاسپاردەکانی جێبەجێ بکە و سنورەکانیش مەبەزێنە، ئیبن مسعود گێڕایەوە گوتی: هەر کەسێك لە ئێمە کاتێك کە دە ئایەت فێردەبوو هەتا ماناکانی نەزانیایە و ئیشی پێ نەکردایە هیچی تری نەدەکرد.

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] رواه أبو داود(١٤٥٥)، وصححه الألباني في صحيح أبي داود،(١٣٠٨).

[3] الآداب الإسلامية،للشيخ محمود المصري،ل:٧٧.

[4] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

ئیبن عمر گێڕایەوە گوتی: ماوەیەك ژیاین و هەركەسێك لەئێمە لەپێش قورئانەوە بڕواو ئیمانی پێدەدرا ، سورەتێكی قورئان دادەبەزی حەلاڵ و حەرامەكەمان دەزانی وفەرمان و قەدەغە كراوەكانی و سنورەكانیشی كامەیە، بەلاّم دواتر خەڵكێكمان دیت قورئانیان پێدەدرا لەپێش بڕواكەیانەوە هەر لەسورەتی فاتیحەوە دەیانخوێندەوە هەتا كۆتایی نەیاندەزانی فەرمانەكانی قورئان كامەیەوقەدەغەكراوەكانیشی كامەیە.([1]).

١٢-بۆ قورئان خوێندن كاتە پیرۆزەكان هەڵبژێرە بەم شێوەیە:

ا-لەنوێژداقورئانخوێندن خێری زیاترە.

ب-لەغەیری نوێژدا:كاتی شەو،نیوە شەو،نێوان مەغریب وعیشا.

ج- لەڕۆژدا: دوانوێژی بەیانی،دوانوێژی عەصر،هەركاتێكی تردا.

د-لەڕۆژەكاندا: ڕۆژی جمعە،ڕۆژی دوشەممە وپێنج شەممە،ڕۆژی عرفە، دە ڕۆژەكانی كۆتایی رەمەزان، دەرۆژەكانی یەكەمی مانگی ذی حجە.

ە-لەمانگەكاندا مانگی رەمەزان.([2]).

١٣-كاتێك كە قورئان خوێندرایەوە گوێی لێ بگرە وبێدەنگ بە، خوا عزوجل فەرمویەتی : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ (الأعراف: ٢٠٤) .

واتە: هەر كاتێك قورئان خوێندرایەوە ئێوە گوێی لێ بگرن و بێدەنگ بن، ئومێدتان لێ دەكرێت خوا بەزەیی بێتەوە پێتاندا، ئەبو هریرە گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ استمع الى آيةٍ من كتاب الله كُتِبتْ له حسنةٌ مضاعفةٌ ومَنْ تلا آيةً مِنْ كتاب الله كانتْ له نوراً يوم القيامة}([3]) واتە: هەر كەسێك گوێ لەئایەتێكی قورئان بگرێت ئەوە دوو چەندانە خێری بۆ دەنوسرێت، وەهەر كەسێك ئایەتێك قورئان بخوێنێتەوە ئەوە لەڕۆژی دواییدا بۆی دەبێ بەنورو روناكی.

١٤- هەر شتێك كە ترس و خشوعەكەت كەم بكاتەوە و لەگەڵ گەورەیی قورئاندا یەك نەكاتەوە خۆتی لێ بپارێزە، وەك: پێكەنین، باوێشكدان، یاری كردن بەپۆشاك و ئەندامەكانت، پەنجە تەقاندن، قسەكردن لەگەڵ خەڵكیتردا بەبێ پێویستی وەكاتێك

---

[1] بروانە: الآداب الإسلامية للناشئة ب٢ ل:٩٩.

[2] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٧٧ .

[3] أخرجه أحمد ٣٤١/٢(٨٤٧٥).

باوێشك زۆری بۆهێنای قورئان خوێندن ببڕە، وەك کاتێك بایەکت لێدەبێتەوەقورئان خوێندنەکەت ببڕە وپاشان دەستی پێبکەوە ، ئەمەش هەموی قسەی زانای پایەبەرز مجاهدە – رەحمەتی خوای لێ بێت-([1]).

١٥-هەوڵبدە قورئانی پیرۆز لەبەربکە، چونکە نیعمەتێکی گەورەی خواییە، زانایان دەڵێن: لەبەرکردنی هەموو قورئان فەرزی کیفاییە، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ..... ﴾ (العنكبوت: ٤٩) واتە: قورئانی پیرۆز چەند نیشانەیەکی روون و ئاشکران لەدڵی ئەو کەسانەدان کە زانستیان پێدراوە.

١٦-سوربە لەسەرئەوە کە قورئانت لەبیرنەچێتەوە بەدەورکردنەوەی بەردەوام و دوو بارە کردنەوەی ئەو ئایەتانەی کەلەبەرت کردوون، ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {هەموو پاداشتی ئوممەتەکەمیان نیشاندام، هەتتا ئەو خاك و خۆڵەی کە کەسێك لە مزگەوتدا دەری دەکات، وە گوناهو تاوانی ئوممەتەکەشیان نیشاندام لەناو ئەو گوناهانەدا نەمبینی گوناهێك گەورەتر بێت لەوەی کە کەسێك سورەتێکی قورئانی زانیبێ، بەڵام پاشان لەبیر خۆی بردبێتەوە}.([2]).

١٧-قورئان لەلای ئەوکەسانە بخوێنە کەئیجازەی قیرائەتیان هەیە،چونکەپێغەمبەر ﷺ بەیارەکانی دەفەرموو:((بچن قورئان لەچوارکەس وەربگرن:(عبد الله ی کوڕی مسعود)،(ئوبەیی کوڕی کەعب)،(معاذي کوڕی جبل)، (سالم-ئازادکراوی- ئەبی حذیفة).([3]).

١٨-کاتێك کە خەتمی قورئان دەکەیتسوننەتە خێرا دەست بکەیەوە بەخەتمێکی تر، پاشان دوعای خەتمی قورئان بخوێنی، ئیبن عباس و ئوبەیی کوڕی کەعب گێڕایانەوە پێغەمبەر ﷺ کە لەسورەی الناس دەبۆوە دەستی دەکردەوە بەسورەی (فاتیحە) و سورەی (البقره) هەتا دەگەیشتە (وأولئك هم المفلحون)،پاشان دوعای خەتمی قورئانی دەخوێندو ئەمجا هەڵدەستا دەرۆیشت.([4]).

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة ب٢ /ل:١٠١ .

[2] رواه الترمذي وابو داود.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[4] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٨٢ .

١٩-لەپێنج تا سێ ڕۆژ کەمتر خەتمی قورئان مەکە،کابرایەك لەوبارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئەویش فەرموی: {لەمانگێکدا خەتمی قورئان بکە}،کابراکە گوتی: توانای زیاترم هەیە ، فەرموی: {لەپانزە ڕۆژدا خەتمی بکە}،کابراکە گوتی: توانای زیاترم هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {لەپێنج ڕۆژ کەمتر خەتمی مەکە}([1]).بەلام هەندێ لە زانایان ڕێگەیانداوە هەتا سێ ڕۆژ وکەمتریش خەتمی قورئان دروستە.

٢٠-لەناو قورئاندا قورئان بخوێنی باشترە تاوەکولەبەرخوێندن،چونکە تەماشاکردنی قورئان عیبادەتێکی سەربەخۆ ومەبەستە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{مَنْ سَرّه أَنْ يُحِبّ اللهَ ورسولَه فليَقْرَأْ في المصحف}(٢)واتە: کەسێك خۆشویستنی خوا وپێغەمبەرەکەی بیگەشێنێتەوە، بالەناو قورئاندا قورئان بخوێنێ،بەلام بۆ ئەوانەی بەلەبەرکردنەوەچاکتر قورئان دەخوێنن بۆ ئەوانە بەلەبەرکردنەوە بیخوێنن.([3]).

(سود و بەهرەیەك) هەندێك لەسورەتەکانی قورئان پیرۆزیەکی تایبەتیان هەیە و فەرمودەی پیرۆزیان لەسەر هاتووە وەك ئەم سورەتانە:

١-سورەتی فاتیحە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{والذي نفسي بيده ماأُنْزِلَ في التوراة ولا في الإنجيل و لا في الزبور ولا في الفرقان مثلها، إنها السبع المثاني والقرآن العظيم الذي أعطيته}([4]) واتە:لەتورات و ئینجیل زەبور و قورئاندا وێنەی سورەی فاتیحە نیە و دانەبەزیوە.

٢- سورەی البقرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{لاتجعلوا بُيُوتَكُم مقابرَ،فإنّ الشيطانَ يَفِرُّ مِن البيت أَنْ يسمع سورة البقرة تُقْرأُ فيه}([5])واتە:ماڵەکەتان مەکەنە گۆڕستان، چونکە شیطان لەو ماڵە ڕادەکات کە سورەی بەقەرەی تێدا بخوێندرێ.

[1] رواه الترمذي(٢٩٤٦)، وقال: هذا حديث حسن صحيح.

[2] ترتيب أحاديث الجامع الصغير،١/٤٤ ، وقال:حديث صحيح.

[3] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٧٦ .

[4] رواه أحمد في مسندة(٨٦٦٧) و ذكرة الألباني في صحيح الجامع وصححه برقم:٧٠٧٩ .

[5] أخرجه مسلم في صحيحه.

٣- سورەتی ئیخلاص، پێغەمبەر ﷺ بەیارەکانی فەرمو:((دەتوانن لەشەوێکدا سێیەکی قورئان بخوێنن؟، ئەوانیش گوتیان:نەخێرتواناى ئەوەمان نیە،ئەویش فەرموى:{**مَنْ قرأ (قل هوالله أحد) في ليلته فقد قرأ ثُلث القرآن**}([1]) واتە: کەسێك لەشەوێکدا **(قل هو الله أحد)** بخوێنێ وەك ئەوە وایە سێیەکی قورئانی خوێندبێ.

٤- سورەتی کهف، لەباسی رۆژی جمعەدا پیرۆزیەکەی باس کراوە.

٥ -سورەتی **یس**، وسورەتی **واقیعە**،وسورەتی **تبارك**، وسورەتی **ناس وفلق**، ئەمانە هەر یەکەیان پیرۆزیەکی تایبەتیان هەیە وفەرمودەی پیرۆزیان لەسەر هاتووە تۆش خوێندکاری ئازیز ئاگاداربە ئەو سورەتانە بەتایبەت لەکاتەکانی خۆیاندا بخوێنە خوای پەروەردگار هەمومان پیرۆز بکات.([2]).

## {بەهرەیەکی تر}

ئەو کەسەی کەگوێی لەقورئانەوەیە لەناو رادیۆش بێت پێوستە بەدڵ گوێ لە قورئانەکە بگرێ ونابێ قسە بکات یان هەرا هەرا بکات.([3]).

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢/ل:٦٥، وآداب المسلم ل: ٥٨-٥٩. ومنهاج المسلم ل:٦٤-٦٥،ومنهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:٧٣ .

[3] موسوعة الآداب الإسلامية،للشيخ أيمن المزين والشيخ محمد حسان،ل:٢١٢.

## دەیەم: ئادابەکانی ئامۆژگاری کردنی خەڵك:

مسوڵمان ئاوێنەی برا مسوڵمانەکەیەتی، هەرکاتێك هەڵە بکات بەهەموو سۆزو بەزەییەکەوە ئامۆژگاری دەکات، وناهێڵێ هەڵە بکات، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ نەصیحەت و ئامۆژگاری کردنی یەکتری بەیەکێك لەمافەکانی برا مسولمانەکەی داناوە، و فەرموویەتی: { **حقّ المسلم على المسلم ستٌ...... وإذا استنصحك فانصَحْ له** } واتە: ئەگەر مسوڵمانێك داوای ئامۆژگاری لێکردی تۆش ئامۆژگاری بکە.

وە پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی لەیارەکانی وەردەگرت لەسەر ئەوە کەنەصیحەت و ئامۆژگاری کردنی یەکتری بکەن.

**بۆیە پێویستە ئەم چەند ئادابانەی ئامۆژگاریکردن رەچاو بکەین:**

١-بائامۆژگاری کردنەکەت زۆر بە ڕاستگۆیی و بەئیخلاصەوە بێت و هەروا با نەصیحەت کردنی خەلك بەنهێنیەوە بێت،پێغەمبەر ﷺ کە نەصیحەت وئامۆژگاری خەڵکی دەکرد دەیفەرموو:{ **مابال أقوامٍ يفعلون كذا وكذا**}([1]). واتە: ئەوە ئەوخەلکانە بۆ وادەکەن؟ نەیدەفەرمو: تۆ بۆ وادەکەیت؟، وەئیمام شافیعی دەلێ: هەر کەس بە نهێنیەوە نەصیحەتی براکەی بکات، ئەوە پەندیداداوە وئەوکەسەی رازاندۆتەوە، بەلام هەر کەس بەئاشکرا نەصیحەتی براکەی بکات ئەوە ئابروی بردوە وفەزحی کردوە.([2])

فضیلی کوڕی عیاض دەلێ: مرۆڤی بروادار عەیبەکەت دادەپۆشێ ونەصیحەتت دەکات، بەلام مرۆڤی بێ دین عەیبەکەت دەردەخات و ئابورت دەبات.

٢-نەصیحەت وئامۆژگاری خەلك بکە هەر چەندە کەسیش پێت نەلێ، هەمیشە نەصیحەتی خەڵك بکە و قەت چاوەڕێی ئەوە مەبە کە داوات لێبکەن، چونکە نەصیحەت هەر لەبەر خوایە، تۆ کەسێك ببینی بخنکێ دەبێ خێراپەلامار بدەی و رزگاری بکەیت، خۆ ئەگەر کەسێك بکەوێتە ناو گوناهو تاوانەوە ئەمەهەر زۆر ئەولاترە بە ڕزگار کردن.([3]).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[2] الآداب الإسلامية، للمصري/ ل:٢٢٥.

[3] الآداب الإسلامية، للمصري/ ل:٢٢٦.

٣-پێویسته: ئامۆژگاریکەر زۆر لەسەرەخۆ بێت وزۆر نەرم ونیان ودل فراوان بێت،خوا جل جلاله بەپێغەمبەرەکەی فەرموە:﴿ ... وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ .. ﴾آل عمران:١٥٩. واتە: ئەی محمد ئەگەر تۆ خۆ بەزلزان و فیزدار ودلڕەق بی، یەك كەس بەدەورەتەوە نامێنێ.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{مَن يُحْرِم الرفق يُحْرِم الخيرَ كلّه}([1]).واتە: كەسێك لە نەرم و نیانی بێبەش بێت لەهەموو چاكەیەك بێبەشە.

٤- پێویستە ئامۆژگاریكەر زانستێكی زۆری هەبێ، وبزانێ چۆن فەرمان بەچاكە دەكات و چۆن خەلك لەخەراپە دەگێرێتەوە، بەتایبەت دەبێ لەزمان ولەزانستەكانی ئێستا شارەزا بێت، شیخ الإسلام ئیبن تیمیەدەلێ: پێویستە ئامۆژگاریكەر خاوەنی سێ شت بێت:أ- زانست وزانیاری تەواوی هەبێ، ب- زۆر نەرم ونیان بێت،ج- زۆر بەصەبر ولەسەرە خۆبێت، ئەگەر نەصیحەتكردن بەم شێوە بێ، ئەمجا كارەكە بەر وبومی چاكی دەبێت وئامانجدار دەبێت.([2]).

٥-پێویستە نەصیحەت و ئامۆژگاری هەمو كار وبارەكانی هەم دونیا وهەم دوا رۆژ بگرێتەوە، چونكە برِوادار بۆ هەردو دونیا تێدەكۆشێ، ئەوەی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ براكەشی پێخۆشە([3]).

٦-پێویستە نەصیحەت وئامۆژگاری بەشێوازێكی وابێت كەموناسب بێت لەگەڵ هەموو كەسێكدا، هەندێ خەلك دەبێ بەرەقی نەصیحەت بكرێت، هەندێكی تری بەنەرمی، هەندێكیتری بەراشكاوی وهەندێكی تری بە راستەوخۆیی، هتد.([4]).

**ئادابەكانی ئامۆژگاریكراو:**

١-بەسنگێكی زۆر فراوانەوە ئامۆژگاریەكە وەربگرێت، ونابێ خۆی تێكبدا، یان خۆی نارەحەت بكات،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{الكبر بَطَرُ الحقّ، وغَمْطُ الناس}([1]).

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه، وهو في صحيح الجامع(٦٦٠٦).

[2] منهاج الصالحين ، ب٢ / ل:١٣٩.

[3] موسوعة الآداب الإسلامية،ل:٢٩٢ .

[4] منهاج الصالحين ، ب٢ / ل:١٤١.

واتە: خۆ بەزلزانین ئەوەیە: هەق و ڕاستی قەبول نەکەیت و خەڵکیشت بەلاوە سوك بێت و گاڵتەیان پێ بکەیت.

٢-نابێ ئامۆژگاریکراو سوربێ لەسەر شتە بەتاڵ وخەراپەکانی خۆی،چونکە گەرانەوە بۆ هەق و ڕاستی پیرۆزیە، دەستگرتن بە بەتاڵەوە ڕەزیلەت و پەستیە.

٣-لەهەموو مسوڵمانێکی ژیر وعاقڵ نەصیحەت و ئامۆژگاری وەربگرە،بەلام لەبێدین و لەبێ عەقڵ وەر مەگرە،چونکە ئەمانە لەباتی چاکە زەرەر وزیانت پێدەگەیەنن،سلیمانی کوڕی داود-علیهما السلام-بەکوڕەکەی گوت: {ئەی کوڕەکەم هیچ کارێك مەبڕێنەوە هەتا پرس وراوێژ بەکەسی ژیر وعاقل نەکەیت}.([2]). وە عمری کوری خەتتاب دەلێ:( بۆ کار وبارەکانت پرس وراوێژ بەوکەسانە بکە کە لە خوا دەترسێن.([3]).

٤-هەرکەسێك نەصیحەت وئامۆژگاری کردی تۆش زۆر سوپاس وستایشی بکە، چونکە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {من لم یشکر الناس لا یشکر الله}واتە: کەسێك سوپاسی خەلك نەکات، سوپاسی خوا ش ناکات،

ئەبو حاتەمی بەستی دەلێ: (نەصیحەتکردنی کەسێك کەسوپاست ناکات، وەك ئەوەیە لەشوێنی زورك وبێ ئاو تۆو بچێنی).([4]).

*{سود وبەهرەیەك}* نەصیحەت وئامۆژگاریکردن چەند سودێکی هەیە:

أ- نەصیحەت وئامۆژگاریکردن کاکڵەی دینە، وگەوهەری ئیمانە.

ب-بۆ چاکەکاران بەلگەی خۆشویستنی خێر وچاکەیە، ورقبونەوەیە لەخەراپە.

ج- دەبێتە هۆی زۆر بونی دۆستان، وکەمبونەوەی ناحەزان.

د-دەبێتە هۆی چاکبونی کۆمەڵگە،بەهۆی بلاوبونەوەی رەوشتە بەرزەکان، ونەمانی ڕەوشتە پیسەکان.

ه-خەریك بون بەخۆتەوە بۆ بەدەستهێنانی پیرۆزیەکان.

---

[1]أخرجه مسلم في صحيحه.

[2]شعب الإيمان للبيهقي رقم :(٨٣٩٣).

[3]الإخوان لابن أبي الدنيا، ل:٤٧.

[4]منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:١٤٤.

## یازدەیەم: ئادابەکانی کات و ساتەکانی تەمەن و ژینەکەت:

کات واتە: تەمەنی پڕ خێری مرۆڤ ، بۆیە پێویستە تەمەنت بپارێزی و بەفیڕۆ نەڕوا، شێخ حسنی بەصری دەڵێ:(ئەی مرۆڤ تۆ کۆمەڵە ڕۆژێکی، هەر ڕۆژێکت بڕوا هەندێکی تۆ ڕۆیشتوە).([1]).وەلەبەر ئەوە کە کات واتە: ژیان وتەمەنی راستەقینەی مرۆڤ،بۆیە پاراستنی، بناغەی هەمو چاکەیەکە وە ئیهمال کردنیشی بناعەی هەمو نەگبەتیەکە.

**لەبەر ئەوەپێویستە ئادابەکانی کات بزانین بەم شێوەیە:**

١-پێویستە نرخ و بەهای کات بزانی، خوا جل جلاله سوێندی بەکاتەکانی وەك: شەو و ڕۆژ ، چێشتەنگاو و عەصر هتد... خواردوە دیارە لەبەر گرنگی وبەنرخ وبەهای ئەو کاتانەیە وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ **لا تزول قدما عبدٍيوم القيامة حتّى يُسْأل عن أربع: عن عُمْره فيم أفناه...**}([2])،لە دوارۆژدا پێ لەبەر پێ نانێی، هەتا پرسیاری چوار شتت لێنەکرێ: - تەمەنەکەت لەچیدا بەڕێتکرد -چیتکرد وچیت بەدەست هێنا .....؟.

٢-سوربە لەسەر سودوەرگرتن لەکاتەکانت،وەهەوڵبدە کاتەکانت ڕێکبخە چونکە کات کەرۆیشت تازە ناگەڕێتەوە ،،تۆ دەتوانی لەچەند ساتێکدا زیکر وتەسبیحاتێکی زۆر بکەیت، کاری گەورە ئەنجام بدەیت.([3]).

٣-کاتەکانی خۆت لەگەڵ ئەوکەسانەدا مەبە سەر کەبەزایە بچێت،ئیبن مسعود گوتویەتی:( ئیعتیباری پیاو بەوکەسەوەیە کەهاورێیەتی دەکات، چونکە هەرکەسە، وهاورێیەتی هاوچەشنی خۆی دەکات).

٤-پێویستە بزانی پێشینانی (سلف) ئێمە لەگەڵ کاتیاندا چۆن بوون؟ بەراستی زانینی حاڵی ئەوان ئێمە فێر دەکات کەچۆن کاتەکانی خۆمان بقۆزینەوە، وسودیان لێ وەربگرین، شێخ حسنی بصری دەڵێ:( ئەی مرۆڤ ئەم ڕۆژەی تۆ تێیدای میوانتە، زۆر چاکەی لەگەڵدا بکە، چونکە ئەگەر چاکەی لەگەڵدابکەی، سوپاست دەکات، ئەگینا کە ڕۆیشت زەمت دەکات.([4]).

---

[1] منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٣٦٩.

[2] **لە پێشەوە باسکراوە.**

[3] منهاج الصالحين ، ب٢ / ل:٣٧٢،والوقت وأهميته في حياة المسلم،ل:٧٦ .

[4] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٣٧٣ .

ئیبن قیم الجوزی دەڵێ: کات بەزایەدان لەمردن ناخۆشترە، چونکە کات بەزایەدان لەخوا و لەدوا رۆژت دەپچڕێنێ، بەڵام مردن هەر لەدونیا ولەخەلکی دونیات دەپچڕێنێ.
٥-پێویستە مرۆڤ لەدونیادا خۆی بە غەریب بزانێ، وهەمیشە مردنی خۆی لەبیر بێت، پێغەمبەر ﷺ بەعبدالله ی کوری عمری فەرمو:{**كُنْ في الدّنيا كأنّك غريبٌ أو عابرُ سبيلٍ**}([1]) واتە: لەدونیادا خۆت بە کەسێکی غەریب، یان بەرێبوار دابنێ، بۆیە عبد الله-رحمه الله-هەموجارێ دەیگوت: کە ئێوارەت کردەوە چاوەرێی بەیانی مەبە، وەك بەیانیشت کردەوە چاوەرێی ئێوارە مەبە، وەلەکاتی لەشساغیت بۆ کاتی نەخۆشیت وەربگرە، وەلەکاتی ژیانت بۆ کاتی مردنت وەربگرە، واتە:زۆر خۆت بەدونیاوە خەریك مەکە و مەیلی مەدەیە ومەیکە بەنیشتیمانی ئەبەدی ، خۆت وەك کەسێکی غەریب و رێبوار بزانە ([2]).
٦-ئاگاداربە بێئاگا مەبە،بۆ کاری چاك وکارە گرینگەکان ئەمرۆ ئەمرۆ مەکە،وکاتە پیرۆزەکان هەڵبژێرە،وبیان قۆزەوە،کاتەکانیش وەك ئەمانە: نێوان نوێژەکان، نیوە شەو، دوانوێژی بەیانی هەتا رۆژ هەلات، دەی کۆتایی رەمەزان، دەی ئەوەلی زی الحجە، رۆژی جومعە، عرفە، ئەورۆژانەی کەسوننەتە تێیاندا بەرۆژو بیت، هتد.([3]).
٧-موحاسەبەی نەفسی خۆت بکە،چونکە موحاسەبەکردن هۆکارێکی گەورەیە بۆ ئەوە مسولمان کاتەکانی خۆی بقۆزێتەوە، ونەهێڵێ بەفیرۆ بروا، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**اغتنم خمساً قبل خمسٍ: شبابك قبل هَرِمك، وصحتك قبل سُقْمك، وغناك قبل فَقْرك، وفراغك قبل شُغْلك، وحياتك قبل موتك**}.([4]) واتە:پێنج شت بەغەنیمەت بزانە: گەنجیەتیت بەر لەپیر بونت، لەش ساغیەتیت بەر لە تەخۆشیت، دەوڵەمەنیت بەر لە هەژاریت، بێکاریت بەر لە سەرقالیت، ژیانەکەت بەر لەمردنت.([5]).

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه وغيره.

[2] رياض الصالحين،تحقيق: ماهر ياسين الفحل، ل:٢٩٣ .

[3] منهاج الصالحين، ب٢ / ل:٣٧٦ .

[4] رواه الحاكم وقال: صحيح على شرطهما، وصححه الألباني في صحيح الترغيب، رقم:(٣٣٥٥ ) وفي صحيح الجامع (١٩٥٧ ).

[5] منهاج الصالحين، ب٢ / ل:٣٧٧، والوقت وأهميته في حياة المسلم،بشكل عام.

٨-خۆت بەیەك كارەوە خەریك مەكە، هەوڵبدە بەهەمو كارەكان رابگەی، چونكە كارە چاكەكانزۆرن وجۆرا وجۆرن،بۆیە پێویستە تۆش بەهەمو كارەكان رابگەیی،وهەمو كارەچاكەكان ئەنجام بدەیت.([1]).

## دوازدەیەم: ئادابەكانی ئێمەی مرۆڤ لەگەڵ خوادا جل جلالە:

یەكەمین وگەورەترین ئەدەب كەواجبە ئێمە هەمان بێت ئەدەبی ئێمەیە لەگەڵ خوادا جلجلالە، ئەوخوایەی كەسەرەتای هەمو شتێكە، وسەرپەرشتیاری هەمو شتێك دەكات، گەورەیی ومولك وسامان هەر بۆئەوە، ئاگای لەهەمو شتێكە، هیچ شتێك لەدەستی دەرناچێت، هیچ كەسێك بەچاكی نەیناسیوە، لەبەر پێویستی خەلك وبونەوەری دروست نەكردوە، هەمو شتێك پێویستی بەئەوە،هەر رۆژە كاری تایبەتی هەیە، تاوانباران زەرەری لێنادەن، خواپەرستانیش سودی پیّ ناگەیەنن.([2]).

**لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە رەچاوی ئەم ئادابانە لەگەڵ خودا بكەین:**

١-هەمیشە بەزمان وەصف وستایشی خوا بكە،ئەمجا ئەندامەكانت لە فەرمان بەرداری خوا رام بكە.

٢ -خوات زۆر خۆشبویّ بە ئەوپەڕی خۆشەویستی،چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَد حلاوة الإيمان: أَنْ يكونَ اللهُ و رسولُهُ أحبَّ إليه ممّا سواهما....**}([3]).خۆشویستنی خوا وپێغەمبەرەكەی یەكێكە لەوانەی كە شیرینی ئیمان بەبرواداردەدات.([4]).

٣-زۆر شەرم لەخوا بكە و لەخوا بترسە و هەمیشە لەموراقەبەی خوادا بە لەتەنهاییدا و خۆت یەكلا بكەوە بۆ خواپەرستی راستەقینەیی، هەروا بیر لە نازو نیعمەتەكانی خوا بكەوە كە بەسەر تۆدا ڕژاندویەتی.([5]).

---

[1] منهاج الصالحين، ب٢ / ل:٣٧٧،ومنهاج المسلم، ل:١٧٣.

[2] موسوعة الآداب الإسلامية، ل:١٦٤ .

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] الآداب الإسلامية،محمود المصري، ل:١٤ .

[5] المصدر السابق، ل:١٧ .

٤-بەتەواوەتی خۆت بدە دەست خوا جلجلالە،پشت ئەستوربە بەخوا،چونکە خوا فەرمویەتی: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ المائدة: ٢٣.واتە: ئەگەر ئێوە بڕوادارن هەر بەخوا پشت ببەستن.

٥-هەمیشە گومانی چاك بەخوا بەرە،چونکە گومانی چاك بەخوا وات لێدەکات کەتۆ هەر بەخوا پشت ئەستور بیت، پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {**لا يموتنّ أحدُكم إلاّ وهو يُحْسِنُ الظَنَّ بالله عزّ وجلّ**}([1])واتە: کاتێك کە دەمرن دەبێ گومانی چاك بەخوا بەرن، بۆ ئەوە چاکە وبەختەوەری لای خواتان دەست بکەوێ .

٦-پێویستە مافەکانی خوا و ئەمرو فەرمان وقەدەغە کراوەکانی بپارێزی و هەروا سنورەکانیشی نەبەزێنی،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {**إحفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، إحْفَظِ الله تجده تُجاهَك و إذا سَألتَ فاسْألِ الله و إذا استعنتَ فاسْتَعِنْ بالله....**}([2])واتە: هەر کەسێك سنورەکانی خوا بپارێزێ، و چاودێری مافەکانی بکات، ئەوە خواش جلجلالە ئەوکەسە دەپارێزێ وچاودێری دەکات چونکە پاداشت لە چەشن وجۆری کردەوەیە وە هەروا کە داوای شتت کرد هەر لەخوا داوابکە، وهەر کۆمەکی لەووەر بگرە .([3]).

٧-لەهەمو حالێکتدا هەر پەنا بۆ خوا بەرە،وهەر بۆلای ئەوبگەرێوە، وسکالای خۆت هەر لەلای ئەو بکە،ئەوەش بەوە دەبێ کەبەندەی خوا بۆلای خوا رابکات، وبزانێ جێگە و ڕێگە و پەناگا هەر لەلای خوایە،بەراکردنی بەختەوەرانە رابکەی بۆلای خوا بە ئەنجامدانی هەمو ئەوکارانەی کەلەخوا نزیکت دەکاتەوە ودور کەوتنەوە لەهەمو ئەو کارانەی کە لەخوا دورت دەخاتەوە.([4]).

٨ -پێویستە خۆشەویستیت وڕق لێبونەوەت ویەخشین ونەبەخشینت تەنها هەر لەبەر خوا بێت،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: { **مَنْ أَحَبَّ لله وأبغَضَ لله.. فقد استكمل الإيمان**}([5]).

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] رواه أحمد في مسنده(٢٦٦٩ ) بإسناد، صححه أحمد شاكر(٣ /١٩٤ ).

[3] نور الاقتباس لابن رجب الحنبلي، ل:٣٩ .

[4] الآداب الإسلامية للمصري، ل:٢٤ .

[5] ترتيب أحاديث الجامع الصغير ٢ /١٦٠، وقال: حديث حسن.

٩-ئەدەب لەگەڵ خوادا ئەوەیە کەلە خۆتەوە شت حەلال وحەرام نەکەی وکار کردنت و حوکم کردنت تەنها بەوەبێ کەخوا نازڵیکردوە خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا .... ﴾ طه: ١٢٤هەرکەسێك واز لەزیکر ویادی من و قورئانەکەم بهێنێ، ئەوە بەتەئکید ژیانێکی پڕ لەتەنگ وچەڵەمەی دەبێت.

وەفەرمویەتی: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ المائدة: ٤٤

واتە: ئەوانەی بەشەرعی خوا حوکم ناکەن ئەوانە بێباوەڕن، هەر لەدوئایەتەکەی تردا فەرمویەتی: ستەمکار و فاسق و بێدینن.

١٠-بەردەوام خۆت بەخواوە مەشغول وسەرقاڵ بکە،وزۆر زیکر ویادی ئەو بکەوە، چونکە زیکر و یادی خوا چەندەها سود و قازانجی هەیە:

أ-بەزیکر ویادی خوا دڵ ئارام دەبێت:﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨ .

ب- بەزیکر ویادی خوا مرۆڤ لەسەر فەرمانبەرداری وخوا پەرستی بەزمان و بە ئەندامەکانی بەردەوام ئیستیقامەی دەبێت.

ج- بەزیکر و یادی خوا مرۆڤ لە شیطان دەپارێزرێ و خوا دەیپارێزێت.

د-بە هۆی زیکر ویادی خوا وە مرۆڤ کردەوەی چاك زۆر ئەنجام دەدات.

ه- بە هۆی زیکر و یادی خواوە خوا جلجلاله لەگەڵ مرۆڤدا دەبێت، وپشتی دەگرێ، و ئاگاداری دەکات و بەزەیی پێیدا دێتەوە،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{**....وأنا معه إذا ذكرني، فإِنْ ذكَرني في نفسه، ذكرتُهُ في نفسي، وإِنْ ذكَرني في ملإٍ ذكرتُهُ في مَلَإٍ خَيْرٍ منهم**}.([1]).واتە: من لەگەڵ بەندەکەمدام کەزیکرم بکات، ئەگەر لەدڵی خۆیدا باسم بکات، ئەوە منیش لەلای خۆمەوە باسی دەکەمەوە، وەئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا باسم بکات، منیش لەناو کۆمەڵێکدا باسی دەکەمەوە کە لەکۆمەڵەکەی ئەو چاکتر بێت.([2]).

١١ -لەهەمو کار وبارێکتدا خوا بەسەر هەمو شتێك وبەسەرهەموخەلکدا هەلببژێرە، پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{**مَنْ أرضَى الناسَ بسُخْط الله وكّله اللهُ إلى الناس، ومَنْ أَسْخَطَ**

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] الآداب الإسلامية للمصري، ل:٢٤ .

**الناسَ برضا الله كفاه اللهُ مُؤنَة الناس}**[1]. واتە: کەسێك بەتوڕەبونی خواوە خەلکی لەخۆی ڕازی بکات، ئەوەخوا دەیداتە دەستی خەلکەوە، بەلام کەسێك بۆ ڕەزابونی خوا خەلکی لەخۆی توڕە بکات، ئەوە خوا جلجلالە بەسە بۆ ئەو.

١٢-لەکارکردنت بۆ خوا جل جلالە بەردەوامبە و لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسە، خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ ......وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ...... ﴾ المائدة: ٥٤.

واتە: ئەو کۆمەڵە برواداڕەی کە خوایان خۆشدەویٚ و خواش جل جلالە ئەوانی خۆشدەویٚ ، ئەوانە بەردەوام کار بۆخوا دەکەن و لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن.[2].

١٣-پێویستە خۆت بەڕەوشتە بەرزەکانی وەك: تەوبەکردن لەگوناە، وئارامگرتن، و ڕاستگۆی و موراقەبەو پارێزکاری و یەقین پەیداکردن، وئیستیقامەوبەردەوامی، و پشت بەستن بەخواو بیرکردنەوە لەنازو نیعمەتەکانی خوا جل جلالە خۆت بڕازێنیەوە.[3].

١٤-یەقین و بڕوات وابیٚ کە لەدوارۆژدا خوای پەروەردگار بەهەردو چاوی خۆت دەبینی و بەخزمەتی دەگەی، کەئەمە لەدوارۆژدا خۆشترین نازو ونیعمەتەکانی خوایە بۆ بەندە چاکەکانی.[4].

**{ئاگاداری}** ئەوشتانەی کەبیٚ ئەدەبین لەگەڵ خوادا جل جلالە ئەمانەن، باسیان دەکەین پێویستە مسولْمان خۆیانی لیٚ بپارێزیٚ:

أ-جنێودان بە(با)،چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قەدەغە کردوە و فەرمویەتی:**{الرِّيح مِنْ رَوْحِ الله، تأتِي بالرّحمة و تأتي بالعذاب، فإذا رأيتُمُوها فلا تسبُّوها و اسْألوا مِن الله خيرَها و استعيذوا بالله مِنْ شرِّها}**[5].

ب-جنێودان بەزەمانە،چونکە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:خوا فەرمویەتی:**{يؤذيني ابنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدّهْرَ، وأنا الدّهْرُ، أُقلّبُ الليلَ والنهارَ}**[1].واتە: مرۆڤە کان ئەزیەتم دەکەن،

---

[1] رواه الترمذي (٢٤١٤ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع (٦٠١٠ ).

[2] منهاج الصالحين، ب١ / ل:٢١ .

[3] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين ومحمد حسان، ل:١٧٢ .

[4] المصدر السابق، ل:١٧٣ .

[5] رواه أحمد في مسنده (٧٦١٩ )وأبو داود (٥٠٩٧ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع رقم: (٣٥٦٤ ).

جنێو بەزەمانە دەدەن، خۆمن خاوەنی زەمانەم، من شەو ورۆژ هەڵ دەسوڕێنم، نەك زەمانە.

ج-جوتیار-فەلاح-نابێ بڵێ:من دانەوێڵەکەم سەوز کردوە،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی : {لایقولَنَّ أحدُکُم:زَرَعْتُ، ولیقُلْ:حَرَثْتُ}([2]) واتە: ئێوە مەلێن:دانەوێڵەکەم سەوز کرد، بەڵکو بلێن: زەویەکەم کێڵا،چونکە خواسەوزی دەکات، نەك جوتیار.([3]).

## سیانزدەیەم: ئادابی ئێمەی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ:

ئێمەی بڕوادار ناتوانین باسی فەزل وگەورەیی پێغەمبەر ﷺبکەین، هەروا ناتوانین هەمو مافەکانیشی پێبدەین، هەرئەوەندە بەسە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە لە بارەیەوە خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم:٤.واتە: ئەی محمد بەتەئکید تۆ لەسەر ڕەوشتە بەرزەکانی.

ئاشکرایە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی هەمو ڕەوشتە بەرزەکانە، لەهەمو کەس دادپەروەرترە، لەهەموو کەس ئازاترە، ولەهەمو کەس سەخی ترە، ولەهەمو کەس بەشەرم و حەیاترە و لەهەمو کەس بێ فیزترو بە تەوازوعترە و لەهەمو کەس زیاتر بە وەفاتربوە و بەسۆز و بە بەزەییتر بوە بۆ خزمەکانی وبۆ خەڵك،وەك باسمانکرد پێغەمبەر ﷺ خاوەنی هەموو سیفاتە بەرز وڕەوشتە جوانەکانە، وەك ئەوە خوا جلجلالە لەئایەتی﴿ وإنّك لعلی خلق عظیم﴾دا باسیکردوە.([4]).

---

[1]أخرجه البخاري ومسلم .

[2] رواه ابن حبان في صحيحه(٥٧٢٣) وإسناده صحيح.

[3]منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ / ل: ٢٦ ، وموسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين والشيخ محمد حسان، ل:١٧٢ .ومنهاج المسلم ل:٦٢.

[4]الآداب الإسلامية، محمود المصري، ل:٤٢-٤٤ .

ئەمەش هەندێکە لە ئادابەکانی ئیمەی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ زۆر پێویستە بەچاکی جێبە جیٚ بکرێن:

١ –بڕوای پێبهێنی و بەشوێنی بکەوی وبزانی ئەو پێغەمبەرە ﷺپلەو پایەی لەلای خوا جل جلالە زۆر بەرز وگەورەیە، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾الأعراف:١٥٨ واتە:ئەی محمد بەخەڵك بڵێ: من پەیامبەری خوام بۆ لای ئێوە بەتێکڕا.... دەئەی خەڵکینە بەشوێن ئەوپەیامبەرە بکەون. بەئومێدی ئەوە کە لەسەر ڕێگەی هیدایەت بڕۆن.

٢ –هەر شتێك ئەو پێغەمبەرە هەواڵی پێداوە بڕوای پێبکە،ولەهەمو کەسێکیش زیاتر خۆشت بوێ، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: { **لا يُؤْمنُ أحدُكم حتى أكُونَ أحبَّ إليه منْ والده و ولده والنّاس أجمعين**}([1]).واتە: هەتاوەکو منتان لەدایك وباوك هەمو خەڵك تێکڕا خۆشتر نەوێ ئیمانتان کامڵ و تەواو نابێت.

٣– هەر شتێك کە ئەو پێغەمبەرەﷺ قەدەغەی کردوە تۆش نزیکی مەکەوە و وازی لێ بهێنە، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ .....وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ..... ﴾ الحشر: ٧ واتە: هەر شتێك کەئەو پێغەمبەرە ﷺ پێیدان وەریبگرن،وە هەر شتێکیش کە ئەو پێغەمبەرە ﷺقەدەغەی کرد لێتان ئێوەش نزیکی مەکەون و وازی لێ بهێنن.

٤–لەهەمو کاتێکدا وبەتایبەت کەئەوپێغەمبەرە باس دەکرێ ئێوە ڕێزی زۆری لێبگرن و بە گەورەی بزانن،خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ الفتح٩.

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه ، كتاب الإيمان.

واتە: بۆ ئەوە ئەو پێغەمبەرەمان ناردوە کەئێوە بروای پێ بهێنن، وڕێزی لێبگرن، و بیکەن بە براگەورەی خۆتانوبەگەورەی بزانن ، ئەمە ووتەی ئیبن عباسە – رحمه الله .
هاوەڵان–رحمهم الله–ڕێزگرتنیان لە پێغەمبەر ﷺ بێ وێنە بوەولەخزمەتێدا بەئەدەب بوون، بۆیە کاتێك پێغەمبەرﷺ بهاتایە، تەنها ئیمامی ئەبوبکر وعمر دەیان توانی تەماشای پێغەمبەر بکەن لەبەرشەرمکردنیان،وەمغیرەگێڕایەوەگوتی:هاوەلانتەنانەت بە نینۆکیان لەدەرگای ماڵی پێغەمبەریان دەدا ، نەبادا ئەزیەتی پێبگا.
عەمری کوڕی عاص–رحمه‌الله–دەڵێ: هیچ کەسێکم هەندی پێغەمبەر خۆش نەویستوە، وە لە خۆشەویستیدا نەمتوانیوە بەچاوی خۆم تێر تەماشای بکەم. ([1])
٥–نابێ لەمەدحکردنی پێغەمبەرداﷺ شتی زیادە بگوترێ و زیادە ڕەوی بکرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ عەبد و بەندەی خوایە، خوا جل جلاله فەرمویەتی ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾الكهف:١١٠واتە: ئەی محمد تۆ بڵێ: خۆ من هەر عەبد و بەندەیەکی خوام وەك ئێوە، تەنها وەحیم بۆدێ لەلای خواوە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویوتی :{**لا تُطْرُوني كما أطرتِ النصارى ابن مريم.... وإنما أنا عبدٌ، فقولُوا: عبْدُهُ و رسولُهُ**} ([2])،واتە: وامەدحم مەکەن وەك عیسای کوڕی مریەم لێ مەکەن، خۆمن تەنها هەر بەندەی خوام، پێم بڵێن: عەبد وبەندەی خوا .([3]).
٦–بەرگری لەپێغەمبەر ﷺ بکە، وئەهل وبەیت وخێزانەکانیت خۆشبوێ، وبانگەواز و سوننەت وڕێبازەکەی رابگەیەنە وبیگەیەنە بەخەڵك، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣.
فەرمویەتی: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ ... ﴾ یوسف: ١٠٨
واتە: من وشوێنکەوتوانم بە بەرچاو رونیەوە خەلك بانگ دەکەین بۆ لای خوا .

---

[1] منهاج الصالحين ، ب١ / ل:٤٢.

[2] أخرجه البخاري في صحيحه، كتاب أحاديث الأنبياء.

[3] الآداب الإسلامية، للشيخ محمود المصري، ل:٤٩.

وە پێغەمبەر ﷺ بەئیمامی عەلی فەرموو: {**لَأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بك رجلاً واحداً خيرٌ لك من حُمُر النَّعَم**}([1]) ، واتە: ئەی عەلی تۆ یەك كەس بهێنیە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوە بۆتۆ لە ئاژەڵە سورەكان چاكترە.

هەرواپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **مَنْ دعا إلى هُدىً فأتُبع عليه، كان له مثل أجْر مَنْاتّبعه إلى عمله إلى يوم القيامة**}([2])،واتە:هەر كەسێك خەڵكی بانگ بكات بۆلای هیدایەتی خوا، وبەشوێنی بكەون، ئەوە ئەوكەسە هەندەی خێر وپاداشی شوێنكەوتوانی هەیە هەتا ڕۆژی دوایی.

٧-زۆر هەوڵبدە خۆت وەك پێغەمبەر ﷺ لێبكە،وخۆت بەرەوشتە بەرزەكانی ئەو پێغەمبەرەوە برازێنەوە، ڕەوشتە بەرزەكانیشی بریتین لەمانە، ئەمانەش زۆرن، بەلام هەندێكیان باس دەكەین:

١-گوفتار وكرداری ناشیرین مەكە، ووازی لێبهێنە.

٢-جگە لەخوتبە وئامۆژگاریكردن دەنگت بەرز مەكەوە.

٣-خەراپەی خەلكی بەچاكە كردن لەگەلیاندا مامەڵەبكە ولاییبە.

٤-رەنجبەر و هاوڕێ و منداڵەكەت كەخەراپەیان لەگەڵدا كردی سەرزەنشتیان مەكە و قسەیان پێمەڵێ.

٥-ئەركەكانی خۆت بەجێبهێنە،خاوەخاو مەكە،وكەمترخەمی لێ مەكە.

٦-هەتا دەتوانی پێداویستیەكانی هەژار ونەدار وژن ولاوازەكان بدە.

٧-پێكەنینی زۆر مەكە و زیاتر زەردەخەنەت هەبێ باشترە.

٨-یارمەتی منداڵ وخێزانت بدە،ئەگەربەچێشت لێنانیش بێت.

٩-لە جوانترینی ئەو پۆشاكانەی هەتە لەبەربكە،بەتایبەت بۆ كاتی نوێژ وجەژنەكان و جومعە كردن.

١٠-لەگەڵ رەنجبەرو كرێكارەكاندا كار بكە وخۆت بەزل مەزانە.

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب العلم.

١١-زمانت بپارێزە وقسەت خۆش بێ و قسەی ناخۆش بەكەس مەڵێ وزۆر قسەی سوعبەت مەكە باسووك نەبی.

١٢-ڕەزیل وپیسكە مەبە،سەخاوەت مەند بە، وزۆر چاكە بكە.

١٣-شەو زوو بخەوە، بەیانی زوو هەڵسە،بۆ ئەوە خواپەرستی و كارەكانت ڕابگەی و كاری دین وژینەكەت تەواو بكەی.

١٤-لە نوێژی بەكۆمەڵ (جماعەت) دوا مەكەوە و بەردەوامبە.

١٥-هەتا بۆت دەكرێ تووڕە مەبە، ئەگەر تووڕەش بوی خۆت بەخوا بپارێزە لە خەراپەی شەیتان.

١٦-هەتا بۆت دەكرێ زۆر قسە مەكە، بێدەنگبە،مەگەر لەخێردا،

١٧-زۆر قورئان بخوێنە، بە تێفكرینەوە،وباخەلكیش گوێت لێبگرێ.

١٨- سیواك بەكار بێنە و بەردەوام وبەتایبەت بۆ نوێژ كردن بۆنی خۆش بەكار بێنە و لە خەڵكیش ڕەتی مەكەوە.

١٩-زۆر ئازاو و بەغیرەتبە، هەر لەخوا بترسە،وبەردەوام قسەی هەق بكە.

٢٠-ئامۆژگاری هەمو كەسێك وەربگرە،ورەتی مەكەوە.

٢١-دادپەروەر لەگەڵ خەڵكدابە بەتایبەت ژن ومنداڵەكانی خۆتدا.

٢٢-لەسەر ئەزیەت وئازاری خەلك ئارام بگرە وچاوپۆشیان لێ بكە.

٢٣-هەرچی بۆخۆت پێت خۆشە ، بۆخەلكیش پێت خۆشبێت.

٢٤-سەلام زۆر لەخەڵك بكە، لەهەمو كاتێكدا ولەگەڵ هەموكەسێكدا.

٢٥-با پۆشاك و ڕواڵەتت پاك وخاوێن بێت،وموی سپیت بە زەرد و بەخەنە و وسمە ڕەنگی بكە، بۆ گوێڕایەڵیكردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.([1]).

٢٦-دەست بەسوننەت وڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ بگرە،چونكە پێغەمبەرﷺبەیارەكانی فەرم: {لە مەودواو لەرۆژانی صەبر وئارامگرتندا هەر كەسێك دەست بەسوننەت و

---

[1] منهاج الصالحين،ب١/ ل: ٤٦؛ الآداب الإسلامية، محمود المصري، ل:٥٠،وموسوعة الآداب الإسلامية،للشيخ محمد حسان،ل: ٢٠٠ ،ومنهاج المسلم ل: ٦٥.

ڕێبازی منەوە بگرێ، ئەجر و پاداشتی پەنجا کەس لەئێوەی دەست دەکەوێ، یارەکانیش گوتیان : ئەجروپاداشتی پەنجا کەس لەئێمە یان لەخۆیان؟، ئەویش فەرموی: نەخێر لە خۆیان}([1]).

٨-هەرکاتێك باسی پێغەمبەرﷺ بکرێ، خێرا تۆش صەلاواتی لێبدەو خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾الأحزاب: ٥٦وە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**البخيل الذي ذُكِرْتُ عنده، فلم يُصلِّ عليّ**}.([2]) واتە: مرۆڤی ڕەزیل وپیسکە ئەوکەسەیە باسی منی لەلادەکرێ، بەڵام صەلاواتم لێنادا.([3]).

**{سودو بەهرەیەك}** ڕێزگرتن و ئەدەبی جوان لەگەڵ یارەکاندا ڕێزگرتنە لە پێغەمبەر ﷺ بۆیە زۆر پێویستە ئێمە ڕێزگر و ئەدەبی جوانمان لەگەڵ یارەکاندا هەبێت و بە شوێنیان بکەوین و مافەکانیان بدەین و مەدح و سەنایان بکەین و داوای لێبوردنی گوناهەکانیان بکەین وە باسی چاکەکانیان بکەین، وە زمانی خۆمان لەخەراپە وناکۆکی نێوانیان بپارێزین،خوا جل جلالە فەرمویەتی:

﴿ والذين جائوا من بعدهم يقولون ربّنا اغفر لنا ......﴾.([4]).

---

[1] رواه الطبراني في الكبير(١٧ /١١٧) وصحّحه الألباني في السلسلة الصحيحة(٤٩٤).

[2] رواه الترمذي (٣٥٤٦)وهو صحيح. وصحّحه الألباني في صحيح الترمذي(٢٨١١).

[3] الآدا ب الإسلامية ، محمود المصري، ل:٥٤.

[4] الآدا ب الإسلامية ، محمود المصري، ل:٥٢.

## چواردەیەم: ئادابەکانی ڕێگەو بانی ئەم سەردەمە:

یەکێك لەئاکامی ئەو پێشکەوتنەی ئەمڕۆ جیهان بەخۆیەوە دیوە لەبواری تەکنەلۆجیاو پیشەسازییەوە ئۆتۆمبێلە، کە شتێکی تازەیە و پێشتر نەبووە، بۆیە پێویستە لەژێر تیشکی یاساکانی شەریعەتی پاکی ئیسلامدا بزانین چۆن لەگەڵ ئەم ئامێرەدا هەڵسوکەوت بکەین،ورەچاوی ئەم ئادابانە بکەین و ئاگاداریان بین.

### ئادابەکان:

١-لەشوێنە قەرەباڵغیەکاندا پێویستە شۆفێر ئۆتۆمبیلەکەی زۆر بەپارێزەوە لێ بخوڕێت، و ئاگاداری خەڵك بێت و ئاگای لەئۆتۆمبیلەکانی تر بێت، بۆئەوەی هیچ ڕوداوێکی نەخوازراو ڕوونەدات.

٢-لەو شوێنانەی کە ئاو یان قوڕ و چڵپاوی تێدایە، پێویستە شۆفێر ئۆتۆمبیلەکەی بەخێرایی لێنەخوڕێوئاگاداری خەڵك بێت.

٣-لەکاتی خەوتنی خەڵك و لەناو ژن و منداڵدا نابێ شۆفێر هۆڕینی ئۆتۆمبیلەکەی بەکار بهێنێ، مەگەر لەحاڵەتی زۆر ناچاریدا.

٤-بۆ ڕاگرتنی ئۆتۆمبیلەکەی پێویستە شۆفێر شوێنی لەبارو گونجاو وەك گەراج بۆ ئۆتۆمبیلەکەی بدۆزێتەوە و ئۆتۆمبیلەکەی لێ ڕابگرێت.

٥-شۆفێر شتێکی وا بارنەکات لەئۆتۆمبیلەکەیدا کەئەزیەت و ئازار تووشی خەڵك بکات.

٦-شۆفێرێك نابێ لەگەڵ شوفێرێکی تردا لەناو ڕێگەدا دەست بکەن بەقسەکردن و خۆیان بەیەکترەوە مەشغول بکەن، چونکە دەبێتە هۆی ڕوداوی دڵ تەزێن.

٧-پێویستە شۆفێر بەپێی ڕێنماییەکانی هاتوچۆ بڕوا بەڕێگەداو لەو یاسایانە لانەدا.

٨-لەکاتی سەرکەوتن لەئۆتۆمبیلدا پێویستە (بسم الله) بکرێت و دوعاو نزای سەفەر بخوێندرێت.([1]).

---

[1] آداب المسلم ل:١٣٧-١٣٨في صحيحهما.

## پانزدەیەم: ئادابەکانی بەکارهێنانی موبایل:

موبایل یەکێکە لەناز و نیعمەتەکانی خوا جل جلالە بەسەر مرۆڤەوەو دروستکراوێکی زۆر بەسودە، کات وماڵ وسامانی زۆر بۆمرۆڤ دەگێڕێتەوە،بۆئەوپەڕی دونیا وبۆ هەمو بۆنە و بۆ هەمو چاکەیەك مرۆڤ دەتوانێ پەیوەندی پێ بکات ، ومەبەستەکانی خۆی بەدەست بهێنێ زۆر بەئاسانی، خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل:٨ خوا جل جلالە لەمەودوا ئەوشتانەتان بۆ دروست دەکات کەئێوە نایزانن([1]).

جاوەك گوتمان: ئەم نیعمەتە پێویستە بەچاکی بەکار بهێندرێ، بۆیە پێویستە گەنج و لاوەکان وخاوەنی موبایل ڕەچاوی ئەم ئادابانە بکەن:

١-پێویستە زۆر تەئکید لەوژمارەیە بکەیتەوە کەپەیوەندی پێوە دەکەیت،لەبەر ئەوە نەوەك هەڵە بکەیت و ئەو کەسە خەوتبێ، یان توشی شتێك ببێ، یان بترسێ، هتد.. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**لايحِلُّ لمسلمٍ أنْ يُرَوِّعَ مسلماً**}([2])واتە:حەلاڵ نیە مسوڵمان براکەی بترسێنێ.

٢-لەکاتی گونجاو وموناسبدا پەیوەندی بکە،نابێ کاتی نوێژ وکاتی خەوتن وکاتی دەرس پەیوەندی بکەیت، چونکە ئەوە ئەزیەتدانی خەلکە،وپێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی:{ **لا تؤذوا المسلمين**}([3]).واتە: ئەی خەڵکینە نەکەن ئەزیەت و ئازاری مسوڵمانان مەکەن.

٣-پەیوندیەکەت باتەنها بۆ گوێڕایەڵی کردنی خوا بێ و لەبەر ئەوبێ، و بەسەلامکردن دەستی پێبکە و بە سەلامکردنیش کۆتایی پێبهێنە.

٤-هەوڵبدە با پەیوندیەکەت کورت بێ وئامانجدار بێ و زۆر درێژەی پێ مەدە، با بە خۆڕایی کاتەکانت نەڕوا و کاتەکانی خۆت بەزایە مەدە.([4]).

---

[1] منهاج الصالحين، ب٢ / ل: ٢٨٤، والآداب الإسلامية، للمصري ل:٣٧٦.

[2] رواه أحمد في مسنده (٢٢٩٥٩ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٧٦٥٨).

[3] رواه الترمذي (٢٠٣٢) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٧٩٨٥).

[4] منهاج الصالحين ، ب٢ / ل: ٢٨٩.والآداب الإسلامية، للمصري ل:٣٨٠.

٥-ئەوەی پەیوەندی دەکات پێویستە خۆی بە کەسە پەیوەندی پێکراوەکەوە بناسێنێ، لەکاتی پەیوەندیشدا دەنگی زۆر بەرز نەکاتەوە، وەکاتێك قسەکانی تەواو بوو با موبایلەکە لاببات وهیچکە قسە نەکات،وە لەناو مزگەوتیشدا دەبێ موبایل دابخرێت، و نابێ لەناو مزگەوتدا قسە بەموبایل بکرێت.([1]).

٦-زەنگ وجەرەسی موبایلەکەت با شێوازێکی جوان وشەرعی هەبێ، نەك وەك ئاوازی گۆرانیە بێشەرعی وئاوازە بێ ئابڕووەکان بێت، چونکە ئەوانە لەشەرعدا حەرام و قەدەغەن.([2]).

٧-ئەگەر کەسێك بەهەڵە پەیوەندی کرد، وداوای لێبوردنی کرد، تۆش عوزرەکەی لێ وەربگرە وخۆتی لێ توڕە مەکە،خوا جل جلالە فەرمویەتی:﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ الشورى: ٤٣.واتە: ئەوکەسەی ئارامگر ولێبوردە بێت ئەوەکارێکی گەورەی کردوە.

٨-بەموبایلەکەت وێنەی ئەوشتانە مەگرە کەحەرام بێ، یان ئافرەتی روت وسفور بێ، چونکە ئەمانە حەرامن.

٩-ئەو پەیوەندیانەی وەریان دەگری رێز وئەدەب ئەوەیە تۆماریان نەکەی، هەتا پرس بەخاوەنەکانیان نەکەی، چونکە دەچێتە بابی نهێنیەکانی خەڵك وجاسوسی کردن لەسەریان، خواجل جلالە فەرمویەتی:﴿ ولا تجسّسوا﴾واتە: جاسوسی لەسەر یەکتری مەکەن.([3])

١٠-کاتێك ئافرەت لەلایەن پیاوێکەوەپەیوەندیەکی بۆبێت پێویستە ئاگای لەم چەند خاڵە بێت:

أ-زۆر درێژە بەپەیوەندیەکە نەدا.

ب-ئەگەر کەسێکی تری لێبێ، با ئافرەت وەڵام نەداتەوە.

---

[1] الآداب الإسلامية للمصري، ل:٣٨١-٣٨٣.

[2] منهاج الصالحين ب٢ / ل:٢٩٠.

[3] منهاج الصالحين ب٢ / ل:٢٩١.

ج- پێویستە ئافرەت دەنگی نەرم وناسك نەكات،ودەنگیشی بەرز نەكاتەوە.([1]).

١١-پێویستە منداڵ موبایلی نەدرێتە دەست، وبەهیچ شێوەیەك نزیكی نەخرێتەوە، بەلأم لەبەر حالەتی ناچاری دەبێ منداڵ فێر بكرێ چۆن موبایل بەكار بهێنێ، وچۆن وەڵامی پەیوەندی بداتەوە.([2]).

## شازدەیەم: ئادابەكانی ذیكرو یادی خوای پەروەردگار:

ذیكرو یادی خوای پەروەردگار روح و گیانی هەموو عیبادەت و پەرستشەكانە و پیرۆزترینی هەموو كارەكانەو چاكترینی ئەو چاكانەیە كە مرۆڤی باوەڕدار لەژیانیدا لە سەریان بەردەوام دەبێت.

ذیكرو یادی خوا ئەودەرگا كراوەیەیە لەنێوان خوا وبەندەكەیدا، ئەگەر بەندەكە خۆی لەسەر خۆی دانەخا،

ذیكر و یادی خوا چەك وسیلاحی بڕواداره كە لەگەڵ جەردە و دزو و رێگرەكاندا پێی دەجەنگێ وە دەرمانی نەخۆشیەكانیشیانە.

ذیكر و یادی خوا ڕۆشنكەرەوە و روناكی دڵەكانە و شیفا و دەرمانەكەیانە كاتێك نەخۆشیەكان دایبگرنەوە.

بۆیە زیكر ویادی خوا بۆ مرۆڤی باوەڕدار رێز وحورمەتە ، كەواتە: هیچ رێزێكی تر بۆ بەندەی خوا نیە كە لەزیكر ویادی خوا گەورەترو پیرۆزتر بێت، چونكە ئەوكەسەی كە زیكرو یادی خوا دەكات دەبێتە هەمنیشی خوا، كەواتە: گومانی تێدانیە ئەوكەسە دەگاتە بەزەیی و لێبوردنی خوا وگەیشتن بەبەهەشتو بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا ، ئەی ئەوەنیە خوا عزوجلّ فەرمویەتی:﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ (الاحزاب: ٣٥) ئەو ئافرەت و پیاوانەی كە زیكر و یادی خوا بەزۆری دەكەنەوە، خوای پەروەردگار لێبوردن و پاداشتێكی گەورەیی بۆ داناون.

---

[1] المصدر السابق، ل:٢٩٢.

[2] المصدر السابق، ل:٢٩٢.والآداب الإسلامية، للمصري ل:٣٨٠-٣٨٤.

وە لە فەرمودەی قودسیدا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: خوا جل جلالە فەرمویەتی:
**{لايذكرني عبدٌ في نفسه، إلا ذَكرتُهُ في مَلاَءٍ من ملائكتي ولايذكرني في ملأٍ إلاّ ذكرتُهُ في الرفيق الأعلى}**([1]) واتە: هەر بەندەیەك لەدڵی خۆیدا زیكرویادی من بكات، ئەوە منیش لەناو كۆمەڵی فریشتەكاندا زیكر ویادی ئەو دەكەمەوە، وە ئەگەر لەناو كۆمەڵێكدا بەندەی من زیكرد ویادی من بكات، ئەوە منیش لەناو كۆمەڵی باڵادا زیكرو یادی ئەو دەكەمەوە.

تەنها بەزیكر ویادی خوا دڵەكان ئارام دەبن، خوا فەرمویەتی:﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد(٢٨).تەنها بەزیكر ویادی خوا دڵەكان دڵنیا دەبنەوەوئارام دەگرن.شێخ حسنی بصری دەڵێ:(لەسێ شتدا شیرینی وخۆشی وەربگرن: لەنوێژدا ، لەزیكر و یادی خوادا، لەقورئان خوێندندا،ئەگەر شیرینی وخۆشیت لەمانە دەستكەوت باشە، ئەگینا بزانە دەرگاكە داخراوە).([2]).
زیكر و یادی خوا دەرمان وشیفای دڵەكانە،كابرایەك بەشێخ حسنی بصری گوت: دڵم ڕەش بوە عیلاجم چیە؟،ئەویش گوتی:(بەزیكر و یادی خوا دڵت بتاوێنەوە).([3]).

**لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار چاودێری ئەو ئادابانە بكات بەم شێوەی كە باسی دەكەین:**
١-لەپێش یادی خواوە دەستنوێژێك بگرە، چونكە پێشەوا عمری كوڕی خەتتاب گوتویەتی: دەستنوێژی جوان و چاك شەیتان لەتۆ دوردەخاتەوە.
٢-لەكاتی عیبادەت ویادی خوا واجبە ئیخلاصمان تەنها بۆ خوا بێ ودڵمان ئامادە بێت، ومەبەستەكەمان تەنها هەر خوا بێت ([4]).
٣-پێویستە زۆر بەترس و لەسەرەخۆییەوە یادی خوا بكەینەوە، لەدڵی خۆماندا و بەسەر لێوەكانماندا یادی خوا بكەینەوە بەدەنگی بەرز نەبێ، خوا جل جلالە

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.
[2] مدارج السالكين، لابن القيم،٢ /٣١٥.
[3] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٢٦ .
[4] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٢٦

فەرمویەتی : ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴾(الأعراف: ٢٠٥).

**٤-باشتر ئەوەیە یادی خوا بەدڵ وبەزمان بێت، چونکە ئەم شێوەیە نزیك بونەوە لەخوای پەروەردگار پەیدادەکات ودڵیش لەخوا بێ ئاگا نابێت.**

**٥-لەسەرەتای زیکرەکەوە دڵ ودەرونی خۆت پاك بکەوە بەتۆبە کردن وداوای لێبوردن لە گوناهو تاوانەکانت، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إِنَّه ليُغانُ علَى قلبى، وإِنّى لَاَسْتغفرُاللهَ في اليوم مائة مرةٍ}([1]) واتە: شەیتان بۆ سەردڵم سەرەتاتکێ دەکات وە منیش لەرۆژێکدا سەد جار داوای لێبوردنی تاوانەکانم لەخوا دەکەم.([2]).**

**٦-دیاریکردنی کاتە پیرۆزەکان بۆ یادی خوا وەك:کاتی سەحەر-پێش نوێژی بەیانی- و کاتی گزنگی بەیان وکاتی ئێوارە و کاتی دوانوێژەکان و لەشەوە پیرۆز ورۆژە پیرۆزەکاندا، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿واذكُرْ ربَّك بُكْرةً وأصِيلاً﴾ واتە: ئێوارە و بەیانیان یادی خوای خۆت بکەوە.([3]).**

**ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: خوا جل جلالە فەرمویەتی: {ابن آدم أُذْكُرْنِى بعد الفجر وبعد العصر ساعةً،أكْفِك مابينهما}([4])واتە:ئەی مرۆڤ تۆ لەدوانوێژی بەیانی و نوێژی عەسرەوە یەك سەعات یادی من بکەوە منیش نێوان ئەو دوکاتە بۆ تۆ بەسم.**

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ أَقْرَبُ مايكونُ الربُّ من العبد في جوف الليل الآخر، فإِنْ استطعتَ أنْ تكونَ ممَّن يذكرُ اللهَ في تلك الساعة فكُنْ} .([5]). واتە:کاتی نیوە شەو نزیکترین ئەوکاتانەیە کەخواجل جلالە لەبەندەکەی خۆیەوە نزیك دەبێتەوە.**

**٧-سوننەتە ذیکر ویادی خوا گریان وفرمێسکی لەگەڵدا بێت، چونکە ئەبوهریرە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو:{سبعةٌ يظلّهم اللهُ في ظلّه يوم لاظلّ إلاّ ظلُّه... ورجلٌ**

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة، ب٢/ل:١٢٠والآداب الإسلامية،محمود المصري،ل:٢١٣.

[3] موسوعة الآداب الإسلامية،للشيخ أيمن المزين/ل: ٤٠٠.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] رواه الترمذي(٣٥٧٩ )و قال: حسن صحيح.

**ذَكَر اللهَ خالياً ففاضَتْ عيناه**}(1) واتە: حەوت کەس هەن لەژێر سێبەری خوادان لەو ڕۆژەدا کەجگە لەسێبەری خوا هیچ سێبەرێکیتر نامێنێ ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی : کەسێك کە لەچۆڵیدا یادی خوا بکاتەوە وچاوەکانی فرمێسك بڕێژێنن.

پێشینە چاکەکانی ئێمە لەکاتەکانی ذیکرو یادی خوادا زۆر گریان وفرمێسکیان هەڵرژاندوە ، ئیمامی عمر شوێنی فرمێسکەکانی لەڕومەتیدا دو خەتی ڕەش هاتبونە خوارەوە، هەندێ لەیارەکان وشوێنکەوتوان وئیبن عباس بەهەمان شێوە بوون.(2).

٨-پێویستە ڕەوشت و ئاکاروکردارمان یەك بگرێتەوە لەگەڵ ئەو زیکرو یادەدا کەبۆ خوای دەکەین، وسور بین لەسەریان ، چونکە مەبەست لەزیکر ویادی خوا ئەوەیە: کە بەهۆی ئەو زیکرویادەوە ڕەوشت وکار وئاکارمان جوانتروپەسەندتروچاکترلەئێمەدا ڕەنگ بداتەوە.

٩-پێویستە بەروبومی یادی خوا بۆ خۆمان بەدەست بهێنین، ، ئەوەش بە پارێزگاری کردن لەسەرخواپەرستی و قسەی چاك و کردەوەی باش و مامەڵەی شیرین لەگەڵ خەڵکدا ، چونکە خوا عزوجل فەرمویەتی:﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴾ (العنكبوت: ٤٥) واتە: نوێژی کامڵ مرۆڤ دەگێڕێتەوە لەکارە ناشیرین و کردەوە خەراپەکان، وەیادی خوای پەروەردگار لە هەموو ئەوانە گەورەترە.

١٠-زیکرو یادی خوا کۆتایی پێبێنە بەسەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەرو بەدوعاو نزاو پاڕانەوە لەخوا جل جلالە کەوا لێت وەربگرێ.

١١-ئەگەر لەشوێنێکدا ئەلقەی زیکری لێ بوو سوننەتە بەشداریان بکەیت،چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذامَرَرْتم برياض الجنّة فارْتَعوا قالوا: وما رياض الجنة يارسول الله؟ قال:حِلَق الذكر**}(3) واتە: کاتێك ڕۆیشتن بەلای باخچەکانی بەهەشتدا خۆتان تێربکەن، یارەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا باخچەکانی بەهەشت کامانەن؟ ئەویش

---

(1) حديث متفق عليه.

(2) منهاج الصالحين ،ب١ /ل:٢٣١.

(3) رواه الترمذي في فضل ذكر الله تعالى بروانه: الجامع الصغير،٦٦/١، وقال:صحيح.

لەوەڵامدا فەرموی: باخچەکانی بەهەشت ئاڵقەکانی زیکرویادی خوایە کە بڕواداران پێوەی سەرقاڵ دەبن.([1]).

**(سودوبەهرەیەك)** بەئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمیانگوت: ئامۆژگاریمان بکە،ئەویش گوتی:ئەگەر دیتتان خەڵك بەدونیاوە سەرقاڵە-ئێوە بەچاکەی ئاخیرەت و دوا ڕۆژەوە خۆتان سەرقاڵ بکەن.

وە ئەگەر خەڵك ڕواڵەتی دەڕازاندەوە-ئێوە دەرون وپەنهانیتان بڕازێننەوە.

وەئەگەر خەڵك بۆ تەلارو وباغ وبێستانی دونیا تێدەکۆشا-ئێوەشبۆ تەلار وباغ و بێستانی دوارۆژ تێبکۆشن.وە ئەگەر خەڵکبەعەیب وعاری یەکترەوە خەریکبون-ئێوە بەعەیبی خۆتانەوە خەریك بن. لەم دونیایەدا توێشو پەیدابکەن بۆئەوە بتان گەیەنێ بەدوارۆژتان،چونکە دونیا کێڵگەی دوارۆژە.([2]).

**ئەمە هەندێکە لەو زیکرانەی کە سونەتن:**

١-أَسْتَغْفِرُاللهَ: واتە: داوای لێبوردنی تاوانەکانم ئەی خوایە لەتۆ دەکەم، ئیبن عباس-رحمە الله- گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((هەر کەسێك پابەندی ئیستیغفار بێت ئەوە خوا جل جلالە لەهەموو تەنگو چەڵەمەیەکدا دەرگایەکی بۆ دەکاتەوە،ولەهەموو غەم و پەژارەیەکدا فەرەح وخۆشیەکی بۆ دەهێنێ، لەشوێنێکەوە کە گومانی لێ ناکات ریزق ڕۆزی دەداتێ)).([3]).

٢-بەراءگێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لا إله إلاّ الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كلّ شيءٍ قدير**} خێرەکەی وەك ئەوەیە کەبەندەیەك ئازاد بکەیت.([4]).

٣-**سبحان الله و بحمده، سبحان الله العظيم**: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: دوو وشە هەیە لەسەر زمان سوکن بەڵام لەتەرازودا قورسن، و خۆشەویستی خوای ڕەحمانن ئەو دووشەیە ئەمانەن: {**سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم**}.([1]).

---

[1] **بڕوانە:** اداب المسلم ل: ٦٥-٦٦.وموسوعة الآداب الإسلامية للشيخ أيمن المزين،ل:٤٠٣-٤٠٨.

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية ب١ / ل:٢٣٢.

[3] أخرجه ابو داود.**بڕوانە**:الجامع الصغير،٢ / ل:٢١٧ ، وقال: حديث صحيح.

٤أخرجه الحاكم وقال:صحيح على شرط الشيخين.

٤- لاحول ولاقوة إلاّ بالله: پێغەمبەرﷺبەئەبوموسای ئەشعەری فەرموو: خەزێنەیەك لە خەزێنەکانی بەهەشتان پێتبڵێم؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، فەرموی: بڵێ: {لاحول ولاقوة الإ بالله}.([2]).

٥- صەلاّواتدان لەسەر پێغەمبەرﷺ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك صەلاّواتێکم لێ بدا خوای پەروەردگار دە صەلاّواتی لێدەداتەوە.([3]).

ئەم زیکرانەی کە باسم کردن درێژەی هەیە بەلاّم من هەر بەکورتی باسم کردن.([4]).

## حەڤدەیەم: ئادابەکانی دوعا ونزا و پاڕانەوە:

دوعا ونزا وپاڕانەوە لەخوا جل جلالە کاکڵەی خواپەرستیە، وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {الدعاء سِلاحُ المؤمن، وعمادالدِّين و نُورُ السموات والأرض}([5]) واتە: دوعا و پاڕانەوە لەخوا جل جلالە چەك و سیلاحی بڕوادارە،وکۆڵەکەی ئایینە و ڕوناکی ئاسمان و زەویە و بەهێزترین هۆکارەبۆلابردنی شتە خەراپەکان، وبەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجەکانی مرۆڤ ، دوعاو پارانەوە ئەوپەڕی بەندایەتیە بۆ خوا جل جلالە، هەر ئەمە پیرۆزترین و بەختەوەرترین کاتەکانی مرۆڤە، ئەوە ئادەمە-علیه السلام- کاتێك تاوانی ئەنجامدا هیچ چاری نەما هەستا بەنزاو پاڕانەوەیەکی غەمباریەوە، ڕوی کردە خوا و گوتی: ئەی خوایە ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، ئەگەر لێمان نەبوری و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە دەچینە ریزی خەسارەتمەندانەوە ﴿قالا ربّنا ظَلَمْنا أنفسنا وإنْ لم تغفر لنا و ترحمنا لنكونَنّ من الخاسرين﴾.

ئیراهیم پێغەمبەر-علیه السلام- لەقولاّیی دڵیەوە لەخوا پاڕایەوە، و گوتی:﴿ربِّ هَبْ لی حُكْماً و ألْحِقْنی بالصالحين﴾

پێغەمبەرانی تریش لەکاتی سەغڵەتیدا هەر پەنایان بۆ خوا بردووەو هەر لەئەو پاڕاونەتەوە، جگە لەخوا جل جلالە کێ نوح پێغەمبەری لەخنکان رزگار کرد؟،ئەی کێ

---

١حديث متفق عليه.

٢حديث متفق عليه.

١٣خرجه مسلم في صحيحه.

[4]بروانە: الآداب الإسلامية للناشئة ب٢ ل: ١٣١-١٣٢.

[5]الجامع الصغير،ب١ /ل:٤٠٥، وقال: حديث صحيح.

بوو ئیبراهیمی له ئاگر رزگار کرد؟ ئەی کێ بو یوسفی له بیرەکه دەرهێنایەوه؟، ئەی کێ بوو ئەیوبی له نەخۆشی چاك کردەوه؟ ئەی کێ بوو موسای له فیرعەون وتاقمەکەی رزگارکرد؟ ئەی کێ بو یونسی لەناو سکی ماسی دەرهێنایەوه؟ئەمانەو بەصەدان شتیتر،کێ چارەیکردن جگه له خوای پەروەردگار؟، بەتەئکید هەر خوابو،وەهەموکەسێك جگه لەخوا هیچ کەسێکی تری نیه رزگاری بکات وچاکی بکاتەوه وبەهانایەوه بچێت.﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ﴾واته:جگه لەخوا کێ وەلامی مرۆڤی ناچار و بێچارە دەداتەوه و نەخۆشی و گرفتەکەی لادەبا؟.([1]).

## بۆیه نزاو پاڕانەوه چەند ئادابێکی هەیه و پێویسته ئێمه چاودێری بکەین و ئاگامان لەو ئادابانه بێت.

١-یەکلابونەوه بۆ خوا ودەستنوێژت هەبێت و ڕوو لەقیبله بکەیت و تۆبه و پەشیمانی دەر ببڕی و شتی خەڵکی که لەلاته بۆیان بگێڕیەوه.([2]).

٢-دەستەکانت بەرزبکەوه تا بەرامبەر شانت ودەستەکانت بەرزبکەوه بەرەوئاسمان به زەلیلی و ترسەوه، ئەنەس گێڕایەوه گوتی:{**كان رسولُ اللهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْه حتى يُرَى بياض إِبْطَيْه في الدعاء**}.([3]) واته: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی دوعاو پاڕانەوەدا دەستەکانی بەرز دەکردەوه تاوەکو سپیایی بن هەنگڵی دەبینرا.

٣-لەکاتی دوعادا دڵت ئامادە بێت لەگەڵ خوادا و گومانی جوان بەخودا ببە،وئومێدت هەر به ئەوبێ، یەقینت هەبێ که خوا جلجلاله دوعا ونزاکەت لێ وەردەگرێت ئەبوهریره گێڕایەوه پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: خوا جلجلاله فەرمویەتی: {**أنا عند ظَنِّ عبدي بي، فليظنَّ بي الظَّنَّ الحَسَن**}([4]) واته: من لەلای گومانی بەندەکەمم پێم، باندەکەم گومانی چاك و باشم پێ بەرێت.

---

[1] منهاج الصالحين، ب١ / ل:٢٣٥ .

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢ /ل:١٣٥ .

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

٤-کاتێك کەدوعات کرد دەنگت نزم بکەوەو چاوت بەرزمەکەوە بۆ ئاسمان،خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ۝٢ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴾ (مریم ٢-٣). واتە: زەکریا بانگی پەروەردگاری خۆی کرد،بەبانگ کردنێکی زۆر نزم و بە هێواشیەوە.

٥-ئیلحاحی کردن لەدوعا و نزاداو سێجار دوبارەی بکەوە، عبدالله ی کوڕی مسعود گێڕایەوە گوتی:{**کان رسولُ الله ﷺإذا دَعا دَعا ثلاثاً، وإذا سَألَ سَألَ ثلاثاً**}([1]) واتە:پێغەمبەر ﷺ کاتێك دوعای بکردایە سێجار دوعای دەکرد، وەکاتێك داوای شتێکی بکردایە سێجار داوای دەکرد.

٦-بە **الحمدلله** وسەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەست بەدوعاو پاڕانەوە بکە، کۆتاییەکەشی هەر با بەئەمانە بێت، ئەبو سلیمانی دارانی گوتویەتی: دوعاو پاڕانەوە بەو شێوەیە دەکرێت.

٧-خۆت بپارێزە دوعا لەخۆت و لەماڵ و منداڵت مەکە، لەم بارەوە جابر گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**لاتدعُوا على أنفسكم، ولاتدعُوا على أولادكم،ولاتدعُوا على أموالكم، لاتوافق من الله ساعةً يسأل فيها عطاءً فيُستجاب لكم**}([2]) واتە: دوعا لەخۆتان و لەمنداڵ وماڵو سامانتان مەکەن، نەوەك بکەوێتە ناو سەعاتێکەوەو لەو کاتەدا دوعاکەتان وەربگیرێ.

٨-پەلەمەکە لەوەلامدانەوەی نزاکەت و نائومێد مەبە لەجێبەجێکردنی پێداویستیەکەت و وازیش لەدوعاکردن مەهێنە،ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{دوعا کردن و پاڕانەوە هەر وەردەگیرێ، مادام دوعایەکە تاوان و پچڕانی خزمایەتی نەبێ،ومادام پەلە نەکا، گوتیان: پەلەکردن یانی چی؟ ئەویش فەرموی: ئەوەیە بڵێ: من هەردوعا دەکەم قبول نەبوو، ئەمجا پەشیمان ببێتەوە ودوعا نەکا}.([3]).

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] ترتيب أحاديث الجامع الصغير،٣ /٢٢ ، وقال: حديث صحيح.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

٩-قۆزتنەوەی کاتە پیرۆزەکان و شوێنە پاکەکان بۆ پاڕانەوە و نزاکردن وەك: **کاتی** پارشێو، شەوو ڕۆژی جومعە، مانگی ڕەمەزان، دە ڕۆژەی ذیلحجە، ڕۆژی عەرەفە، دوا نوێژە فەرزەکان و ناو سوجدەکان، و کاتی ڕۆژو شکاندن، حاڵەتەکانی دڵ نەرمی و لەخوا نزیکبوونەوە، لەمەککەی پیرۆز وشاری مەدینە، ومزگەوتەکان، لەم بارەوە ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**یَنْزِلُ اللهُ تعالی کُلَّ لیلةٍ الی سماء الدنیا حین یبقی ثُلُث اللیل الأخیر، فیقول عزوجل: مَنْ یدعونی فأستجیبَ له، مَنْ یسألنی فأُعْطِیه، مَنْ یستغفِرُنی فأغْفِرَلە؟**}[1] واتە: خوای پەروەردگار لەکاتی سێیەکی شەودا هەموو شەوێك دادەبەزێ بۆ ئاسمانی یەکەم و دەفەرموێ: (کێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوای شتم لێ دەکات تابیدەمێ، کێ داوای لێبوردنم لێدەکات تا لێی ببورم). هەروەها ئەبوهورەیرە گێراویەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:
{**أقربُ مایکُونُ العبدُ مِنْ ربّه وهو ساجدٌ، فأکثروا الدعاء**}[2] واتە: نزیکترین ئەو کاتانەی کە بەندە لەخوای خۆیەوە نزیك بێتەوە ئەو کاتەیە کە لەسوجدە دابێت، کەواتە لەو کاتەدا زۆر دوعاو نزا بکەن.
١٠-زۆر دوعاو پاڕانەوە لەکاتی شێنەیی و خۆشیدا بکە بۆ ئەوە لەکاتی تەنگو چەڵەمەو ناخۆشیدا دوعاو نزاکەت زوو گیرابێت، ئەبوهورەیرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ سَّره أنْ یَسْتجیبَ اللهُ له عند الشدائد والکُرَب فلْیُکْثِر الدعاء في الرخاء**}[3] واتە: کەسێك پێ خۆشە کەوا لەکاتی ناخۆشی و تەنگو چەڵەمەدا خوای پەروەردگار وەڵامی بداتەوەو لای لێ بکاتەوە ئەوە بالەکاتی خۆشیدا دوعاو نزا زۆر بکات.
١١-لەخواردن و خواردنەوە و پۆشاکدا خۆت لەحەرام بپارێزە،چونکە خوا پاکە پاك نەبێ وەری ناگرێت، ئەبوهورەیرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ئەی خەڵکینە خوا پاکەو پاك نەبێ وەری ناگرێ**، وە خوا بەچی فەرمانی بەپێغەمبەران کردوە هەر بەوەش فەرمانی بەبڕواداران کردوە وفەرمویەتی: ﴿**یاأیها الرسل کلوا من الطیبات و**

---

[1] حدیث متفق علیه.

[2] أخرجه مسلم في صحیحه.

[3] رواه الترمذي، بروانه:ترتیب أحادیث الجامع الصغیر، ٢ /١٧٩،وقال:حدیث صحیح.

**اعملوا صالحاً إنّي بما تعملون عليم﴾ واتە: ئەی پێغەمبەران لەپاکەکان بخۆن و کرداری چاك بکەن، وەفەرمویەتی: ﴿یاأیها الذین أمنوا کُلوُا من طیّبات مارزقناکم﴾ واتە: ئەی بڕواداران لەو ریزق و رۆزیەی کە پێمان داون بخۆن، پاشان پێغەمبەر ﷺ باسی کابرایەکی کرد کە گەشتەکەی درێژ دەکردەوەو چڵکن و کولکن بو، دەستی بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەیگوت: ئەی پەروەردگارم، ئەی پەروەردگارم،پێغەمبەر فەرموی: {بەلاّم ئەم پیاوە خواردن وخواردنەوەکەی حەرامە وپۆشاکەکەی حەرامە و هەر بەریزق و رۆزی حەرامیش پێگەیوە، ئەم کەسە چۆن دوعا و نزای لێ وەردەگیرێ؟} ([1]).**

**١٢-بەناوە جوانەکانی و بە ئیسمیأعظمی لە خوا بپاڕێوە، وەك فەرمویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ ﴾** (الأعراف: ١٨٠)

**وەخوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ﴾** (الاسراء: ١١٠).

**ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:((ألِظّوُا -أی الحّوُا- بیا ذالجلال والإکرام))([2]) واتە: سوربن لەسەر دوعاو نزاکانتان بەناوی ذوالجلال والإکرام-ەوە.**

**١٣-زۆر دوعا بۆ دایكو باوك و خوشك و براو منداڵ و دراوسێ و بڕواداران بکە. خوا جل جلالە لەموساوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾** (الأعراف: ١٥١) **واتە: ئەی پەروەردگارم لەخۆم و لەبراکەم خۆشبەو بمان خەرە ناو بەزەیی خۆتەوە تۆ لەهەموو کەس بەبەزەیی تری.**

**ئەبو درداء گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {دوعای بڕاوادار بۆ براکەی لەپشتەملدا وەرگیراوە، لەلای سەرییەوە فریشتەیەك وەستاوە هەر جارێك دوعای بەخێر بۆ براکەت بکەیت فریشتەکە دەڵێ: ئامین وبۆ تۆش وەك ئەو} ([3]).**

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] رواه الترمذي والحاكم، قال النووي فى الرياض:قال الحاكم : صحيح الإسناد .

[3] رواه احمد ومسلم. و **بڕوانە:** الآداب الإسلامية للناشئة،ب٢/١٣٤،ومنهاج الصالحين،ب١ /٢٤٠،والآداب

## {نزاو پاڕانەوە هەڵبژاردەکانی قورئانی پیرۆز}

**ئەمەش هەندێکە لەنزاو پاڕانەوە هەڵبژاردەکانی قورئانی پیرۆز:**

**١-سورەی فاتیحە،چونکە نزا وپاڕانەوەی گەورەی تێدایە.**

٢-(ربنا لا تؤاخذنا إن نسينا أو أخطأنا) **هەتا کۆتایی سورەتەکە.**

٣-(ربنا لاتزغ قلوبنا بعد اذ هديتنا ........... انك انت الوهاب.) (آل عمران).

٤-(رب اجعلني مقيم الصلاة ومن ذريتي ربنا وتقبل دعاء، ربنا اغفرلي ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب). ( ابراهيم ).

٥- (رب ادخلني مدخل صدق واخرجني مخرج صدق واجعل لى من لدنك سلطاناً نصيراً) (الاسراء).

٦-(ربنا آتنامن لدنك رحمة وهيء لنا من امرنا رشداً) ( الكهف ).

٧-(رب اشرح لى صدري ويسرلى امري) ( طه ).

٨-(رب زدني علماً) طه.

٩-(لا اله الا انت سبحانك انى كنت من الظالمين) الأنبياء.

١٠-(رب اعوذبك من همزات الشياطين و اعوذبك رب ان يحضرون). ( المؤمنون ).

١١-(ربنا آمنّا فاغفرلنا وارحمنا وانت خير الراحمين). ( المؤمنون ).

١٢-(ربنا هب لنا من ازواجنا وذرياتنا قرة اعينٍ واجعلنا للمتقين اماماً). ( الفرقان ) .

١٣-(رب وزعني ان اشكر نعمتك التي أنعمت عليّ وعلى والدي وان اعمل صالحاً ترضاه وادخلني برحمتك في عبادك الصالحين). (النحل ).

١٤-(ربنا اغفرلنا ولاخواننا الذين سبقونا بالإيمان ولاتجعل في قلوبنا غِلاً للذين آمنوا ربنا انك رؤف رحيم). ( الحشر ).

١٥-(رب اغفرلي ولوالدي ولمن دخل بيتي مؤمناً وللمؤمنين والمؤمنات). ( نوح ).

١٦-(قل أعوذ برب الفلق و قل أعوذ برب الناس).

---

الإسلامية ، محمود المصري،ل:٢١٦.

## {نزاو پاڕانەوە هەڵبژاردەکانی فەرمودەی پیرۆز}

**ئەمەش هەندێکە لەو نزاو پاڕانەوە هەڵبژاردانەی فەرمودەی پیرۆز:**

١-اللهم إنى أسألك الهدَى والتقَى والعفاف والغِنَى.

٢-اللهم مُصرِّف القلوب صرّفْ قلوبنا على طاعتك.(١).

٣-اللهم إنى أعوذبك من جَهْد البلاء ودَرْك الشقاء وسُوء القضاء وشَماتة الأعداء وعضال الداء وخيبة الرجاء.(٢).

٤-اللهم أصلِحْ لى دينى الذي هو عصمة أمرى، واصلحْ لي دنياي التى فيها معاشى، وأصلحْ آخرتى التى فيها معادي، واجْعَل الحياة زيادةً لى في كُلِّ خيرٍ، واجعل الموت راحةً لى من كُلِّ شرٍ.(٣)

٥-اللهم إنّى أعوذبك من زوال نعمتك وتحوّل عافيتك وفجأة نقمتك و أعوذ بك من جميع سَخَطك.(٤).

٦-اللهمّإنّى أعوذبك من العجز والكسل، والجبنوالبخل والهرم، والقسوة و الغفلة، والعيلة والذلة والمسكنة، وأعوذبك من الفقر، والكفر والفسوق، والشقاق والنفاق، والسمعة والرياء، وأعوذبك من الصمم والبكم، والجنون والجُذام والبرص، وسيّء الأسقام.(٥).

٧-اللهم آت نفسى تقواها، وزكّها أنت خير مَنْ زكّاها،أنت وليّها ومولاها.

٨-اللهم إنّى أعوذبك مِنْ علمٍ لاينفع ومِنْ قلبٍ لايخشع، ومِنْ نفسٍ لاتشبع ومِنْ دعوةٍ لايُسْتجابُ لها.(٦).

٩-اللهم إنّى أعوذبك من مُنْكَرات الأخلاق والأعمال والأهواء.(١).

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه البخاري و مسلم في صحيحهما.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] الجامع الصغير،١١٧/١ ،وقال:حديث صحيح.

[6] أخرجه مسلم في صحيحه.

١٠-اللهم انى أسألك موجباتِ رحمتك وعزائمَ مغفرتك والسلامةَ من كُلِّ إثمٍ، والغنيمةَمن كُلِّ بِرٍّ، والفوزَ بالجنة والنجاةَ من النار.(٢).

١١-اللهم إنّى أسألك حُبّك وحُبّ مَنْ يحبّك، والعمل الذي يبلغنى حبّك

اللهم اجعل حبيبك أحبّ إلىّ من نفسى وأهلى ومن الماء البارد.

١٢--اللهم اقسِمْ لنا من خشيتك ماتحول بيننا وبين معاصيك، ومن طاعتك ما تبلّغنا به جنّتك، ومن اليقين ماتهوّن علينا مَصائب الدنيا، اللهم متّعنا بأسماعنا وأبْصارنا وقوّاتنا ماأحْيَيْتنا، واجعله الوارث منّا، واجعل ثأْرَنا على مَنْ ظَلَمَنا وانصرنا على مَنْ عادانا، ولاتجعلْ مصيبتنا في ديننا، ولاتجعل الدنيا أكبر همّنا ولا مبلغ علمنا، ولاتسلّطْ علينا مَنْ لايرحمنا.(٣).

١٣- اللهم طهّرْنى بالثلج والبرد والماء البارد، اللهم طهّرْ قلبى من الخطايا كما طهّرت الثوب الأبيض من الدنس، وباعِدْبيني وبين ذنوبىكم اباعدتَبينالمشرقوالمغرب.

١٤- اللهم إنّى أعوذ بك من قلبٍ لايخشع ونفِس لاتشبع و دعاءٍ لايسمع وعلمٍ لاينفع، اللهم إنّى أعوذ بك من هؤلاء الأربع، اللهم إنّى أسألك عيشةً تقيّةً وميتةً سويّةً ومردًّا غيرمخزىّ.(٤).

١٥-اللهم اغفِرْ خطيئتى وجهلى، وإسرافى في أمرى، وما أنت أعلم به منى، اللهم اغفرلى جِدّى وهزلى، وخطئى وعمدى وكلّ ذلك عندى، اللهم اغفرلى ما قدّمتُ وما أخّرتُ، وما أسررتُ و ماأعلنتُ، وما أنت أعلم به منّى، أنت المقدّم، وأنت المؤخّر، وأنت على كلّ شىء قدير.(٥).

---

[1] روا الترمذي، برِوانه:ترتيب أحاديث الجامع الصغير،٣ /٣٠٦،وقال:حديث حسن.

[2] اخرجه الحاكم(١/٧٠٦ ،رقم ١٩٢٥) وقال : صحيح على شرط مسلم .

[3] رواه الترمذي رقم:٣٥٠٢ ،وقال:هَذَاحَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

[4] أخرجه أحمد عن عبدالله بن أبى أوفى،قال المناوى : وإسناده حسن .

[5] أخرجه البخاري ومسلم.

{**سودێك**} لەكاتی دوعاكردندا سوننەتە ڕوو لە قیبلە و هەردو دەستەكانت بۆ ئاسمان بەرز بكەیەوە،ئەبوهریرە لەفەرمودەیەكی درێژدا هێناویێتی كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی {**...أنّ الرجل يُطيلُ السّفَرَ، أشعث أغبر، يمدّ يديه إلى السماء...**}[1] واتە:پیاوی وا هەیە گەشتەكەی درێژ دەكاتەوە، چڵكن وكوڵكنە، دەستەكانی بۆ ئاسمان درێژدەكاتەوە ودوعا دەكات ...هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إنّ الله حَيّيٌ كريمٌ يستحي إذا رَفع الرجلُ إليه يَدَيْه أَنْ يَرُدّهما صِفْراً خاليتين**}[2].واتە:خواجل جلالە زیندوە وبەخشندەیە، كاتێك كەسێك دەستەكانی بەرز بكاتەوە بۆلای خواجل جلالە شەرم دەكات كە بە نائومێدیەوە وەڵامی نەداتەوە[3].

## هەژدەیەم:ئادابی تۆبەو پەشیمان بونەوە لەگوناهو تاوان:

تۆبەو پەشیمان بونەوە لەگوناهو تاوان ئەوەیە كەمرۆڤی مسوڵمان لەوگوناهو تاوانانەی كەبەدڵ و بە ئەندامەكانی ئەنجامی داوە یەكسەر پەشیمان ببێتەوە،ووازیان لێ بهێنێ، وعەزمی وابێت كەجارێكی تر نەگەرێتەوە بۆسەریان، خواجل جلالە فەرمویەتی:﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور: ٣١

واتە: برواداركان تێكڕا بگەرێنەوە بۆ لای خوا. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**كُلُّ ابْنِ آدمَ خطّاءٌ وخيرُ الخطّائين التوّابُونَ**}.

واتە: مرۆڤەكان هەموویان تاوانكارو هەڵەكارن وەچاكترینی تاوانكارو هەڵەكاران تۆبە كارانن.([4])

**وە لەبەر گرنگی ئەو بابەتە پێویستە ڕەچاوی ئەم ئادابانە بكرێن:**

١- زۆر بە ئیخلاص وخۆیەكلاكردنەوەوە بۆ خوا جل جلالە لەهەموو گوناهەكانی تۆیە بكات، ئەمجا خوا جل جلالە تۆبەكەی لێ قەبول دەكات،خوا جل جلالە فەرموویەتی:

---

[1] الإمام مسلم مع النووي(٧ /٩٩ ) حديث رقم:(١٠١٥).

[2] الترمذي مع التحفة(٩ /٥٤٤).

[3] موسوعة الآداب الإسلامية للشيخ أيمن المزين والشيخ محمد حسان ل:٤١٥ .

[4] موسوعة الآداب الإسلامية، ل:٣٥.

﴿ ۞ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الزمر: ٥٣ **واتە: ئەگەر ئێوە تۆبە بکەن خوا جل جلاله لە هەموو گوناهەکانتان دەبورێ تێکڕا.**

**٢- پێویستە پەلە بکەیت و خێرا تۆبە بکەیت و پەشیمان ببیەوە لەوگوناهەی کردوتە، خوا جل جلاله فەرموویەتی:** ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾النساء: ١٧.

**واتە: هەر خوا تەوبە وەردەگرێ لەوکەسانەی کە بەنزانیەوە گوناهو وتاوان دەکەن، پاشان زوو تەوبەی لێ دەکەن.وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { إذا أخطأ العبدُ خطيئةً نُكت في قلبه نكتة سوداء، فإن هو نَزَع واستغفر صُقل....}(١)،واتە: کاتێك مرۆڤ تاوانێك بکات، خاڵێکی ڕەش لە سەر دڵی دەدرێ، جا ئەگەر خێرا وازی لەگوناهەکە هێناو تۆبەی کرد، ئەوە دڵی صاف وپاك دەبێتەوە، وەئگەر گوناهی تر بکات ئەوە خاڵە رەشەکە زیاد دەکات هەتا هەموو دلی ژەنگی گوناە دەیگرێتەوە.**

**٣-مەرجە بۆ وەرگرتنی تۆبەکەت یەکسەر واز لەگوناهەکە بهێنی، وعەزمت وابێ جارێکی تر نەچیەوە بەلای ئەوگوناهەدا.(٢).**

**٤-هەر کەتۆبەت کرد، خێرا مافەکانی خەڵك و ماڵ و سامانیان بدەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :{ مَنْ كان لأخيه عنده مظلمةٌ من مالٍ، أو عِرْضٍ، فليتحلَّله اليوم، مِنْ قبل أن لايكون دينارٌ ولا درهمٌ إلاّ الحسنات والسيئات}(٣).واتە: هەرکەسێك ستەمی لەکەسێك کردبێ، با ئەمڕۆ گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات، پێش ئەوە بگاتە ئەوکاتەی کە دینار و درهەم نامێنێ،تەنها چاکە وخەراپە نەبێ.**

---

(١) رواه ابن حبان والنسائي والحاكم وحسنه الألباني في صحيح الترغيب(١٦٢٠).

(٢) منهاج الصالحين ب٢ / ل: ٦٥.

(٣) أخرجه البخاري في صحيحه.

٥- هەرکاتێك خەراپەیەکت کرد بڵاوی مەکەوە وخێرا بەدوایدا چاکەیەك بکە، پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {**وأتبِعِ السيِّئةَ الحسنةَ تَمْحُها**}([1]).واتە: کاتێك خەراپەیەکت کرد بەدوایدا چاکەیەك بکە، بۆ ئەوە چاکەکە خەراپەکە بسرێتەوە.

٦- با تۆبەکردنەکەت تەنها لەبەر خوابێ جلجلالە، وهەوڵبدە تۆبەت نەشکێنیەوە بەگوناهکردن،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ياأيّها الناس توبوا إلى الله، فإنّي أتوب إلى الله في اليوم مائة مرة**}([2]).واتە: ئەی خەلکینە تۆبە بکەن، چونکە من لەرۆژێکدا صەد جار تۆبە دکەم .

[1] تخريج كراوە.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

# بەشی سێیەم

**ئەم بەشە زیاتر تایبەتە بە قۆناغی گەنج و لاوەکانی زانکۆ و پەیمانگاکان وهەموو فەقێی حوجرەکان و قوتابیانی زانستە شەرعیەکان، کوڕان و کچان، پێویستە خۆیانی پێ بڕازێننەوەو بە جوانی بیانکەن بە سلوك و ڕەوشت و مەلەکەی ژیانیان.**

## یەکەم: ئادابەکانی بەڕۆژوو بوون( الصیام ):

بەڕۆژووبون پایەیەکە لەپایەکانی ئاینی ئیسلام، زۆر سودی گیانی و دەرونی و تەندروستی تێدایە، بۆ تاك و بۆ کۆمەڵ سودێکی گشتی و پیرۆزیەکی گەورەی تێدایە، لەسەر نەتەوەکانی پێشو ولەسەر نەتەوەی ئیسلام فەرزکراوە، وەك قورئان فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ (البقرة: ١٨٣).

بەڕۆژوو بوون لەمانگی رەمەزاندا فەرزکراوە، مانگی رەمەزانیش قورئانی تێدا دابەزیوە ئەو قورئانەی کە بۆ راسترین ڕێبازی هیدایەت و سەرفیرازی مرۆڤی شارەزاکردووە.

فەرزکراوەکانی تر بریتین لە کارو کردارێکی دیاریکراو، بەڵام رۆژوو وازهێنانە لەئارەزوەکانی مرۆڤ ، بۆیە پاداشتەکەی تایبەتە بەخوای پەروەردگارەوە لەفەرموودەی قودسیدا خواجل جلاله فەرمویەتی: {**كُلّ عَمَل ابْنِ آدم له إلاّ الصّومَ، فإنّه لي وانَا أجْزِي به**}[1] واتە: هەموو کارەکانی مرۆڤ سودەکەی بۆخۆیەتی تەنها رۆژوو نەبێت، خوا فەرمویەتی رۆژوو هەر بۆ منە و هەرمنیش پاداشتی دەدەمەوە.

بەڕۆژوو بوون گەشتێکی گیانی و روحی پیرۆزەو قوتابخانەیەکی تەندروستی نمونەییە یارمەتی جەستە دەدات بۆ لابردنی ژەهری و زیادیەکانی جەستەی مرۆڤ، فێری خۆپارێزی دروستی دەکات، ئەمە لەگەڵ سودەکانی رەوشتی و گیانی وەك: ڕاهاتن لەسەر ئارامگرتن، و پێچەوانە کردنی نەفس و شکاندنی ئارەزوەکانی، وریزگرتن لە یاسای خوا و پابەند بوون بەکۆمەڵی خەڵکەوە ، چاکەکردن لەگەڵ هەژاران و نەدارانداو،

---

[1] حدیث متفق علیه.

و پاکی دڵ و پاککردنەوەی دەرون، و خۆخەریك کردن بەتام و چێژی خواپەرستییەوە، و بەزیکرو یادی خواوقورئان خوێندنەوە، ئەمە راسپاردەو وەسیەتی پێغەمبەری خوایە بۆ ئەبو ئومامە کە پێی فەرموو: {عليك بالصيام فانّه لامثلَ له} [1] واتە: ئەی ئەبو ئومامە بەڕۆژوو بە چونکە رۆژوو وێنەی نیە.[2].

## لەبەرئەوە ڕۆژوو چەند ئادابێکی تایبەتی هەیە پێویستە ئێمە چاودێری ئەو ئادابانە بکەین و ئەنجامیان بدەین:

١-کاتێك کە مانگی یەك شەوەت دیت ئەم دوعایەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنە: {**اللهم أهِلّه علينا بالأمْن و الإيمان والسلامة والإسلام، ربّي و ربّك الله، هلالَ رُشْدٍ وخيرٍ**} [3]. واتە: خوایە ئەم مانگە بە ئەمن وئەمان وخێرو خۆشی و باوەڕو ئیسلامەتیەوە بیهێنیەوە بۆ لامان.

٢-خۆ ئامادەکردن بۆ بەرۆژبوون بەنییەت هێنانی هەموو شەوێك، عمری کوڕی خەتتاب گوتی: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: {**إنّما الأعْمَال بالنّيَات و إنّما لكلّ امْرئٍ مانوَى**} [4] واتە: هەموو کردەوەکان بەنیازەکەیانەوە بەندن، وە هەموو مرۆڤێك پاداشتی ئەو کردەوەیەی دەست دەکەوێتەوە کە نیازی کردووە.

٣-لەرۆژوگرتندا تەنها نیازو مەبەستت خوای پەروەردگار بێت،وخۆت هەر بۆ ئەو یەکلاکردبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايصُومُ عبدٌ في سبيل الله إلا بَاعَدالله بذلك اليوم النارَ عن وَجْهه سبعين خريفاً**} [5] واتە:هەر کەسێك لەبەرخوا یەك رۆژ بەرۆژو بێت، ئەوە خوای پەروەردگار بەهۆی ئەو رۆژووەوە حەفتا پایز ئاگری دۆزەخی لێ دور دەخاتەوە وە فەرمویەتی: {**مَنْ صَام رمضانَ ايماناً واحتساباً، غُفر له ماتقدّم مِنْ ذنبه**} [6]

---

[1] رواه النسائي كتاب الصيام، وابن حبان في صحيحه، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(٩٨٦) . .

[2] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ :ل:٤ –٥. .

[3] رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

[4] حديث متفق عليه.

[5] حديث متفق عليه.

[6] حديث متفق عليه.

واتە: هەر کەسێك مانگی رەمەزان بەبڕواو بەداوای پاداشتەوە بەرۆژو بێت، ئەوە لەگوناهەکانی رابردووی دەسڕدرێتەوە.

٤-بەهۆی پارشێوکردنەوە خۆت بەهێز بکە بۆ رۆژوگرتن، ئەنەس- گێرایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{تسَحّروا فإنّ في السُحُور بركةً}([1]) واتە: پارشێو بکەن، چونکە پارشێوکردن فەڕو پیرۆزیە. پارشێو کردن رۆژوەوان بەهێز دەکات بۆ رۆژوگرتن و چالاکی دەکات وەبەهۆیەوە رۆژوگرتن ئاسان دەبیت،وەئەم کاتە زۆر پیرۆزە ،چونکە کاتی شەونوێژ وژیکر ودوعا وپاڕانەوەیە.([2]).

٥-کاتی پارشێو- سحر - بقۆزەوە بۆ نوێژکردن و زیکر ویادی خواو پاڕانەوەو قورئان خوێندن خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ (الاسراء: ٧٩) واتە: لەبەشێکی شەودا شەونوێژ بکە، زیادەیە بۆ تۆ، نزیکە کە پەروەردگارت بتباتە پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو چاکەوە، چونکە کاتی پارشێو کاتی دابەزینی خوا یە وکاتی دەرکەوتن وتەجەلای ئەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: لەم کاتەدا خوا دەفەرمێ:{مَنْ يدعُوني فأستجيبَ له، من يستغفرني فأغفر له،من يسألني فأعطيه، حتى يطلع الفجر}،لەپێشەوە ماناکەی کراوە..

٦-کاتێك کە زانیت کاتی رۆژو شکاندن هاتووە خێرا رۆژوەکەت بشکێنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{لايزال الناسُ بخَيْرٍ ماعَجّلوا الفطر و أخّروا السُحُور}([3]) واتە: خەڵك هەر لەچاکەدایە مادام زوو رۆژووەکەیان بشکێنن. و پارشێوکردنەکەیان دوا بخەن.

٧-لەکاتی رۆژوو شکاندندا زۆر دوعاو نزا بکە، ئیبن عمر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّ للصائم عند فطره دعوةً ماتردّ}([4])واتە: رۆژوەوان لەکاتی رۆژو شکاندنیدا نزایەکی وای هەیە کە ڕەت ناکرێتەوە.

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

[2] منهاج الصالحين،ب١ /ل:١٩٦.

[3] حديث متفق عليه.

[4] رواه ابن ماجه مرفوعا بإسناد حسن.

ئیبن عمرگوتی: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕۆژو شکاندندا ئەم دوعایەی دەکرد ودەیفەرموو : {**اللَهمَ إنّي لك صُمْتُ، وعلى رزقك أفطرتُ،ورحمتك رجوت، ذَهَبَ الظَمأُ وابتلّتِ العُرُوقُ، و ثَبَتَ الأجْرُإن شاء الله**}(١).

واتە: ئەی خوایە من بۆ تۆ بەڕۆژو بووم، و لەسەر ڕیزق و ڕۆزی تۆ ڕۆژوم شکاند، تینوایەتیم ڕۆیشت و ڕەگو دەمارەکانم تەڕبونەوە و ئەجرو پاداشتەکەش جێگربوو ئەگەر خوا حەز بکات.

٨-بەخورما ڕۆژوەکەت بشکێنە، ئەگەر خورما نەبوو بەئاو، ئاویش زۆر نەخواتەوە، ئەمجا نوێژی مەغریب بکات،ونان بخوات، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا كان أحدُكُم صائماً فليفطرْ على التمر، فإنْ لم يجدْ التمر فعلى الماء، فإنّ الماء طهورٌ**}(٢) واتە: ئێوە بەخورما ڕۆژوەکەتان بشکێنن، ئەگەر خورما نەبو، بەئاو بیشکێنن، چونکە ئاو پاکە.

٩-لەمانگی ڕەمەزاندا زۆر مەخۆ،بۆ ئەوە سودە تەندروستیەکانی ڕۆژوت لەکیس نەچێت و تەندروستی تەواو بەدەست بهێنی.

١٠- لەمانگی رەمەزاندا خێرو خێرات و چاکە زۆر بکە، ونوێژی تەراویح و خوا پەرستیەکانیتر جێبەجێ بکە، دڵی هەژارو نەدارو قەرزارو کەمدەستەکان خۆش بکە و دەستیان بگرە، چونکە لەمانگی رەمەزاندا خێرو چاکە کردن پاداشتی زۆرترو گەورەتر، بە تایبەت قورئان خوێندنەوە ودیراسە کردنی قورئان زۆر گەورەیە، لەم بارەوە ئیبن عەباس گێڕایەوە گوتی: {**كان رسُولُ الله ﷺأجودَ الناس، وكان أجود مايكون في رمضان حين يلقاه جبريل، وكان يلقاه في كلّ ليلة من رمضان فيُدراسُهُ القرآنَ، فلرسولُ الله ﷺ أجودُ بالخير من الريح المرسلة**}(٣) واتە: پێغەمبەر ﷺ لەهەموو خەڵك سەخی تر بووە، سەخاوەتیەکەش لەمانگی رەمەزاندا لەکاتێکدا بووە کە جبریل پێی دەگەیی، وە لەهەموو شەوێکی مانگی رەمەزاندا جبریل پێی دەگەیی و دیراسەی قورئانی پێ دەکرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا لەبا تیژتر بوو بۆ خێرو چاکەکردن.

---

[١]رواه ابو داود والنسائي، بروانه: الجامع الصغير، ١ /١٨١وقال:حديث صحيح.

[٢]رواه احمد في مسندة و الترمذي(٧٠٠) وقال:حديث حسن،والحاكم وقال:صحيح على شرط البخاري.

[٣]أخرجه البخاري في صحيحه.

١١-خۆت بگرەوە لەهەموو ئەو شتانەی کە لەگەڵ حەقیقەتی ڕۆژوەکەتدا یەکناگرێتەوە وەك: قەدەغەکراوەکان، گوناهو تاوانەکان، غەیبەت ودوو ڕوویی ودرۆ ودەلەسەو غەش و ناپاکی و ڕەوشتی خراپ و زەرەرو زیان گەیاندن بەخەڵکی، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ لم يَدَعْ قولَ الزُّورِ والعملَ به فليس لله حاجةٌ في أَنْ يَدَعَ طعامَه وشرابَه}([1])
واتە: هەر کەسێك واز لەقسەی درۆو ئیش کردن پێی نەهێنێ، ئەوە خوای پەروەردگار هیچ پێویستیەکی بەو کەسە نیە کەوا واز لەخواردن و خواردنەوە بهێنێت، وبەخۆڕایی دەمی خۆی بگرێتەوە. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ليس الصيامُ من الأكلِ والشُربِ إنّما الصيام مِنَ اللغو والرفث، فإنْ سابّه أحدٌ أوجَهِل عليك فقل:إنّي صائمٌإنّي صائمٌ}([2])
واتە: ڕۆژوو ئەوەنیە لە خواردنو خواردنەوە بەرۆژ بیت، بەڵکو ڕۆژو ئەوەیە لەقسەی زیادە وگوناهو تاوان بەڕۆژو بیت، جا ئەگەر کەسێك جنێوی پێدای یان نەزانی لەسەر کردی تۆ بڵێ: من بەڕۆژوم من بەڕۆژم.
١٢-لەدەی کۆتایی مانگی رەمەزاندا زۆر هەوڵ بدە بۆ خواپەرستی و مانەوە(اعتكاف) لە مزگەوتدا و قورئان خوێندن و دیراسەکردنی قورئان، عائیشە گێڕایەوە گوتی: {كان إذا دَخَلَ العشرُ الأواخرُ أحيا الليلَ و أيقظَ أهلَه وشَدَّ المئزرَ}([3]) واتە: کاتێك کە ئەو دە شەوەی کۆتایی ڕەمەزان دەهات،پێغەمبەرﷺشەوەکانی هەموو زیندو دەکردەوە، خێزانەکانیشی بەخەبەر دەکردەوە،داوێنیشی هەڵدەکردو نزیك خێزانەکانی نەدەکەوتەوە لە ریوایەتێکی ئیمام مسلم دا هاتووە {كان يجتهد في العشر الأواخر مالا يجتهد في غيره} واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی کە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا خۆی ماندو دەکرد لەکاتەکانی تردا ئەوها خۆی ماندوو نەدەکرد.
١٣-هەوڵ بدە بۆ گەیشتن بەشەوی قەدر بەمانەوە لەمزگەوتدا و بەخواپەرستی زۆر و بە قورئان خوێندن ودیراسەکردنی، خێرو سەدەقەی زۆر ودەرس ووتنەوەو ئامۆژگاری کردنی خەڵك ئەبوهریرە گێڕایەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ قام ليلة القدر إيماناً واحتساباً غُفرله ماتقدّم مِنْ ذنبه}([4]).

---

١ أخرجه البخاري في صحيحه.

٢ الجامع الصغير،٢ /٢٤٩،وقال:حديث صحيح.

٣ أخرجه البخاري ومسلم.

٤ رواه البخاري ومسلم.

عائیشه ڕەزای خوای لێ بێت گوتی: گوتم ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێك من زانیم كە ئەو شەوە شەوی قەدرە بڵێم چی؟ ئەویش فەرموی بڵێ :{**اللهم إنكَ عفوٌ تحبّ العفوَ فاعْفُ عنّي**}([1]).

١٤-ئیعتیكاف ومانەوە لەمزگەوتدا بەتایبەت لەو دە شەوەی كۆتایی ڕەمەزاندا سوننەتێكی گەورەیە،ئەبو هریرە گێڕایەوە{**أنّ النبيّ ﷺ كان يعتكف العشر الأواخر من رمضان حتى قَبَضَه الله عزّ وجلّ**}([2]).

واتە:پێغەمبەر ﷺ لەدەشەوی كۆتایی مانگی رەمەزان لەمزگەوتدا ئیعتیكافی دەكرد ، هەتا وەفاتی كرد.[3]

١٥-سەرفیترە دان بەهەژارو نەدارەكان لەسەر گەورەو بچوك فەرزە لەسەرەتای مانگی رەمەزانەوە دروستە بدرێت، ئیبن عباس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ زەكاتی سەر فیترەی فەرز كرد بۆ پاكبونەوەی ڕۆژوەوان لەگوناهو تاوان، وخواردنی هەژارو نەدارەكانیشە، جا هەركەس لەپێش نوێژی جەژنەوە ئەو زەكاتە دەربكات ئەوە زەكاتێكی وەرگیراوە، وهەر كەسێكیش لەدوا نوێژی جەژنەوە ئەو زەكاتە دەربكات ئەوە سەدەقە و خێرێكە لە سەدەقەو خێرەكان.

١٦-سوننەتە نان بدەی بە ڕۆژوەوانەكان ، ئەوەت نەتوانی خورما یان ئاویان بدەیە، چونكە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**مَنْ فطّر صائماً كان له مثلُ أجره، غير أنّه لايَنْقُصُ من أجر الصائم شيئاً**}([4]) .

واتە: هەر كەسێك ڕۆژوەوانێك نان و ئاوبدا ئەوە خێرو پاداشتێكی دەست دەكەوێ وەك خێرو پاداشتی ڕۆژوەوانەكە بەبێ ئەوەی لەخێرو پاداشتی ئەو كە ببێتەوە.

---

[1] رواه احمد وابن ماجه والترمذي وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة رقم:(٣٣٣٧).

[2] رواه أحمد (٧٧٧١ ) بإسناد صحيح، والترمذي وقال:حديث حسن صحيح.

[3] منهاج الصالحين ،ب١ /ل:٢٠٠ .

[4] رواه الترمذي رقم:(٨٠٧) ، بروانة: الجامع الصغير، ٢ /٣٣٩وقال: حديث صحيح.

## پاڵفته :

**ئادابەکانی رۆژوو بەکورتی ئەمانەن :**

١-چاوگرتنەوە لەتەماشاکردنی نامەحرەم.

٢-پاراستنی زمان لەهەموگوفتارە خەراپەکان،وخەریك کردنی بەزیکرو یادی خواو و قورئان خوێندنەوە.

٣-گویٚ نەگرتن لەهەرچی شتی ناپەسەندو خراپ هەیە.

٤-دەست و قاچ و سك بپارێزی لەهەرچی خراپەو شتی شوبهەدار هەیە.

٥- خواردنی زۆر نەخۆیت.

٦-لەدوا شکاندنی رۆژەوەکەتەوە دڵت بەوەوە بێت ئایا رۆژوەکەت وەرگیراوە یان نا، زۆر بپارێتەوە بۆ ئەوە رۆژوەکەت لیٚ وەربگیرێت.([1])

{**سود وبەهرەیەك**} هەندێك لەسودەکانی رۆژوگرتن ئەمانەن:

أ-ڕۆژوگرتن لەگەورەترینی ئەوپەرسشتانەیە کەمرۆڤ خۆی پیٚ لەخوا نزیك بکاتەوە.

ب-رۆژوگرتن گەورەترین مەدرەسەیەکی ڕەوشتی وایە کە بڕوادار لەسەر چەندەها سیفات و خەصلەتی جوان وچاك خۆی ڕادەهێنیٚ.

ج- رۆژوگرتن مرۆڤ دەگەیەنێتە پلە وپایەی پارێزکاران.

د- رۆژوگرتن شیعار ودروشمی پیاو چاکانە.

ه- رۆژوگرتن وێنە وهاوتای نیە.

و-خوا وفریشتەکان صەلاوات لەسەر رۆژوەوان دەدەن.

ز- رۆژوگرتن دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان.

ح-دوعاو نزای رۆژوەوان ڕەتبونەوەی نیە.

ط-بۆنی دەمی رۆژوەوان لەبۆنی میسك خۆشترە بەلای خواوە.

ی- رۆژوەوان دوجەژنی هەیە،یەکیان لەدونیادا،ئەویتریان لەدوارۆژدا.

---

[1] بروانة: آداب المسلم ل:٤٦-٤٧ . والآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ /ل:٦، ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:١٩٨ -٢٠٠ . و الآداب الإسلامية،محمود المصري ل:١٨٥.

ك- رۆژوگرتن پەردەیە لەنێوان بڕوادار و لەنێوا ئاگری دۆزەخدا.

ل- رۆژوگرتنلەرۆژی دواییدا تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات.

م-دەرگای (رەییان) لەبەهەشتدا تایبەتەبەرۆژوەوانانەوە.

ن-رۆژوگرتن لەزستاندا دەستکەوت وغەنیمەتی بڕوادارانە.([1]).

ئەمانە جگە لەسودەگەورەکانی رۆژو بۆ هەمو جەستەی مرۆڤ کە زانستی تەندروستی (**علم الطبّ**) باسی کردوە،ولەژمارە نایەن هەموی تایبەتن بە رۆژوگرتنەوە.

## دوهەم: ئادابەکانی زەکاتدان و خێر وسەدەقە:

زەکاتدان یەکێکە لەهەرە پایە گرنگەکانی ئاینی ئیسلام، ئەو زەکاتە مافێکی ڕەوای هەژارو نەدارەکانە، خوای پەروەردگار خستویەتیە ناومالّو سامانی دەولەمەندەکانەوە، زەکات واتە: زیادکردن و گەشەکردنو پاکبونەوە، چونکەبەهۆی زەکاتدانەوە وبەهۆی دوعاو پارانەوەی هەژارانەوە مالّ وسامان گەشە وزیاد دەکات وپاك دەبێتەوە.

**زەکاتدان کۆمەڵێك ئادابی هەیە، پێویستە چاودێری بکرێن و ئەنجام بدرێن بەم شێوەیە کە باسی دەکەیەن:**

١-زەکاتدان تەنها لەبەر خاتری رەزامەندی خوا بێت و هیچ مەبەستێکی تری تێدا نەبیت.

٢-بزانە ئەو زەکاتە مافێکە فەرزە بۆ هەژارونەدارەکان، پێغەمبەر ﷺ کاتێك مەعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ ولاّتی یەمەن پێی فەرموو: {**فإن هم أطاعوا لذلك، فأَعْلِمْهُم أنّ الله قد افترض عليهم صدقةً تُؤْخذُ من أغنيائهم فترُدّ على فقرائهم**}([2]). واتە: ئەگەر ئەوەیان بەقسەکردی ئەوە پێیان ڕاگەیەنە کەخوا عزوجل خێرو سەدەقەیەکی لەسەر فەرزکردون و لەدەولەمەندەکان وەردەگیرێو دەدرێتەوە بە هەژارەکان.

٣-پێویستە دەولەمەند چاك مالّو سامانەکەی خۆی کۆبکاتەوەو پاشان مالّو سامانەکان هەریەکەیان بەپێی جۆرەکەیان زەکاتەکەیان لێ دەربکات.

---

[1] الآداب الإسلامية ،للشيخ محمود المصري،ل:١٨٧ -١٨٨.

[2] حديث متفق عليه.

٤- زەکاتدان مرۆڤی مسوڵمان لە ڕەزیلی و پیسکەیی پاك دەکاتەوە، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ..... ﴾ (التوبة: ١٠٣).

واتە: لەماڵو سامانەکەیاندا خێرو سەدەقەیەکیان لێ وەربگرە بۆئەوە ئەو خێرو سەدەقەیە پاکژیان بکاتەوە. هەروەها عائیشە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ما خالطت الصدقة مالاً قطّ إلاّ أهلكته**}(١) واتە: خێرو سەدەقە تێکەڵاوی هەر ماڵ و سامانێك ببێ ئەوە ئەو ماڵ و سامانە دەفەوتێنێ.

٥-بزانە خێروسەدەقەکردن ماڵ و سامان کەم ناکاتەوە، بگرە ماڵ و سامان زیاتر دەکات، ئەبوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مانَقَصتْ صدقةٌ من مالٍ، ومازاد اللهُ عبداً بعفوٍ إلاّ عزاً، وماتواضع أحدٌ لله، الاّ رفعه اللهُ عزوجل**}(٢) واتە: خێرو سەدەقە ماڵ و سامان کەم ناکاتەوە، وە خوای پەروەردگار بەندەی خۆی بەهۆی لێبوردنیەوە لەخەڵك هەر سەروەری بۆ زیاد دەکات، وە هەر کەسێك ملکەچی بۆ خوای پەروەردگار بنوێنێ ئەوە خوا ئەو کەسە بەرز دەکاتەوە.

٦-پێویستە کاتێك بۆ دەرکردنی زەکاتەکەت دیاری بکەیت بۆ ئەوە لەو ڕۆژە تێپەڕ نەکات، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ﴾ (الانعام: ١٤١)

واتە:لەرۆژی دورینەوەدا هەقەکەی خۆی لێبدەن واتە:زەکاتەکەی بدەن.

٧-لەپاکترین و چاکترین ماڵو سامانەکەت زەکاتەکەی لێ دەربکە، بەتایبەت باهەر لەماڵی حەلالْ بێت، لەم بارە خوا عزوجل فەرمویەتی:

﴿ لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ .... ﴾ (آل عمران: ٩٢) واتە: بەچاکە ناگەی هەتا لەو ماڵو سامانەدا کە خۆشتدەوێ لێی سەرف نەکەی و نەیدەی بەهەژارو نەدارەکان.

٨-هەوڵ بدە خێرو زەکاتەکەت بەنهێنی بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**سبعةٌ يظلّهم اللهُ في ظلّه يوم لاظلّ إلا ظلّه.... ورجلٌ تصدّق بصدقةٍ فأخفاها حتى لاتعلم شمالُه ماتنفق يمينُه**}(٣) واتە: حەوت تاقم لەژێر سێبەری خوادان لەرۆژێکدا تەنها سێبەری ئەو

---

[١] أخرجه البخاري في صحيحه.

[٢] أخرجه مسلم في صحيحه.

[٣] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

دەمێنێ، فەرموی: حەوتەمەکەیان کەسێکە کە خێرو سەدەقەیەك بکات وابیشارێتەوە کە دەستی چەپی بەوە نەزانێ کە دەستی ڕاستی سەرفی دەکات.

٩-بەو خێرو زەکاتەی کە دەیدەی بەهەژارو نەدارەکان منەتیان لەسەر مەکە، یان لە بەرامبەر خێرو زەکاتەکەوە ئیشیان پێ مەکە، خوا عزوجل فەرمویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ .... ﴾ (البقرة: ٢٦٤) واتە: ئەی بڕوادارەکان ئێوە سەدەقەو زەکاتەکەتان بەهۆی منەتکردن و ئەزیەتدانەوە بەتاڵ مەکەنەوە.

١٠-سوننەتە مرۆڤی موسڵمان خێرو زەکاتەکەی بەخزمەکانی بدا پلە بەپلە لەنزیکی دا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الصدقة على المسكين صدقةٌ، وعلى ذي القرابة اثنتان: صلةٌ و صدقةٌ**}[1] واتە: خێرو سەدەقە بۆ هەژارو نەدار هەر سەدەقەیە، بەڵام سەدەقە بۆ خزم دو شتە: هەم پەیوەندی خزمایەتیە، و هەم سەدەقەیە.

**{بەهرەیەك} شێخ عبدالرحمن سیوطی-رحمه الله- گوتویەتی:**

خێرو سەدەقە بۆ هەژاری بەهێز، یەك بەدەیە.

خێرو سەدەقە بۆ کوێرو پەککەوتە، یەك بەحەفتایە.

خێرو سەدەقە بۆ خزمەکان، یەك بەهەزارە.

خێرو سەدەقە بۆ دایكو باوك یەك بەسەد هەزارە .

خێرو سەدەقە بۆ زانست و ئەهلی زانست، یەك بەملیۆنە.[2].

١١-بگەڕێ بەشوێن ئەو هەژارانەی کە بۆ خۆیان سواڵ ناکەن،وخاوەن ماڵ ومنداڵن،وپیاو صالح وچاکن،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لاتصاحِبْ الاّ مؤمناً ولا يأكُلْ طعامَك إلا تقيٌّ**}[3].

واتە: تەنها هاوڕێیەتی مرۆڤی بڕوادار بکە، تەنها با مرۆڤی پارێزکار نان و خواردنت بخوات.

---

[1] أخرجه النسائي (٢٥٨٢ ) و الترمذي (٦٥٨ ) وهو حديث صحيح.

[2] **بڕوانە**: الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل:٢٩.

[3] رواه أحمد والنسائي وأبو داود و هو حديث صحيح وصححه ابن حبان(٢٠٤٩)وأخرجه الترمذي (٢٣٩٧) و قال: حديث حسن.

١٢-ماڵ وسامان هەرچەندە کەم بێت خێری لێ بکەو خێرو سەدەقە بەکەم مەزانە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴾ (الزلزلة: ٧). بەئەندازەی توێسقاڵێك چاکە بکەیت پاداشتەکەی وەردەگریەوە.
هەروەها عدی کوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اتقوا النارَ و لو بِشِقِّ تمرةٍ**}(١) واتە: ئەگەر بەلەتکە خورمایەکیش بێت بیکە خێرو خۆت لەئاگر ڕزگار بکە.
١٣-دوعا بکە بۆ ئەو کەسەی کە چاکەی لەگەڵدا کردووی هەروەها سوپاس و ستایشی بکە لەم بارەوە خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (التوبة: ١٠٣) واتە: زەکات و سەدەقەیان لێ وەربگرەو دوعایان بۆ بکە دوعاکەی تۆ بۆ ئەوان ئارامی و خۆشیە.
ئەشعەشی کوڕی قەیس گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايَشكُرُ اللهَ مَنْ لايشكُرُ الناسَ**}(٢) واتە: کەسێك سوپاس و ستایشی چاکەی خەڵك نەکات ئەوە سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاریشی نەکردوە.
ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کرا بابەو کەسە بڵێ: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەوە ئەو کەسە ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی کردوە}.(٣).

**ئیمام غەزالی -رحمه الله- گوتویەتی: ئادابەکانی سەدەقە ئەمانەن:**
١)بەنهێنیەوە خێرو سەدەقە بکە، بۆ ئەوە ڕیاو ڕوپامایی تێدا نەبێ.
٢)ئەو کەسەی خێرو سەدەقەی پێ دەدەیت منەتی لەسەر مەکە، منەت کردن قەدەغەیە.
٣)لەپاکترین ماڵ وسامانت خێرو سەدەقە بکە، چونکە خوا پاکەو هەر شتێك پاك نەبێت وەری ناگرێ.

---
(١) أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.
(٢) أخرجه أبو داود في سننه(٤٨١١ ) والحديث صحيح.
(٣) الجامع الصغير،٢ /٣٣٥،وقال:حديث صحيح.

٤)بەڕوویەکی گەش‌و خۆشەوە خێرو سەدەقەکەت ببەخشەوەوبیدە بەکەسی شیاوی خۆی.

٥)خێرو سەدەقەکەت بدە بەکەسێك کە خێرو سەدەقەکەت گەشە بکات ئەو کەسەش یان زانایەکی لەخواترسە بەهۆی ئەو خێرو سەدەقەوە بانگەوازی پێ بکات و خواپەرستی و پارێزکاری پێ بەهێز ببێت، یان کەسێکە کە خاوەن ماڵ‌و منداڵێکی زۆرەو هەژارەو نەدارە.([1]).

## سێیەم: ئادابەکانی حەج و زیارەتی ماڵی خوا لەمەککەدا:

حەج کردن و زیارەتی ماڵی خوا لەشاری مەککە دا یەکێکە لەپایەکانی ئاینی ئیسلام،حەجکردن واتە: گەشتکردن بۆشاری مەککە بۆ بەجێهێنانی پەرستشی حەجکردن ،لەسەرەتاوە بەئیحرام دابەستن دەست پێدەکات،ئەمجا سوڕانەوە بەدەوری کەعبەی پیرۆزدا، وگەڕان لەنێوان صەفاو مەروەدا، ووەستان لەکێوی عەرەفەدا هەتا تۆزێك دوای ئاوابونی رۆژی نۆیەمی مانگی (**ذي الحجة**)، وپاشان سوڕانەوەی دەوری کەعبە رۆژی جەژنی قوربانی پیرۆز، یەکجار حەجکردن لەتەمەندا فەرزە لەسەر کەسێك کە بتوانێ بچێ بۆ ئەو شوێنە، بۆیە حەجکردن کۆمەڵێك ئادابی گەورەی هەیە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر سوربووە لەسەر جێبەجێ کرنیان لەحەجکردنیدا.

حەجکردن خێر وپاداشتی زۆر گەورەی هەیە لەلای خواجلجلالە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الحجّ المبرُور ليس له جزاءٌ إلاّ الجنّة**}([2]).واتە: حەجی وەرگیراو پاداشەکەی تەنها بەهەشتە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ حَجّ فلم يَرْفُثْ ولم يَفْسُقْ رَجَع مِنْ ذُنوبه كيومِ وَلَدتْه أُمُّه**}([3]).واتە: هەرکەسێك حەج بکا، وگوناهو تاوان نەکا ئەوە وەك ئەوکاتەی لیدێتەوە کەلەدایك بوە.

---

[1] بروانة: الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل: ٣٣، وآداب المسلم ل: ٤٢-٤٣.ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٠٤ - ٢٠٦ . والآداب الإسلامية،لمحمود المصري،ل:٢٠٨.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

بۆیە پێویستە ئێمەش وەك پێغەمبەری خوا بکەین و ئەو ئادابانە لەشوێنی خۆیدا و لەحەجکردنماندا بەجێیان بهێنین بەم شێوەیە:

١-پێش ڕۆیشتنت بۆ حەجکردن خۆتی بۆ ئامادە بکە، تۆبەیەکی باش بکە، واز لەگوناهو تاوانەکان بهێنە، گەردنی خۆت بەوکەسانە ئازاد بکە کەستەم و خراپەت لەگەڵدا کردوون وماڵ و سامانەکەیان بدەوە.[1].

٢-لەپێش ئیحرام دابەستندا سوننەتە خۆت بشۆرە یان تەیەموم بکە، نینۆکت بکەو توکی بن هەنگڵ و بەر بکەو هەرچی چڵك هەیە بەجەستەوە لای ببە.

٣-نییەت بهێنە و پاشان بەدەنگی بەرزو بەدانیشتنەوە وبەپێیانەوە بڵێ: {**لبّيك اللهم لبّيك، لبّيك لاشريك لك لبّيك إنّ الحَمدَ و النعمة لك و الملك لا شريك لك**}([2]).

٤-بۆ حەجکردن زەخیرە پەیدا بکە، وهەولبدە ئەحکام ویاساکانی حەج فێربەلەلای زانایانی شارەزا،بۆ ئەوە حەجکردنەکەت دروست بێت.[3]

٥-خۆت لەقسەو قسەلۆکی دونیایی و ڕابواردنەکانی دوربگرە بەتایبەت ڕابواردنە ناپەسەندو قەدەغەکراوەکان زۆر خۆتیان لێ دوور بگرە هەتا بکرێت.

٦-کاتێك کە گەیشتیە شاری مەککە دەست بەجێ بڕۆ تەوافێك بکە، وەك سەلام کردن لە کەعبەی پیرۆز، هەر کەچاوت بەکەعبە کەوت دەستت بەرزبکەوە و ئەم دوعایە بخوێنە: {**اللهم زِدْ هذا البيت تشريفاً و تعظيماً و تكريماً ومهابةً، وزِدْ مَنْ شرّفه و عظّمه ممَنْ حجّه أو اعتمره تشريفاً و تعظيماً و تكريماً وبِراً، اللهم انت السلام و منك السلام فحيّنا ربّنا بالسلام**} .

٧-لەیەکەم سوڕانەوی دەوری کەعبەدا دەست بدە بەردە ڕەشەکە (**الحجر الاسود**) ئەمەش بۆ پەیڕەوی کردنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەگەر قەرەباڵغ بو بۆت نەکرا دەستی بدەیە، هەر بەدەست ئاماژە بکە، ئەمەی کە گوتمان بۆ ئافرەتان سوننەت نیە مەگەر کەسی لێ نەبێ ئەو کاتە بۆ ئافرەتیش ئەوە سوننەتە.([4]).

---

[1] منهاج الصالحين،ب١ /٢١٤.

[2] أخرجه البخاري ومسلم، ومالك في الموطأ.

[3] منهاج الصالحين،ب١ /٢١٥.

[4] آداب المسلم، عبد الرحيم مارديني، ل:٤٨ .

٨- نابێ حاجی ئەزیەتو ئازاری کەس بدا لەکاتی تەوافدا ولەکاتی سەفا ومەروە و لەکاتی دەستدان لەبەردە ڕەشەکە ولەهەموو کارەکانی حەجکردندا چونکە پێغەمبەر ﷺ بەئیمامی عمری فەرموو: {**یاعمر إنّك رجلٌ قويٌّ لا تزاحم على الحجر، فتؤذي الضعيفَ، إنْ وجدتَ خلوةً، وإلاّ فهلِّلْ وكبِّرْ**}([1]) واتە: ئەی عمر تۆ پیاوێکی بەهێزی لەکاتی سەر بەردە ڕەشەکە ئەزیەتی خەڵك مەدە، ئەگەر چۆڵبو. بچۆ بۆلای بەردەکە ئەگینا (لا الە الا الله والله اکبر) بکەو مەچۆ بۆلای بەردەکە.([2]).

٩-ئادابەکانی ئیحرام دابەستن بەجێ بهێنە کە ئەمانەن:

أ/خۆت پاك بکەوە، وخۆت بشۆ، نینۆك بکە، بەرو بن هەنگڵ بتاشە.

ب/پۆشاکی دوراو دابنێ و لەبەری مەکە، پۆشاکی ئیحرام بپۆشە.

ج/خۆت بۆنخۆش بکە،وپۆشاکەکانیشت بۆنخۆشبکە،عائیشە گێراویەوە گوتی: هەر دەڵێ تەماشای بریسکەی عەترەکەی پێغەمبەر دەکەم بەسەریەوە لەکاتێکدا کە ئیحرامی پۆشی بوو.([3]).

د/دو ڕکات نوێژی سوننەتی ئیحرام بکە لەرکاتی یەکەمدا سورەی (الکافرون) بخوێنە لەدوا فاتیحەوەو لەرکاتی دووەمدا سورەی (ئیخلاص) بخوێنە لەدوا فاتیحەوە،ئیبن عمر گێڕایەوە گوتی: {**کان النبیﷺ یرکع بذي الحُلَيْفة رکعتین**}([4]) واتە: پێغەمبەر ﷺ لە زولحولەیفەدا دوڕکات نوێژی ئیحرام دابەستانی کرد.

١٠-ئادابەکانی سوڕانەوەی (طواف) لەدەوری کەعبەدا بەم شێوەیە جێبەجێ بکە:

أ/ کە دەستت کرد بەسوڕانەوەی (طواف) لەدەوری کەعبە ڕووبکە بەردە ڕەشەکە ودەستت بەرز بکەوە ودەست بە بەردەکەدا بهێنە.

ب/پەشتە ماڵەکەت بخە بن هەنگڵتەوە و لچکەکانیش بۆسەر شانی چەپت، چونکە پێغەمبەر و یارەکانی وایان کردووە.

ج/ڕۆیشتن بەشێوەی گۆرگە لۆقەیی بۆ نیشاندانی هێزو چالاکی.

---

[1] رواه الشافعي وأحمد في مسنده.

[2] اداب المسلم عبدالرحيم ماردينى ل: ٥٠.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

د/دەستدانی پایەی یەمانی، چونکە ئیبن عمر گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەهەموو پایەکانی کەعبەی پیرۆزدا تەنها دەستی دەدایە پایەی یەمانی.([1]).
ه/لەدوا سوڕانەوەی دەوری کەعبە دورکات نوێژی تەواف بکە.
١١-ئاداب وسوننەتەکانی کێوی عەرەفات بەم شێوەیە بەجیٚ بهێنە:
أ/کاتێك ویستت بڕۆی بۆ کێوی عەرەفات بەرۆژو مەبە وخۆت بشۆرە و بادەستنوێژت هەبێت.
ب/لەکێوی عەرەفەدا بەدەستەکانتەوە ڕوو لەقیبلە بکە، دەست بکە بەزیکر ودوعاو پاڕانەوە بۆخۆت و بۆ خەڵك،وزۆر پەشیمانی لەتاوانەکانتدەربڕە، وهەتا دوا مەغریب لەویٚ بمێنەوە.([2]).
ئوسامە گێڕایەوە گوتی:من لەدوا پێغەمبەرەوە بووم ﷺ لەکێوی عەرەفات کە دەستەکانی بەرزکردەوەو دەپاڕایەوە.([3]).
١٢- ئادابەکانی گەڕانەوەی گەشتی حەج بەم شێوەیە بەجیٚ بهێنە:
أ/ لەدوا تەواوبونی حەجەکەت پەلە بکە بۆ گەڕانەوەت بۆلای کەس و کارو منداڵەکانت چونکە پێغەمبەر ﷺ پەلەی کردووە.([4]).
ب/ زۆر دوعاو پاڕانەوە بکە ئیبن عمر دەڵیٚ: پێغەمبەر ﷺ کە لەحەج و عومرە دەگەڕایەوە سیٚ الله اکبری دەکردو پاشان دەیگوت: {**لا إله الله وحده لاشريك له لَهُ الملك وله الحمد، وهو على كلّ شيء قدير، آيبون تائبون عابدون ساجدون لربّنا حامدون، صَدَقَ اللهُ وعدَه ونَصَرَ عبدَه وهَزَمَ الأحزابَ وحده**}.([5]).
ج/ بەگوێرەی توانای خۆت دیاری بهێنە بۆ ماڵەوە وبۆ خزمان و برایان و خوشکان.
د/پێویستە حاجی لەدوا گەڕانەوەی لەو گەشتە پیرۆزە زۆر زۆر لەجاران باشتر بێت و بەرەو چاکترو باشتر بگۆڕێت.([6]).

---

[1]أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.
[2]منهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٢٠ .
[3]أخرجهأحمد ٢٠٩/٥(٢٢١٦٥) . والنَّسائي ٢٥٤/٥ وفي "الكبرى" ٣٩٩٣.
[4]أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.
[5]أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.
[6]الآداب الإسلامية ب٣ ل:٣٤ ،ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٠٥ .

## چوارەم: ئادابەکانی زیارەتی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا:

ا/پێش چون بۆ مزگەوتی مەدینە خۆت بشۆرە وپۆشاکی پاك لەبەربکە.
ب/زۆر بە لەسەرەخۆیی و ئارامییەوە بچۆ ناو مزگەوتی پێغەمبەرەوە ﷺ و دورکات نوێژی سەلام کردن لەمزگەوت بکە.
ج/پاشان ڕووبکە گۆڕی پێغەمبەر و هەردوو یارەکەی سەلامیان لێ بکە، زۆر دوعای بەخێر بکە بۆ خۆت و بۆ مسوڵمانەکان و کەس وکاری خۆت.
د/پێنج فەرزە نوێژەکانت لەمزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بکە، بۆت بکرێت هەموو ڕۆژێ سەردانی گۆڕستانی بەقیع بکە وسەردانی شەهیدەکانی ئوحود بکە، و سەردانی مزگەوتی (قباء) بکە. بەچاوی ڕێزەوە تەماشای مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بکە.
هـ-دەست لەگۆڕی پێغەمبەرەوە ﷺ مەدە، وخۆتی تێوە هەڵمەسو، وزۆریش لەدەوری گۆڕەکەی مەمێنەوە، باش نیە.([1]).

## پێنجەم: ئادابەکانی ئیش و کەسابەت و کڕین و فرۆشتن:

ئاینی پاکی ئیسلام ئاینی تێکۆشان وئیش کردنە، بەلام ئیش کردنی چاك وبەسود،پیاوەتی وئازایەتی لەئیسلامدا ئەوەیە مرۆڤی مسوڵمان بێتە مەیدانی ژیانەوە وتێکۆشەر بێت، وبۆ دەرگاکانی ڕیزق وڕۆزی پەیداکردن کۆششکار بێت، دڵیشی بەخواوە بەندبێت،ودلوهۆشیشی بەخواوە بەند بێت. وە بەراستی یاسای ئەم ژیانە داوای ئیشکردنوتێکۆشان دەکات، بۆیە پێویستە مرۆڤ ڕاپەڕێ بۆ تێکۆشان بەهەستی بەرزو چالاکیەوە، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الجمعة: ١٠) واتە: کاتێك کە نوێژکرا ئێوە لەزەویدا بلاوببنەوە، وداوای فەزڵ و ڕیزق و ڕۆزی خوا بکەن، زۆر زیکر و یادی خوا بکەنەوە، بەئومێدی ئەوە کە سەرکەوتوو سەرفیراز بن،وە فەرمویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴾ (النبأ: ١١) .واتە:ئێمە ڕۆژمان کردوە بەژیان وزیندەگی مرۆڤەکان.

---

[1] الآداب الإسلامية ب٣ ل:٣٦ ،ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٠٧ .

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ (الملك: ١٥) واتە: هەر خوایە زەوی بۆ ئێوە رام کردوە، بەشان و دۆڵەکانیدا برۆن و ریزق و رۆزی خوا بخۆن، و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە.

وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ما أكَلَ أحدٌ طعاماً قطّ خيراً من أنْ يأكلَ مِنْ عمَل يده، وإنّ نبيّ الله داود كان يأكل من عمل يده**}([1]) واتە: هیچ کەسێك قەت قەت خواردنێکی نەخواردوە کە چاکتروباشتر بێت لەو خواردنەی کە لەئیش وکەسابەتی دەستی خۆی بخوات، وەپێغەمبەر داود-علیه السلام-لەکار وکەسابەتی خۆی-زرێ وشمشێری دروستدەکرد ودەیفرۆشت- دەخوارد.([2]).

هەروا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لَأنْ يأخُذَ أحدُكُم حَبْلَه فيحتطبَ على ظَهْرِه،فيَبيعَها خيرٌله من أنْ يَسْألَ الناسَ أعْطَوْه، أومنعُوه**}.([3]).واتە:ئێوە بچن بەپشت داربهێنن و بیفرۆشن، چاکترە لەوەی کەسواڵ بکەن، خەڵکی شتتان بداتێ، یاننەتاننداتێ.

ئیبن عباس دەڵێ: ئادەم پێغەمبەر -علیه السلام- جوتی دەکرد وزەوی دەکێڵا،وکشت و کاڵی دەکرد.

نوح پێغەمبەر - علیه السلام - دارتاش بووە وخۆی کەشتیەکەی دروستکرد.

ئیدریس پێغەمبەر - علیه السلام- بەرگدروو بووە.

ئیبراهیم و لوط-علیهما السلام -کشتوکاڵیان کردووە.

صالح پێغەمبەر- علیه السلام- بازرگان بووە.

موسا و شعیب و محمد -علیهم السلام - شوان بوون وەپێغەمبەرﷺ بەماڵ وسامانی خدیجەوە بازرگانی کردوە([4]). یارەکانی پێغەمبەرﷺ لەزەویدا ولەدەریادا بازرگانیان دەکرد لەخورماو باغەکانیاندا ئیشیان دەکرد، ئەوە عمری کوڕی خەتتابە دەیگوت: (نابێ ئێوە ئیش نەکەن وپاڵ بدەنەوە وبڵێن: خوایە بینێرە،چونکە ئێوە دەزانن کە نە

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] الآداب الإسلامية، محمود المصري، ل:٢١٨.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[4] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل: ٦١.ومنهاج الصالحين، ب١ /ل:٥٥٢.

ئاسمان و نەزەوی زێڕ وزیو نابارێنن).([1]).لقمانی حەکیم بەکورەکەی دەگوت:(بڕۆ کاسبی حەلاڵ بکە و خۆت لەهەژاری رزگاربکە، چونکە هەژاری مرۆڤ توشی سێ خەصڵەتی خەراپ دەکات:

أ-دین و عەقلی لاواز دەبێت. ب-پیاوەتی ومروئەتی لەدەست دەدات.

ج- خەلکی گالتەی پێدەکەن).([2]).

بۆیە پێویستە ئێمەش چاو لەئەوان بکەین و وەك ئەوان بکەین بۆ کاری دو نیاو بۆ کاری دوا رۆژ.

## ئەمەش هەندێکە لەئادابەکانی ئەم بابەتە بۆئەوە چاودێریان بکەین و ئەنجامیان بدەین:

١-لەبازرگانیدا نیازو مەبەستی جوانت هەبێت، لەدەست پان کردنەوەو سوالْ کردن خۆتی پێ رزگار بکە، و ژیان و بژێویشی بۆ منداڵەکان پەیدابکە.

٢-بازاڕی دونیا نابێ بازاڕی دوا رۆژت لەبیرببباتەوە، بەلْکو دەبێ بۆ هەردوکیان هەوڵ بدەیتوخێرو چاکەی هەردو دونیا بەدەست بهێنێ، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ﴾ (النور: ٣٧).

واتە: ئەو پیاوانە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن وایان لێناکات کەواز لە یادی خوا و نوێژ کردن و زەکاتدان بهێنن.

٣-هەوڵ بدە ریزق و رۆزی حەلاڵ وپاك پەیدابکە، خۆت لەریزق و رۆزی حەرام و شوبەدار دوربگرە،خوا جل جلالە فەرمویەتی﴿ **كلوا من الطّيبات واعملوا صالحًا** ﴾ لەریزقە حەلاڵ وپاکەکان بخۆن، وکارو وکردەوەی چاك بکەن، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الحلال بيّنٌ والحرام بيّنٌ وبينهما مشتبهاتٌ**}([3]).

واتە: شتی حەلاڵ ئاشکرایە و حەرامیش ئاشکرایە، لەنێوان ئەو دوانەدا چەند شتێکی شوبهە لێکراو هەیە ، خۆتانی لێبپارێزن وە ئەبوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی

---

[1] تهذيب موعظة المؤمنين،ب١ /ل:١٠٨،ومختصر منهاج القاصدين،ل:١٣٣.

[2] الآداب الإسلامية ، محمود المصري، ل:٢٢٠.

[3] اخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

:{**يأأيّهالناس إنّ اللهَ طيّبٌ لا يَقْبلُ الاّ طيّباً**}(١) واتە: ئەی خەڵكینە خوا پاكەو پاك نەبێ وەری ناگرێ.

٤-خۆت دوربگرە لەشاردنەوەی (احتكار) شتومەك، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لا يَحْتَكِرُ الاّ خاطىءٌ**}(٢) واتە مرۆڤی تاوانبار نەبێ شتومەك ناشارێتەوە.

٥-بەغەشش و ناپاكیەوە كڕین و فرۆشتن مەكە، چونكە پێغەمبەر ﷺ بەلای كابرایەكدا رۆیشت كە دانەوێڵەی دەفرۆشت، پێغەمبەر ﷺ دەستی كردە ناو دانەوێڵەكەوە دیتی ژێرەوەی تەڕە، فەرمووی: {ئەوە ئەو تەڕیە چیە؟}، كابراكە گوتی: باران لێی داوە، پێغەمبەر ﷺفەرموی: {ئەی بۆ تەڕیەكەت نەدەخستە سەرەوە تاخەڵك بیبینێ، هەر كەس غەشمان لێ بكات لەئێمە نیە}.(٣).

٦-بۆ ڕەواجدان بەكەل و پەلەكەت لەمامەڵەدا سوێند مەخۆ، ئەبوهریرە دەڵێ گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: {**الحَلف مَنْفقةٌ للسِلْعة مَمْحقةٌ للكَسْب**}(٤)واتە: سوێند خواردن كەل و پەلەكەت سەرف دەكات، بەڵام كەسابەتەكەت لەناودەبات، واتە فەڕو پیرۆزی كاسبی ناهێڵێ.

٧-كەل و پەل و كالاّكانت بەدرۆ وەسف مەكە، چونكە ئەوە درۆو فێڵ و هەڵخەڵەتاندنە، ئەبو سەعیدی خودری گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**التاجر الأمين الصَدُوق مع النبيّين والصّدّيقين والشهداء**}(٥) واتە: بازرگانی ئەمین و راستگۆ لەگەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدەكاندایە.

٨-لەكێشانەو پێوانەدا زیادو كەمی مەكە،خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴾ (المطففين: ١-٣) واتە: دۆڵی دۆزەخ بۆ ئەو كەسانەی كە كاتێك شت بۆ خەڵك بكێشن رێك دەیكێشن، وە كاتێك شت بۆ خۆیان بپێون یان بكێشن زەرەریان لێدەدەن.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] حديث متفق عليه.

[5] أَخْرَجَهُ ابن ماجه (٢١٣٩).بروانە:المسند الجامع،٢٣ /٤٧٤ .

٩-لەکاتی کڕین و فرۆشتندا ڕێگەی مسوڵمانان مەگرە و ڕێگەیان لێ تەنگ مەکەوە، کێشە و بێشە و هەراهەرا وشیرەشێر لەگەڵ خەڵکدا مەکە ودەنگت بەرزمەکەوە.

١٠-بەقازانجی کەم ڕازیبە، چونکە ئەم کارە وا دەکات کە خەڵك تۆیان خۆشبوێ و دۆست و برادەرت زۆر دەبێ و مامەڵەت خۆش دەبێ و خوای پەروەردگاریش فەڕو بەرەکەتی خۆی بەسەرتدا دەرژێنێ.

١١-لەڕێگەی سودو ڕیبا خواردن و قومارکردنەوە کاسبی مەکە، چونکە ئەو کاسبیە حەرامە خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ...... ﴾ (البقرة: ٢٧٥).

واتە: خوا عزوجل کڕین و فرۆشتنی حەلاڵ کردوە، و سودو ڕیبای قەدەغە کردوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لعَنَ رسولُ الله ﷺ آكِلَ الربا و مُوكله، و كاتبَه، و شاهدَيْه، و قال:هم سواءٌ}[١]واتە: پێغەمبەر ﷺنەفرینی کردوە لەسودخورو لەسوددەرو لە نوسەرو لەشایەدەکان و فەرموی: ئەمانە وەك یەك وان.

١٢-هەر ماڵو سامانێك كە حەرام و قەدەغەكراو بێت مەیكڕە و مەیفرۆشە چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { إِنَّ اللَّهَ إِذَا حَرَّمَ عَلَى قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عَلَيْهِمْ ثَمَنَهُ}[٢] واتە: خوای پەروەردگار کاتێك شتێك لەسەر خەڵك قەدەغە بكات،نرخ و پارەكەشی قەدەغە دەكات.

١٣-لە مامەڵەو قەرز وەرگرتنەوەدا چاكە بكە و كارئاسانی بكە و چاوپۆشی بكە، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ (البقرة: ٢٨٠) واتە: ئەگەر قەرزار دەستی كورت بوو ئەوە هەتا حاڵی باش دەبێت چاوەڕێی بكەن، وە قەرزەكەشی بكەن بەخێرو سەدەقە و لێی وەرمەگرنەوە، ئەوە بۆ ئێوە چاكترە.وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {رَحِمَ اللهُ امرءاً سَهْلَ البيعِ، سَهْلَ الشراء، سَهْلَ القضاء سَهْلَ الإقتضاء}[٣] واتە: خوایە بەزەیيت بێتەوە بەكەسێك كە كڕینو فرۆشتن و دانەوەو داواكردنی خۆشو ئاسانە.

---

[١] أخرجه مسلم و احمد واصحاب السنن، و هو حديث صحيح.

[٢] أخرجه أحمد ٣٤٧/١، ٢٩٣،و أبوداود ٣٠٢/٢٠،باب ثمن الخمر والميتة حديث رقم: ٣٤٨٨، والبيهقي ١٣/٦، و الحديث صحيح.

[٣] أخرجه البخاري في صحيحه.

١٥-فرۆشتن لەسەر فرۆشتنی براکەت مەکە و کڕین لەسەر کڕینی ئەو مەکە، لەم بارەوە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**لا يبعْ بعضُكم على بيع أخيه**}([1]) واتە: لەسەر فرۆشتنی براکەتەوە فرۆشتن مەکە، هەروەها لەسەر کڕینەکەشیەوە کڕین مەکە.

١٦-ئەگەر کەسێك لەمامەڵەدا پەشیمان بۆوە ماڵەکەی لێ وەربگرەوە، لەم بارەوە ئەبوهریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**من أقال مسلماً بيعته أقال اللهُ عَثْرَتَه يوم القيامة**}([2]) واتە: کەسێك فرۆشتنی برا مسوڵمانەکەی وەربگرێتەوە ئەوە خوا عزوجل لەرۆژی دواییدا لەهەڵەکانی ئەو دەبورێت.([3]).

## شەشەم: ئادابەکانی پەیوەندی وچاودێری خزمەکان:

خزمەکان هەندێکیان لەهەندێکیان شیاوتر و نزیکترن، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿... وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...﴾ (الأحزاب: ٦) بۆیە خزمەکان هەریەکەیان مافی خۆیان هەیە پێویستە پێیان بدرێ، وەك خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ ....﴾(الروم: ٣٨) واتە: هەر خزمەو مافی خۆی بدەیە، خوای پەروەردگار لەقورئاندا زۆر باسی مافی خزمایەتی کردوە، وەك هەندێك لەو ئایەتانەی کە باسمان کرد.

وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەکانیدا خەڵکی هەڵناوە بۆ پەیوەند کردنی خزمایەتی و بەجێهێنانی پێداویستیەکانیان،وەك ئەمە کە فەرمویەتی: {**من أحَبَّ أنْ يُبْسطَ له في رزقه و ينسأ له في أثره، فليصلْ رَحِمَه**}([4]).هەرکەسێك پێی خۆشەریزقی فراوان بێ، و تەمەنی درێژ بێ، با پەیوەندی خزمەکانی بکات.

---

١ أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] رواه ابو داود وابن ماجه وابن حبان والحاكم وقال:صحيح على شرط مسلم.

[3] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل: ٥٩.ومنهاج الصالحين، ب١ /ل:٥٥١.

[4] حديث متفق عليه.

**لەبەرئەوە چەند ئادابێکی پەیوەندی وچاودێری خزمەکان هەیەپێویستە ئێمە ئاگاداریان بین وجێبەجێیان بکەین وەك باسیان دەکەین:**

١-سەردانی خزمان بەبەردەوامی و ئەحواڵ پرسینیان و خۆشی هێنانە سەردڵو دەرونیان، لەبەر رەزامەندی خوا،وەك فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء: ١) واتە: لە خوا بترسن و ئاگاتان لە خزمەکانتان بێت. علی کوڕی ئەبو تالیب گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :{**مَنْ سرّه أنْ يُمدّ له في عُمْره ويوسّع له في رزقه، ويدفع عنه ميتة السوء،فليتق الله وليصِلْ رَحِمَه**}([1]) واتە: هەر کەس پێی خۆشە تەمەنی درێژ بێت و ریزق و رۆزی فراوان بێت و توشی مردنی خراپ نەبێ ئەوا با لەخوا بترسێ و ئاگای لەخزمەکانی بێت.

٢- خۆت بپارێزە بەهۆی سەرقاڵیتەوە بەدونیاوە پەیوەندی خزمەکان نەپچڕێنی، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ (محمد:٢٢) واتە:ئایا ئەگەر دەسەڵاتتان پەیداکرد نزیکەخراپە بکەن و خزمەکانتان بپچڕێنن؟ ئەمانەن کە خوا نەفرینی لێیان کردوەو کەڕو کوێری کردوون.

جوبەیری کوڕی مطعم گێڕایەوە گوتی:گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو:{**لا يدخلُ الجنّة قاطعُ رَحِمٍ**}([2])واتە: ئەو کەسەی کەخزمەکانی پچڕاند بێت ناچێتەناو بەهەشتەوە.

٣-پەیوەندی خزمایەتی بکە بەئامۆژگاری کردنیان و شارەزاکردنیان و بەبیرهێنانەوەی بێئاگاکانیان و بانگ کردنی ئەوانەیان کەپشتیان لە خوا کردووە بۆ بەجێهێنانی فەرزەکانی و خۆپاراستنیان لەگوناهو تاوان، خوا جل جلاله فەرمویەتی:﴿ وَأَنذِرۡ

---

[1] أخرجه عبدالله بن أحمد في زوائده على المسند، وابن جرير وصححه، والطبراني في الأوسط، والحاكم،وابن النجار عن علي.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴾(الشعراء: ٢١٤)واتە:خزمە نزیکەکانت ئاگاداربکەوەو بیانترسێنە .
ئەبو هریرە دەڵێ کە ئەم ئایەتە دابەزی پێغەمبەر ﷺ هەموو خزمەکانی بانگ کرد، یەك بەیەك پێی فەرموون: {خۆتان لەئاگری دۆزەخ رزگار بکەن، من هیچم بۆ ئێوە پێ ناکرێ تەنها ئەوەنەبێ کە ئێوە خزمی منن و هەرمنیش مافی خزمایەتی بەجێ دەهێنم}([1]).
٤-پەیوەندی خزمایەتی بە پێدانی خێر وسەدەقە پێیان،چونکە ئەوە دوو پاداشتی هەیە، پەیوەندی خزمایەتیەکە وپاداشتی خێرو سەدەقەکە.([2]).
٥-لەبەرامبەر خراپەی خزمەکانتەوە خراپەیان لەگەڵدا مەکە و بە پچڕاندنیان تۆ مەیپچڕێنە، یان چاوەڕێی سەردانی ئەوان مەکە بۆ سەردانی کردنیان، خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿والذين يصلون ما أمرالله به أن يوصل﴾ واتە: ئەوانەی کە پەیوەندی ئەو خزمایەتیە بەجێدەهێنن کە خوا فەرمانی پێ کردون کە پەیوەند بکرێت، واتە: ئەمانە دەچنە بەهەشتەوە. ئەبوهریرە گێڕایەوە کابرایەك گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ من خزمم هەیە، سەردانیان دەکەم وچاکەیان لەگەڵدا دەکەم،بەلام ئەوان خەراپەم لەگەڵدا دەکەن،من چیبکەم؟ پێغەمبەر ﷺفەرموی: {**إِنْ كنتَ كما قلتَ فكأنّما تسفّهمُ الملّ، ولايزال معك من الله ظهيرٌ عليهم ما دمتَ على ذلك**}([3])واتە: وەك دەڵێی ئەگەر وابی ئەوە وەك ئەوە وایە کە تۆ خۆڵەمێشی گەرمیان دەرخوارد بدەی، وە هەتا لەسەر ئەو کارەت لەگەڵیاندا بەردەوام بیت ئەوە خوای پەروەردگار پشتیوانتە.
٦-لەگەڵ خزمە نامەحرەمەکانتدا وەك کچە خاڵو کچە پور وکچە مامەکانت تەوقەیان لەگەڵدا مەکەو لەگەڵیاندا تەنها مەبەوە، بەڵکو دەبێ لە ئاستیاندا زمانت بپارێزی و چاوت لێیان بگریەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايخلونّ أحدُكُم بامرأةٍ إلاّ مع ذي محرم**}([4]) واتە: لەگەڵ مەحرەمدا نەبێت لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا بەتەنها مەبنەوە قەدەغەیە.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.
[2] منهاج الصالحين،ب١ .ل:٢٦٥.
[3] أخرجه مسلم في صحيحه.
[4] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إيّاكمُ والدخولَ على النساء، فقال رجلٌ من الأنصار: أفرأيتَ الحَمْوَ قال:الحمْوُ الموتُ}([1]) واتە: ئامان بەتەنها لەگەڵ ژناندا مەبن، کابرایەکی ئەنصاری گوتی: ئەی براو برازای ژن یان مێردەکەی چۆنە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: براو برازای ژن یان مێردەکەی هەر مردنە، واتە: بمرێ باشترە نەك لەگەڵ براو برازای مێردەکەیدا ژن بەتەنها کۆببێتەوە.([2]).

## حەوتەم: ئادابەکانی دراوسێ:

دراوسێ کەسێکە لەکەس و کارو خزمەکانت زیاتر تێکەڵی و پەیوەندی هەیە بە مرۆڤەوە، هەمیشەمرۆڤ لەگەڵ دراوسێکەیدا تێکەڵ و ڕوبەڕوییەتی، لەبەرئەوەیە کە ئاینی پاکی ئیسلام زۆر گرنگی بەدراوسێ داوە و زۆر وەسیەتی بۆ مرۆڤ کردوە دەربارەی دراوسێکەی،لەم بارەوەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:
{مازالَ جبريلُ يُوصِيني بالجار، حتى ظَنَنْتُ أنّه سَيُورِّثُه}([3]). واتە:پێغەمبەر ﷺ فەرموی: جبرائیل هەندە وەسیەتی بۆکردم دەربارەی دراوسێ، هەتتا من گومانم برد کەوا دراوسێکەم میراتم لێ دەبا.
هەروا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{مَنْ كان يُؤْمِنُ بالله واليوم الآخر، فلا يُؤْذِ جارَه} وە لە ڕیوایەتی ئیمام مسلمدا { فلْيُحْسِنْ إلى جارِه}([4]).واتە: هەرکەسێك باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ئەزیەتی دراوسێکەی نەدا، وچاکەی لەگەڵدا بکات.([5]).
ئەمە و چەندەها ئایەت وفەرمودەی پیرۆز کەباسی چاکە وچاکەکاری دەکەن لەگەڵ دراوسێدا ، وەك لەمەودا باسی دەکەین.

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[2] منهاج الصالحين،ب١/ل:٢٦٢-٢٦٦ والآداب الإسلامية للناشئة،ب٧٣/٣.والآداب الإسلامية، لمحمود المصري ل: ٢٤٩ .

[3] متفق عليه.

[4] متفق عليه.

[5] الآداب الإسلامية ، لمحمود المصري،ل:٢٧٢ .

لەبەرئەوە هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ دراوسێدا چەند ئادابێکی هەیە پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەو ئادابانە بکەین:

١-هەر کاتێك بەدراوسێکەت گەیشتی سەلامی لێ بکەو ڕوت لەگەڵیدا گەش بێت و حاڵ و ئەحواڵی بپرسە،وەکە نەخۆش کەوت خێرا سەردانی بکەو بەپیریەوە بچۆ ئەگەر پێویستی کرد.([1]).

٢-هەر کاتێك دراوسێکەت تووشی بەڵاو موسیبەت بوو پرسەو سەرەخۆشی لێ بکەو یارمەتی بکە، ولەکاتی خۆشیدا هاوبەشی بکەو پیرۆزبایی لێ بکە.

٥-لەکەم و کوڕی و هەڵەکانی دراوسێکەت ببورەو چاوپۆشی بکە.

٦-لەگەڵ منداڵی دراوسێکەتدا بەنەرم و نیان بە و ئامۆژگاری باشیان بکەو چاکەیان لەگەڵدا بکە.

٧-لەئاست ئافرەتەکانی دراوسێدا چاوت بگرەوەو پارێزگاری لەسەر ڕێزو حورمەتیان بکە، و کاتێك کە دراوسێکەت لەماڵ نەبوو ئاگات لەماڵەکەی بێت.

٨-هەتا بۆت دەکرێ ئەزیەت و ئازاری دراوسێکەت مەدە وڕێگای لێ تەنگ مەکەوە و دەنگی خۆت و ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکەت بەسەریدا بەرز مەکەوە ئەبوهریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**واللهِ لايُؤْمنُ واللهِ لايُؤمِنُ و اللّه لايؤْمنُ، قيل: مَنْ يا رسولَ الله؟ قال: الذي لا يأمن جارُهُ بوائقَه**}([2]) واتە: سوێند بەخوا باوەڕی نیە، سوێند بە خوا باوەڕی نیە، سوێند بەخوا باوەڕی نیە، گوتیان: کێ باوەڕی نیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرموی: ئەوکەسەی کە دراوسێکەی لەشەڕو نەگبەتیەکانی ئەمین نیە.([3]).

٩-ئامۆژگاری باشی دراوسێکەت بکەو ڕاوێژی پێ بکەو شارەزای بکە بۆ هەر شتێك کە نایزانێ لەکاروباری هەردوو دونیا.

١٠-هەر چاکەیەکی پێت دەکرێ لەگەڵ دراوسێکەتدا بیکە،ئەگەرداوای یارمەتی لێکردی یارمەتی بدە وەئەگەر هەژاربو بەماڵ وسامان یارمەتی بدە،وەئەگەرداوایقەرزی لێکردی بیدەیە وەئەگەر نەخۆش کەوت،سەردانیبکە،لەشاییدا پیرۆزبایی لێبکەو لە

---

[1] آداب المسلم،ل:١٤١.

[2] أخرجه البخاري ومسلم.

[3] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٢٥٨ .

کاتی ناخۆشیدا سەرخۆشی لێبکە، عبدالله ی کوڕی عمرو عائیشە-رضیالله عنهما- گێڕایانەوە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**مازال جبریلُ یوصینی بالجار حتی ظننت أنهّ سیورّثه**}(1) واتە: جبریل بەردەوام هەر وەسیەتی بۆ دەکردم دەربارەی دراوسێ، هەتتا گومانی ئەوەم برد کە دراوسێ میرات لەدراوسێکەی دەگرێ.(2).

11-هەمو دراوسێیەك مافی خۆی پێبیدە،چونکە دراوسێ سێ جۆری هەیە:

یەکەم:دراوسێیەوخزمەومسوڵمانە، ئەمە مافی دراوسێیەتی و خزمایەتی و ئیسلامەتی هەیە.

دوەم:دراوسێەومسوڵمانە، ئەمە مافی دراوسێیەتی و ئیسلامەتی هەیە.

سێهەم: دراوسێەوبێباوەڕە، ئەمە هەرمافی دراوسێیەتی هەیە، عبدالله ی کوڕی عمر مەڕێکی سەربڕیبوو بەمنداڵەکانی گووت: ئایا بەشی دراوسێ بێباوەڕەکەتان ناردووە ؟ چونکە من لەپێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: {جبریل بەردەوام وەسیەتی بۆ دەکردم لە بارەی دراوسێ، هەتتا وام زانی کە دراوسێ میرات لەدراوسێکەی دەگرێ.

12 -چیت بۆخۆت پێخۆشە ئەوەشت بۆ دراوسێکەت پێخۆش بێ،چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {**لایؤمن أحدُکُم حتّی یُحِبّ لأخیه مایحبّ لنفسه**}واتە: هەتتا ئەوەی بۆ خۆتت پێخۆشە بۆ براکەشت پێخۆش نەبێ، ئیمانەکەت کامڵ نیە.

13-نابێ خانوەکەت بەسەر خانوی دراوسێکەتدا بەبێ پرسکردن پێی بەرز بکەیەوە، چونکە دەبێتە مایەی ئەزیەتکردنی دراوسێکەت بەهۆی لێبڕینی تیشکی خۆر وهەوا لەماڵەکەیدا،لەکاتێکدا کەزەرەر وزیاندان لەیەکتری لەئیسلامدا قەدەغەیە.(3).

{سودێك} ئەگەر دراوسێ خەراپ بو دەبێ بەم شێوە بکەی کەباسی دەکەین: کابرایەك هاتە لای پێغەمبەرﷺوگوتی:دراوسێکەم ئەزیەتم دەکات،ئەویش فەرموی: {بڕۆ ئارام بگرە} کابرایەکە چەندجارسکالای لەلای پێغەمبەر کرد و ئەویش لە دواییدا فەرمووی : {بڕۆ کەلوپەل وشتومەکەکانت فڕێ بدە سەر ڕێگای خەڵك}کابراکە چو وایکرد، ئەمجا

---

1 متفق علیه.

2 منهاج المسلم للجزائري،ل:73 .

3 الآداب الإسلامیة،محمود المصري،ل:282.

خەلك هاتن وپرسياريان لێدەكرد و ئەويش گرفتەكەی پێدەگوتن و خەڵكەكەش زۆر قسەيان بەكابراكە دەگوت،ئەمجا پياوەكەش ناچار هات و گوتی: كاكە برۆ شتو مەكەكانت بهێنەوە، جارێكی تر من خەراپەم بۆت نابی([1]).

## هەشتەم: ئادابەكانی سەردانی نەخۆش:

سەردان و زيارەتی نەخۆش يەكێكە لەو كاروفەرمانانەی كە پێغەمبەر ﷺ زۆر خەڵكی بۆ هەڵناوە، چونكە ئەوسەردان و زيارەتە دەستگيرۆيی و بەزەيی هاتنەوەيە بە نەخۆش و پەيوندی برايەتی و بروای بەهێزدەكات، بۆيە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: {**إنَّ المسلم إذا عاد أخاه المسلمَ لم يَزَلْ في خُرفة الجنَّة حتى يَرْجِع،قيل يا رسولَ الله وما خُرفة الجنَّة؟ قال:جناها**}([2]) واتە:هەر مسوڵمانێك سەردانی برای مسوڵمانی خۆی كرد، ئەوە هەتا دەگەڕێتەوە لەميوە چنينی بەهەشتدايە.

نەخۆشی تاقيكردنەوەيە، تاقيكردنەوەش خۆشويستنی خوايە بۆ ئەوكەسە،بۆيە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: {**إذا أحبَّ اللهُ قوماً ابتلاهم، فمَنْ رَضِيَ فله الرِّضا، ومَنْ سَخِطَ فله السَّخْط**}(٣).واتە:هەر كاتێك خوا جلجلالە گەلێكی خۆشبوێ تاقيان دەكاتەوە، جائەوەی رازيە ئەجرو پاداشتی گەورە وەردەگرێتەوە، ئەوەش نارازيە خۆی تاوانبار دەكات. وەچەندەها فەرمودەی تر لەم بارەوە هاتوە ، ئەمەندە كافيە.

## لەبەرئەوە سەردانی نەخۆش چەند ئادابێكی هەيە پێويستە ڕەچاو بكرێن بەم شێوەيە:

١-هەر كاتێك كە زانيت فلانكەس نەخۆشە خێرا برۆ بۆ سەردانی، چونكە لەفەرموودەی قودسيدا هاتووە، خواجل جلالە لەرۆژی دواييدا دەفەرمیٚ: ئەی بەندەكەم من نەخۆش كەوتم تۆ نەهاتی بۆ سەردانم، بەندەكەش دەڵێ: ئەی خوايە تۆ پەروەردگاری هەموو جيهانيانی، چۆن سەردانی تۆ بكەم؟ خوا جل جلالە دەفەرمیٚ: ئەی نەتزانيبوو فلان

---

[1] صحيح سنن أبي داود للألباني رقم(٥١٥٣). ومنهاج الصالحين. ب١ /ل:٢٦٢.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] أخرجه الترمذي وصححه الألباني في صحيح الجامع، رقم:٢٨٥ .

بەندەی من نەخۆش کەوتبو تۆ سەردانت نەکرد؟ بزانە ئەگەر تۆ سەردانی ئەو بەندەیەت بکردایە ئەوە منیش لەویَ دەبووم.([1]).

٢-کاتێك کە لەلای نەخۆش دانیشتی دوعای بۆ بخوێنە، عائیشە-**رضي الله عنها**- گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ کەسێکی خزمی نەخۆشبوو سەردانی کرد، ودەستی راستی پێدا دەهێنا ودەیفەرموو: {**اللهم ربَّ الناس، مُذهِبِ البأسِ أذْهِبِ البأسَ، إشفِ أنت الشافي، لاشفاء إلا شفاؤك، شفاءً لا يُغادِرُ سُقْماً**}([2]). واتە: ئەی خوایە، ئەو نەخۆشیە لابە، تۆ شیفا دەری، شیفا هەرشیفای تۆیە ، شیفایەك بدە کە نەخۆشی نەهێڵێ.

٣-سوننەتە موژدە بدەی بەنەخۆش و دڵنیای بکەیەوە کە خوا شیفای دەدا،وپێی بڵێ: تۆ چاکی وچاکدەبیەوە، ئیبن عباس گێڕایەوە کەپێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشێکی کردو فەرمووی {**لا بأس به طهورٌ إنشاء الله**}([3]) واتە: هیچت نیە، زۆر پاکی گەر خوا حەز بکات، هەروەها خوا عزوجل فەرمویەتی: ﴿**وإذا مَرِضتُ فهو يشفين**﴾ واتە: هەر کاتێك نەخۆش کەوتم هەر خوا شیفام دەدا.

٤-لەلای نەخۆش سۆز وبەزەیی خۆت دەرببڕە وئامادەی خزمەتی بە، بەچاکە نەبێ قسە مەکە، ئوم سلمە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا حَضَرتُمْ المريضَ أو الميّتَ فقولوُا خيراً،فإنّ الملائكة يُؤمّنوُن على ماتقولُون**}([4]) واتە: کاتێك کە چونە لای نەخۆش یان مردوو هەر قسەی چاك بکەن، چونکە ئێوە چی بڵێن فریشتەکان ئامینی لەسەردەکەن.

٥-تەماشای ئابڕوی نەخۆشکە مەکە، هەروەها تەماشای پێویستیەکان و دەرمانە تایبەتیەکانی مەکە.

٦-لەلای نەخۆش زۆر مەمێنەوە بۆئەوەی نارەحەت نەبێ، تەنها مەگەر نەخۆشەکە بۆخۆی پێی خۆش بێت و ئولفەتی پێوەبگریَو وا حەزبکات.

٧-سوننەتە نەخۆشەکە ئارەزوومەند بکریَ بەوە کە ئارامی هەبێ لەسەر فەرمان و قەزای خوا ودوعای مردن لەخۆی نەکات، ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجها البخاري ومسلم في صحيحهما.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

{هیچ کەس لەئێوە لەبەر زەرەرو زیانێك کە لێی کەوتووە، بامردن نەخوازێ ، جا ئەگەر نەدەکرا و هەر دەیکرد بابڵێ: ئەی خوایە ئەگەر ژیان بۆ من چاکترە بمژێنی، وە ئەگەر مردنم چاکترە بممرێنی}([1]).

## نۆیەم : ئادابەکانی خودی نەخۆش:

١-زۆر مردنی لەیادبێت و خۆی بۆ ئامادەبکات.

٢-زۆر سوپاسی خودا بکات و زۆر لێی بپاڕێتەوەو لێی بلاَلێتەوە.

٣-ناتوانایی خۆی دەربېڕێ و دەرمان بەکاربهێنێ و داوای کۆمەکیش لەخوا بکات.

٤-زۆر سکالاَ نەکا،ڕێز لەدانیشتوان بگرێت، تەوقەیان لەگەڵدا نەکات.

٥- نەخۆش نابێ زۆری لێ بکرێ بۆ نانخواردن وشتی تر.

٦-واباشە نەخۆش دەرمان بەکار بهێنێ، چونکەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**تَداوَوْا عبادَ الله، فإنّ اللهَ لم يضعْ داءً إلاّ وَضَع له شفاءً..**}([2]).

٧-دروستە ژن وپیاو سەردانی یەکتر بکەنکاتێك کەنەخۆشبون.بەلام مەرجە توشی فیتنە نەبن،ئیمام بخاری دەڵێ: أم درداء سەردانی پیاوێکی ئەنصاری ئەهلی مزگەوتی کرد کە نەخۆش بوو، وەعائیشەش سەردانی باوکی و بیلالی کردوە کاتێك کە نەخۆش بون.(٣).

٨-ئەگەر نەخۆش ئازاری هەبو بادەست لەسەر ئازارەکەی دابنێ، وسێ جار بلێ:**بسم الله**، پاشان حەوت جاریتر بلێ: {**أعوذُ بعِزة الله وقُدْرَتهِ منْ شرِّ ماأجِدُ وأُحَاذِرُ**}([4]).واتە: پەنا دەگرم بەگەورەیی وهێز ودەسەلاتی خوا لەشەڕ وخەراپەی ئەم نەخۆشیەی کەهەستی پێدەکەم وحەزەرومەترسی لێدەکەم.

وەعائشە گێڕایەوە گوتی:ئەگەر کەسێك شوێنێکی ئازار یان برینێکی هەبوایە،پێغەمبەر ﷺ پەنجەی شادەی دەخستە سەر خۆڵکەوبەتفی خۆی تەڕیدەکرد،ودەیفەمو: {**بسم الله**

---

[1] أخرجهالبخاري ومسلم.

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَة بعضِنا،يُشفى به سقيمنا،بإذنِ ربّنا}[1]واتە:بەناوی خوا، بەخۆڵی زەوی پاكی خۆمان، وتێكەڵ بەتفی برای خۆمان، شیفای پێ دێ نەخۆشەكەمان، بەئەمری پەروەردگارمان.برا ئازیزەكان ئەمانەی كەباسكران دەرمانی چاكن بۆ نەخۆشیەكانمان بەكاری بهێنن، إنشاو الله خواجل جلاله دەیانكات بەشیفا ونەخۆشەكانمان بەچاكی چاك دەبنەوە.[2]

{**سودێك**}مرۆڤی بێباوەڕی نەخۆش دروستە ئێمە سەردانی بكەین،چونكە منداڵێكی جولەكە نەخۆش كەوتبو، پێغەمبەر ﷺچو سەردانی كردوداوای لێكرد مسوڵمان بێت،ئەویش مسوڵمان بوو پاشان گوتی:**الحمد لله الذي أنقذني من النار**.([3]).

## دەیەم: ئادابەكانی پزیشك ودەرمان:

یەكێك لەهەدیەو دیاریەكانی پێغەمبەرﷺ تەداوی كردنی نەخۆشەو دەرمان دۆزینەوەیە بۆی، وەك فەرمویەتی: {**لكلِّ داءٍ دواءٌ، فإذا أُصيبَ دواءُ الداء بَرَأَ بإذن الله عزّ وجلّ** }([4]). واتە: هەموو دەردێك دەرمانێكی هەیە، جائەگەر دەرمانەكە بۆ ئەودەردە بێ، ئەوە بە فەرمانی خوا نەخۆشەكە چاك دەبێتەوە.

{**سیفاتی پزیشك** } پزیشكی زیرەك و كامڵ پێویستە ئەم سیفاتانەی تێدا بێ:

أ- نەخۆشیەكە بدۆزێتەوە، و بزانێ نەخۆشیەكە چیە ؟.

ب- بزانێ هۆكاری نخۆشیەكە چیە؟.

ج- هێزی نەخۆشەكە ونخۆشیەكەش چەند بەهێزە؟.

د-میزاجی جەستەی سروشتی چۆنە؟.

هـ-كاتەكە وتەمەنی نەخۆشەكە، وشوێنەكەی وكەش وهەوا چۆنە؟.

و-بزانێ چ دەرمانێك بۆ ئەونەخۆشیە چاكە وگونجاوە و بەسودە ؟ [5].

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣: ل:٨٩.ومنهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١/٤٨٦. والآداب الإسلامية، لمحمود المصري،ل:٥٢٤.

[3] أخرجها البخاري ومسلم في صحيحهما.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه، وأحمد في مسنده(١٤٥٣٢ ).

[5] منهاج الصالحين ،ب١ /ل:٥٥٦ .

## بۆیە پێویستە ڕەچاوی ئەم ئادابانە بکرێت:

١-پزیشکەکە ناوی خوا دەهێنێ، وبەزەردەخەنەوە وبەنەرم ونیانیەوە، و بەقسەی خۆشەوە لەگەڵ نەخۆشەکە مامەڵە دەکات، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {**لایحِلُّ لمسلمٍ أنْ یُرَوِّعَ مسلماً**}([1])نابێ مسوڵمان خەڵك بترسێنێ و یەکجاری بیتۆقێنێ و بیروخێنێ.

٢-پزیشك ئەمینە،ودەبێ وابزانێ کە ژیان بەدەست خوایە،وئەم هۆکارە بۆ چارەسەر، نەك بزانێ چارەسەر بەدەست ئەوە.

٣ -پێویستە پزیشك نهێنیەکانی نەخۆش بپارێزێ، وناببێ بەدەرمانی زۆرنەخۆش نارەحەت بکات، یان دەرمانی حەرام و قەدەغە کراو بۆ نەخۆش بنوسێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**داوُوا مرضاکم بالصَدقة**}([2]) واتە: بە هۆی خێر و صدقە کردنەوە ئێوە نەخۆشەکانتان عیلاج بکەن، وەلەبارەی دەرمانی خەراپەوە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە بەدەرمانی قەدەغەکراو و پیس دەرمانی نەخۆش بکرێت. ([3]).

٤-پێویستە پزیشك هەندێك لەودەرمانانەی کە پێغەمبەرﷺ بۆ نەخۆشیەکان دایدەنا، ئەمیش ئەودەرمانانە دابنێ، ئەوانەش وەك:هەنگوین، ڕەشکە،خورمای عەجوە و شمڵی و زەیتی زیتون، هتد.. چونکە ئەمانە هەمویان فەرمودەی صەحیحیان لەسەرهاتوە. ([4]).

٥-پێویستە پزیشك بەشەرم وحەیا بێت ، وکەسێك بێ راستگۆ، هەروەها پێویستە پزیشك بەشێکی زۆر لەشەریعەتی ئیسلامی ولەزانستی تازە وسەردەم شارەزا بێت.([5]).

<u>{سود وبەهرەیەك}</u> زانایان گوتویانە: چارسەرکردنی پزیشك دوجۆرە:

**١-چارەسەرە بەدەرمان، ٢-چارەسەرە بە پارێزی(حمیه) واتە:بەوازهێنانی نەخۆش لەخواردن و خواردنەوە، خۆئەگەر بەهەردوکیان بێت چاکترە، ئەگینا هەربخوا و پارێزی نەکات سودی نیە، جاری واهەیە هەر پارێزی سودی هەیە، بۆیە دەڵێن هیندیەکان هەر بەپارێزی چارەسەری نەخۆشەکانیان دەکەن.**

---

[1] رواه أحمد في مسنده (٢٢٩٥٩ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٧٦٥٨).

[2] ترتيب أحاديث الجامع الصغير،٢ / ١٤٠،وقال: صحيح.

[3] رواه أحمد وأبوداود وابن ماجه، وإسناده صحيح.

[4] منهاج الصالحين ،ب١ / ل:٥٦٢ .

[5] منهاج الصالحين ،ب١ / ل:٥٦٤ .

هەندێك لە حەكیم و پزیشكەكان دەڵێن: ئەندازە گیری خواردن گەورەترین دەرمانە، بۆیە پێغەمبەرﷺ ئەم واتایەی رونكردۆتەوە بە جوانی كە فەرمویەتی:{...... حَسْبُ ابن آدم لُقَيْماتٌ يقِمْن صلبه.......}([1]).

## یازدەیەم: ئادابەكانی جەنازە ومردوو و پرسە:

مرۆڤی بڕوادار هەمیشە مردنی لەبیرە،چونكە مردن كاتی گەیشتنە بەخۆشەویستەكەی كەخوای پەروەردگارە، خۆشەویستیش قەت لەیاد ناكرێ،لەبەر ئەوە دەبینی هەمیشە بڕوادار موشتاقی مردنە،تاوەكو لەم خانەی تاوانكردنەوە بڕوابۆ خانەی خۆشی و پاداشت وەرگرتنەوە كەلای خوایە جل جلالە، لەبەر ئەوەبو معاذي كوڕی جبل لەكاتی مردندا دەیگوت: لەكاتی هەژاریمدا خۆشەویستەكەم هاتوە بۆلام.بۆیە یادكردنەوەی مردن ئینسان دەخاتە ناو خواپەرستیەوە، وبەرەو ئاخیر خێری دەبات.([2]).

بەشوێن جەنازە كەوتن هەقی هەمو مسولمانێكە،چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {حَقّ المسلم على المسلم خمسٌ: ردّالسلام، و عيادة المريض، و اتّباع الجنائز، و إجابة الدعوة، و تشميت العاطس.([3]).واتە: هەقی مسولمان بەسەر مسولمانەوە پێنج شتە:وەڵامدانەوەی سەلام وسەردانی نەخۆش،ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەدا،وەڵامدانەوەی دەعوەت،دوعاكردن بۆ پشمیو.

**لەبەر ئەوە وەفات كردن ئەم ئادابانەی هەیە پێویستە ئێمە ئەو ئادابانە ڕەچاو بكەین و جێبەجێیان بكەین بەم شێوەیە:**

١- لەلای كەسێك كە لە گیانەلآدایە پێویستە ووشەی (لا إله إلاّ الله) بڵێینەوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لَقِنوا موتاكم لا إله إلاّ الله}([4])واتە: ئەو كەسانەی كە لە گیانەلآدان (لا إله الا الله)یان بۆ بڵێنەوە تاوەكو ئەوانیش بیڵێنەوە.

---

[1] صححه الألباني في صحيح الجامع(٥٦٧٤ ) وفي الصحيحة(٢٢٦٥).

[2] الآداب الإسلامية، لمحمود المصري،ل:٥٢٦ .

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

٢-پێویستە نوێژ لەسەر مردو بکەینوبەشوێن تەرمەکەیدابڕۆین هەتا دەشاردرێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{هەر کەسێك بەشوێن جەنازەی مسوڵمانێکدا بڕوا بەبڕوا و بەداوای پاداشت لەخوا، هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ و دەیشارنەوە، ئەوە پاداشتی دوو قیراتی دەست دەکەوێت، هەر قیراتەش هەندی کێوی ئوحودە، بەلام پێش شاردنەوە بگەڕێتەوە ئەوە پاداشتی یەك قیراتی دەست دەکەوێت}([1]).

٣-واباشەلەکاتی شاردنەوەی مردودا ئامۆژگاری خەڵکەکە بکرێت،ئیمامی عەلی گێڕایەوە گوتی: ئێمە لەگەڵ تەرمێکدا بوین لە (بەقیع)، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان ودانیشت و ئێمەش لەدەورەیدا دانیشتین، پێغەمبەر ﷺ دارێکی پێبوو سەری نەوی کردو بەدارەکەش لەعەرزەکەی دەدا، پاشان فەرموی: **{ما منكم مِنْ أحدٍ إلاّ وقد كُتبِ مقعدُهُ من النار ومقعُدُه من الجنّة}** واتە: هەر کەس لەئێوە شوێنەکەی لەدۆزەخدا و لەبەهەشتدا نوسراوە، یارەکان گوتیان: کەوا بو ئەی بۆ ئێمە بەو نوسینە پشت ئەستور نەبین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: **{إعْملوا فكلٌ مُيَسّرٌ لما خُلِق له}**([2]) واتە: نەخێر ئێوە ئیش بکەن، چونکە هەریەك لەئێوە بۆ ئەو شتەی کەبۆی دروستکراوە ئاسان کراوە.

٤-کەمردوەکە دفنکراسوننەتە دوعای بۆ بکەن، ئەبوهریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك کە لەشاردنەوەی مردو دەبۆوە دەوەستاو دەیفەرموو: **{استغفِروا لأخيكم وسَلوا له التثبيت،فإنّه الآن يُسأل}**([3]) واتە: داوای لێخۆشبون بۆ براکەتان بکەن چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ.بۆیە سوننەتە هەمو خەلکەکە دوعابکەن، نەك هەرکەسێك دوعا بکا وئەوانیکە ئامین بکەن.([4]).

٥-هەتا بکرێ یارمەتی و کۆمەکی ئەهلی مردووەکە بکرێت، نانخواردنیان بۆ سازبکرێ و بچی بۆ لایان ودڵیان بدەیەوە، چونکە کە جعفری کوڕی ئەبوتالیب شەهید کرا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **{إصْنَعوا لآل جعفر طعاماً فإنّه قد أتاهم ما يُشْغلهمْ}**([5]).

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] أخرجه البخاري ومسلم.

[3] أخرجه أبوداود ": باب الاستغفار عند القبر للميت، رقم الحديث: ٣٢٢١" والحاكم(١/٥٢٦) ،والبيهقي في الكبرى٤/٥٦" باب : مايقال بعد الدفن، وحسنه النووي في الأذكار ١٤٧، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٩٤٥).

[4] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٤٩٤ .

[5] رواه أبو داود والترمذي وقال: هذاحديث حسن صحيح. وصححه الألباني في صحيح الجامع(٤٧٩٦).

واتە: لەم كاتی پرسەیەدا بۆ ماڵو کەس وکاری جعفر خواردن دروست بکەن چونکە ئەوان مردنی جعفر مەشغولی کردوون.

٦-پرسەو سەرەخۆشی لەکەس وکاری مردوەکە بکرێ، عبدالله ی کوڕی مسعود-رحمه الله - گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ عزّى مصاباً فله مثل أجْرِه}[1] واتە: کەسێك پرسە وسەرەخۆشی کەسێك بکات کە موسیبەتێکیتوش هاتووە، پاداشتی وەك ئەو کەسە دەست دەکەوێ.

٧-دروستە دەموچاوی مردو هەڵبدەیتەوەو ماچی بکەیت، پێشەوامان ئەبوبەکر-رحمه الله- دەوچاوی پێغەمبەری هەڵدایەوەو ماچیشی کرد و گوتی:باوك ودایکم لەدەورت گەڕێن، بەزیندویی و بەمردویی هەرپاك بوی،جابیریش-رحمه الله-دەم وچاوی باوکی ماچکرد لەدوا مردنیەوە[2].

٨- زۆر بە هێواشی وترسەوە جەنازەکە بەرێبکرێ سوننەتە، نابێ دەنگ بەرزبکرێتەوە، یان هەراهەرا بکرێ، هەرکەسە بیربکاتەوە ئەگەر ئەو مردوە بوایە حالی چۆندەبوو؟،بۆیە پێویستە لەم کاتەدا تۆبە بکات.[3].

٩- ئامۆژگاری ئەهلی مردووەکە بکرێ بە صەبر وئارامگرتن وبەو هەموو ئەجر وپاداشتەی کە لەلای خوا هەیانە، وە نابێ لەخۆیان بدەن و سنگ و بەرۆك وقژیان بڕننەوە ، خوا جل جلاله فەرمویەتی: ﴿ ....وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ (البقرة:١٥٥- ١٥٦).واتە: مژدەی بەهەشت بەو ئارامگرانە بدە کاتێك کە تووشی موسیبەتێك دەبن دەڵێن: إنّا لله وإنّا إليه راجعون،واتە: ئێمە هەموومان موڵك وسامانی خواین وهەمومان هەربۆلای ئەو دەگەڕێینەوە.

١٠- بەم شێوەیە پرسە بکرێ کە ئوسامەی کوڕی زید گێڕایەوە گوتی: یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای باوکی وگوتی:(منداڵێکم لە مردندایە وەرە بۆلای)

---

[1] رواه الترمذي، وهوحديث ضعيف، ولكن له طرق متعددة، يقوّي بعضها بعضا، بروانه: التلخيص الحبير،٢ /٢١٥ .

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

[3] الآداب الإسلامية،محمود المصري،ل:٥٤٤ .

پێغەمبەریش ﷺ بەو کەسەی فەرموو:{بچۆوە بۆلای و پێی بڵێ:هەموشتێك موڵك و سامانی خوایە، ئەوەی داوێتی و ئەوەش دەیباتەوە، هەموو شتێکیش لەلای خوا کاتەکەی دیاریکراوەپێی بلێ:سەبرو ئارام بگرێ، پاداشتەکەشی لەخوا داوا بکات}([1]) دەشتوانی بڵێی:خواله مردوەکەتان خۆشبێ،سەبوریتان بدا.([2]).

١١-پرسەو سەرەخۆشی هەر سێ رۆژە، تەنها بۆ ژنی مێرد مردو چوار مانگ و دەرۆژە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**لایحلّ لامرأةٍ تؤمنُ بالله واليوم الآخر أنْ تَحُدّ على ميّتٍ فوق ثلاث ليالٍ، إلاّ على زوجها أربعةَ أشهر وعشراً**}([3]) واتە: دروست نیە ژن لەسێ رۆژ زیاتر پرسە بۆ مردوی دابنێ تەنها بۆ مێردەکەی نەبێ چوارمانگ و دەرۆژە.

ئیمامی شافیعی برادەرێکی کوڕەکەی وەفاتی کردبوو پرسەو سەرەخۆشی لێکردو بۆی نووسی:

**إنّي مُعَزّيك لا أنّي على ثقةٍ + من الخلود ولكن سُنة الدِّين**

پرسەت لێدەکەم نەك من بلێم نامرم، بەڵکو ئەمە ڕێبازی دینە

**فما المُعزَّى بباقٍ بعد ميته + ولا المُعزِّي ولو عاشَإلى حين.**

واتە : نەپرسە لێکراو دوا جگەرگۆشەی دەمێنێت + نەپرسەکار هەرچەند ماوەیەك بمێنن لەو ژینە([4]).

١٢ -هەرلەبەر خواجل جلاله سەردانی مردوەکان بکە،بەهێواشی وزۆر بەخوشوع و ترسەوە بۆ گۆڕستان ڕێبکە،زۆر دوعا ونزا بۆ مردوەکان بکە،لەسەرگۆڕەکان دامەنیشە گوناهە، جنێو بەمردوەکان مەدە وزەمیان مەکە،چراو وگلۆپیان بۆ پێ مەکە،کاری بێ شەرعی لەگۆڕستاندا ئەنجام مەدە، زۆر تۆبە وپەشیمانی دەربڕە، و لەگۆڕەکان نزیك بیەوەو سەلام لەمردوەکان بکەو بڵێ:{**السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وإنّا إن شاء اللهُ بكم لاحقون**}([5]).

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] الآداب الإسلامية، محمود المصري،ل:٥٤٦ .

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل:٩٣.

[5] أخرجه مسلم في صحيحه.بروانه:منهاج الصالحين ،ب١ /ل:٥٠٥-٥٠٨.

١٣- نابێ گۆڕەکان هەڵبەستی، یان خانو وبینایان لەسەر دروست بکەیت، هەروا نابێ بڕوات وابێ کەئەو مردووانە قازانج،یان زەرەر وزیانیان بەدەستە،چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لعَن اللهُ اليهودَ والنصارى اتّخذوا قُبورَ أنبيائهم مساجدَ}(١).
واتە:خوا جل جلالە نەفرینی لەگاور وجولەکەکان کردوە،چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردبو بەمزگەوت.(٢).

## دوازدەیەم: ئادابەکانی میوانداریەتی میوان:

مسوڵمان بڕوای وایە ڕێزگرتن لەمیوان واجبە،ویەکێکە لەورەوشتە بەرزانەی کەئیسلام خەڵکی لەسەر هەڵدەنێ،چونکە سەخاوەتی وڕێزگرتن لەخەلك دڵەکان هۆگری یەکتر دەکات، وخەڵکی لەیەکتری نزیك دەکاتەوە.بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {مَنْ كان يُؤمِنُ بالله واليوم الآخر فليُكْرِمْ ضيفَه}(٣) هەرکەسێك بڕوای بەخوا وبەدوارۆژ هەیە با ڕێز لەمیوان بگرێت ، بۆیەپێویستە ڕەچاوی ئەم ئادابانە بکەین:
١-ڕێزگرتنەکەت تەنها لەبەر خوابێت،نەك لەبەر شتی تربێت،وەخێرا زوو نانەکە دابنرێ بۆمیوان،وەلەپێشەوە میوە دابنرێ، پاشان نان وچێشت.(٤).
٢-دەرگای بۆ بکەوەو زۆر ڕێزی لێبگرە، وپێشوازی جوانی لێبکە،ولەشوێنێك دایبنێ کە شیاوی ئەوکەسە بێت،پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {تَبسُّمُك في وَجْه أخيك لك صدقةٌ}(٥) زەردەخەنەی تۆ بەرەو ڕوی براکەت خێر وصەدەقەیە، عائیشە-دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئوم هاني و بە فاطيمە ی کچی فەرموو:{مرحباً بابنتي} و{مرحباً بأمّ هانيء}(٦).
٣- کە لەگەڵ میواندا نانت خوارد، بۆخۆت خزمەتی بکە و چەندە توانای داراییت هەیە ئەوەندە خزمەتیان بکەو تەکلیفی زیاتر لەخۆت مەکە، بەڵام دەتوانی چەند جۆر خواردنیان پێبدەی، هەقی میوانداری سێ ڕۆژە، لەوە زیاتر خێر و صەدەقەیە(١).

---

[١] حديث متفق عليه.
[٢] الآداب الإسلامية،محمود المصري، ل:٥٥٥.
[٣] حديث متفق عليه.
[٤] موسوعة الآداب الإسلامية،محمد حسان، ل:٤٦٦ .
[٥] أخرجه الترمذي(١٩٥٦ ) وصحّحه الألباني في صحيح الجامع(٣٩٠٨).
[٦] حديث متفق عليه.

٤ – لەبەر میوانەکەت دەتوانی ڕۆژوەکەت بشکێنی، وە دەتوانی لەدواعیشاوە هەتا درەنگ لەبەر ئەوان نەخەوی ودابنیشی،وەهەتا بەردەرگا لەگەڵیدا بڕۆی باشە، وەهەتا میوانەکە نەڕوا دەرگاکەی لێدامەخە، نەوەك بگەڕێتەوە.([2]).

٥ –میوانداریەکەت بابۆ خوابێت، بۆ فیز و شانازی کردن نەبێت، وەخەڵکی چاك و موستەهەق بانگ بکە، نەك خەڵکی بێدین وفاسق.([3]).

٦– پێویستە گرنگی زیاتر بەو کەسانە بدریٚ کەلەبەر خاتری زانست ودین هاتوون بۆلات، ئەمانەش وەك قوتابیانی زانستەکانی شەرعی،وتێکۆشەران بۆ دین و ژینی موسوڵمانان، کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێکەوە شیری بۆهات بە ئەبوهریرەی فەرموو: {**اْلحَقْ بأهْلِ الصُفّة، فادْعُهم لي**}واتە: بڕۆ ئەهلی صوفە–هەیوانەکەی مزگەوتی مەدینە– بۆم بانگ بکە،چونکە ئەوانە میوانانی ئیسلامن،هیچ ماڵ وهیچ کەسیان نیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کەخێر وصەدەقەیەکی بۆ بهاتایە، خێرابۆئەوانی دەنارد، وهیچی بۆ خۆی نەدەگێڕایەوە.([4]).

**{سود وبەهرەیەك}** خودی میوان پێویستە ئەم چەند ئادابانە ڕەچاو بکات و بۆ خۆی ئەنجامیان بدات:

١–بە ئیخلاص ونیازی پاکەوە ولەبەرخوا وەڵامی خاوەن خواردنەکە بدەوە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**حق المسلم على المسلم ستٌ...وإذا دعاك فأَجِبْه**}([5]).

واتە:ماڧ مسوڵمان بەسەر مسوڵمانەوە شەشە........چوارەم هەر کات مسوڵمان بانگی کردی بڕۆ بۆ لای.

٢ –ئەوماڵە چیان هەبو ئەوەبخۆ، تەکلیفی زیاتر مەکە، وەپێویستە ئادابەکانی خواردن ڕەچاو بکەیت،کەنان داندرا شتێك هەر بخۆ، ئەگەر کەمیش بێت.([1]).

---

[1] الآداب الإسلامية،محمود المصري، ل:٤٦٠ .

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ /ل:٥٢٦ .منهاج المسلم،ل:١٠٣.

[3] منهاج المسلم،ل:١٠٣.

[4] أخرجه البخاري في صحيحه.

[5] أخرجه مسلم في صحيحه.

٣- خاوەن ماڵ لەپێشەوە دەست بەنانخواردن دەکات، وەئەگەر میوان کەسێکی کەوتە گەڵ پێویستە پرس بەخاوەن ماڵەکە بکرێت،وەنابێ میوان هیچ شتێك لەوماڵە بفەوتێنێ، وەك: فەرش و شتەکانی تر.([1]).

٤-بۆئیمامەت کردن خاوەن ماڵ پێشدەکەوێ، یان رێگەدەدات کەسێکیتر پێشبکەوێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**ولايَؤُمَنَّ الرّجلُ الرّجلَ في سلطانه،و لا يقْعُدُ في بيته على تَكْرِمَتِهِ إلاّبإذنه**}([2]).واتە: نابێ کەسێك لەجێی کەسێکی تر ئیمامەت بکات،وەمیوان دەبێ بەپرسی خاوەن ماڵ هەلسو کەوت بکات.

٥-میوان لەدوا نانخواردنەوە سوپاسی خاوەن ماڵ دەکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **مَنْ لم يشكُرِ الناسَ لم يشكُرُ اللهَ** }([4])هەروەهادوعاشی بۆ دەکات، ودەلێ: {**اللهمّ بارِكْ لهم في مارَزَقْتَهُم، واغْفِرْ لهم، وارْحَمْهُمْ**}([5]).ئەمە دوعای پێغەمبەرە کەکردویەتی بۆباوکی **عبد الله ي کوڕي بوسر**.([6]).

## سیازدەیەم: ئادابەکانی دیاری بردن:

ئاشکرایە دیاری بردن بۆپەیوەند کردنی دڵەکان وبۆچاندنی داری خۆشەویستی کاریگەری گەورەی هەیە، هەمو کەس دیاری بۆ بەری زۆری پێخۆشە،بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**تهادَوْا تحابُّوا**}([7]).واتە:دیاری بۆ یەکتری ببەن ، خۆشەویست دەبن.

عائیشە -رەزای خوای لێبێت-دەڵێ:(پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرت، وپاداشتی کەسەکەشی دەدایەوە بەچاکە.([8]).

---

[1] الآداب الإسلامية ،محمود المصري، ل:٤٦٥ .

[2] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٥٣٤ .

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] أخرجه الترمذي، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٥٤١ ).

[5] أخرجه مسلم في صحيحه .

[6] منهاج الصالحين، ب١ /ل:٥٤٣ ، والآداب الإسلامية،للمصري ،ل:٤٦٦، وآداب المسلم ،عبد الرحيم ماردیني، ل : ٨٧ .

[7] أخرجه البيهقي، والبخاري في الأدب المفرد(٥٩٤ ) وحسنة الألباني في صحيح الجامع(٣٠٠٤ ).

[8] أخرجه البخاري في صحيحه.

**لەبەر ئەوە دیاری بردن چەند ئادابێکی هەیە باسیان دەکەین:**

١-دیاریەکەت تەنها با لەبەر خوابێت، وەبۆخزمە نزیکەکانت باشترە، وە هەرچەندە دیاریەکە کەمیش بێت هەر وەریبگرە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**یانساء المسلمات، لا تحقرَنَّ جارةٌ لجارتها ولو فِرسن شاة**}([1]).

واتە: ئافرەتە مسوڵمانەکان دیاری بۆ یەکتری ببەن، ئەگەر سمی بزنیش بێت، وەریشیبگرن.

وە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: {ئەگر سەری مەڕێکیشم بۆ بێنن هەر وەریدەگرم}([2]).

٢-بادیاری لەکاتی موناسبدابێت، وەك كاتی چەژن، هاوسەرگرتن،دەرچون لەخوێندن، وە با دیاریەکەش موناسبی ئەوکەسەبێت، وەسوپاسی کەسەکەش بکرێت.([3]).

٣-دیاری ئەگەر پێشتخۆش نەبێ رەتیمەکەوە، بەتایبەت بۆنیخۆش ورەیحانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **أجيبوا الداعي، ولا تردّو الهدية**}([4]).واتە: کەسێك دەعوەتی کردن برۆن بۆلای، وەدیاریش مەگێڕنەوە.وەئەنەس دەلێ:پێغەمبەر ﷺ بۆنیخۆشی رەتنەکردۆتەوە.

٤- نابێ باوك دیاری بەیەکێك لەمنداڵەکانی بدا، و نەیدا بەئەوەکانی دیکە، وە نابێ فەرمانبەر دیاری وەربگرێ،چونکەپێغەمبەر ﷺ زۆر سەرزەنشتی ئەکارمەندەی کرد کە هەندێك لە مالاتی زەکاتی بۆخۆی گێرابۆوە وگوتبوی:ئەمە دیاریە بۆخۆم، وەپێی فەرموبو: خۆتۆ ئەگەر لەمالی باوکت، بان دایکت دابنیشی ئایا کەس هیچت بۆ دەهێنێ؟،([5]).

٥-کەدیاریت بەخەلکدا پەشیمان مەبەوە، تەنها لەم کاتانەدا نەبێت:

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] أخرجه البخاري في صحيحه.

[3] الآداب الإسلامية، للمصري، ل:٢٠٢ .

[4] رواه أحمد، وصححه الألباني في صحيح الجامع(١٥٨ ).

[5] حديث متفق عليه.

أ–ئەگەر دیاریەکە حەرام، یان شوبهەی لێدەکرا.
ب– ئەگەر مەبەست پێی بەرتیل وریشوە بێت.
ج–ئەگەر دیاری بۆبراوەکە کارمەند بێت.
د–ئەگەر ئەوکەسەی دیاریەکەی ناردوە، بێدین بێت، یان بێباوەڕێك بێتکەمنەتت لەسەر بکات، خۆئەگەر منەت نەکات دروستە.([1]).

## جۆرەکانی دیاری:دیاری چەند جۆری هەیە:

أ–دیاری واهەیە هەر بۆخۆشەویستی و هۆگریە، وەك دیاری گەورە بۆبچوك، مامۆستا بۆ قوتابی.
ب–دیاری واهەیە وەك چاکەوایە، ئەمەش دیاری نێوان خزمانە.
ج–دیاری واهەیە بۆخێر خۆ نزیککردنەوەیە لەخوا جل جلالە، ئەمەش دیاریە بۆ زانایان و پیاوچاکان.
د– دیاری واهەیە هەر بۆدایك وباوکی بەرێزە، کەئەمە گەورەترینیانە، چونکە چاکە کردن لەگەل دایك وباوکدا گەورەترین چاکەیە.([2]).

## چواردەیەم: ئادابەکانی هاوڕێیەتی و مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا:

ئاینی ئیسلام زۆر گرنگی بەهاوڕێیەتی داوە و زۆر بەرزی کردۆتەوە ئەوەتە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمانی بەپابەندبون لەگەڵ راستگۆیاندا کردووە و فەرمویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ التوبة: ١١٩
واتە: ئەی بڕواداران لەخوا بترسێن و لەگەڵ راستگۆیاندا بن.

هەروەها خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا

[1] الآداب الإسلامية،للمصري،ل:٢٠٦ .
[2] الآداب الإسلامية محمود المصري،ل:٢٩٨ ،ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٥٤٧ .

نُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ الكهف: ٢٨ واته: ئارام بگره لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ئێواران و بەیانیان لەخوا دەپاڕێنەوە و هەر خوایان مەبەستە.

نابێ مرۆڤی ستەمکار بکەی بەهاوڕێ وهاوەڵی خۆت قورئانی پیرۆز فەرمویەتی: ﴿ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴾ الفرقان: ٢٨

واتە: ستەمکار لەرۆژی دواییدا هاوار دەکات و دەڵێ: خۆزگە لەدونیادا فلانە کەسم – ستەمکار– نەکردایە بەدۆستی خۆم، چونکە لەرێگەی راستی لادام و گومرای کردم.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: {**المرء على دين خليله، فلينظرْ أحدُكُم مَنْ يُخالل**}[1]

واتە: مرۆڤ لەسەر ئاینی دۆستو خۆشەویستەکەیەتی دە ئێوە تەماشا بکەن بزانن ئێوە دۆستایەتی کێ دەکەن؟

وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لاتصاحِبْ إلاّ مؤمناً، ولا يأكلْ طعامَك إلاّ تقيٌّ**}[2]

واتە: تەنها هاوڕێیەتی بڕوادار بکە، وە تەنها باپارێزکار(متقی) خواردنەکەت بخوات.

**لەبەر گرنگی هاوڕێیەتی ومامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا لەئاینی ئیسلامدا پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەم ئادابانە بکەین:**

١–ئەو کەسەی کە تۆ هەڵیدەبژێری ودەیکەی بەهاوڕێی خۆت، پێویستە ئەم مەرجانەی تێدابێت:

١)ژیریەکی (عقل ) کامڵ وتەواوی هەبێت.

٢)ئاینێکی راست ودروستی هەبێت.

٣)ڕەوشتی چاك وجوانی هەبێت.

---

[1] رواه ابو داود(٤٨٣٣) والترمذی (٢٣٧٨)وأحمد(٧٩٦٨ ) وحسنه الألباني في السلسلة الصحيحة(٩٢٧ ) وهو حديث حسن.

[2] رواه ابو داود(٤٨٣٢ ) والترمذی(٢٣٩٥ ) واحمد(١٠٩٤٤).وحسنه الألباني في صحيح الجامع (٧٣٤١) وهو حديث حسن.

## لقمانی حەكیم ئامۆژگاری كوڕەكەی كرد وگوتی:

١-ئەی كوڕی خۆم: لەگەڵ زانایاندا دابنیشە و بەچۆك لێیان بچۆ پێشەوە، چونكە چۆن زەوی بەباران دەژێتەوە، ئەوهاش دڵەكان بەحیكمەت و زانست وزانیاری دەژیەنەوە.

٢-خۆت لەهاوڕێیەتی مرۆڤی نەزان وبێ دین وبێ عەقڵ بپارێزە، ئیمام جعفری صادق گوتویەتی: هاوڕێیەتی پێنج كەس مەكە:

١/مرۆڤی درۆزن، چونكە درۆزن وەك سەرئاویلكە وایە، دورت لێ نزیك دەكاتەوە و نزیكت لێ دور دەخاتەوە.

٢/مرۆڤی بێ عەقڵ، دەیەوێ قازانجت پێبگەیەنێ، بەلام زەرەرت لێدەدا.

٣/مرۆڤی ترسنۆك وجەبان،لەكاتی تەنگانەدا خۆی ناگرێ، ورادەكات.

٤/مرۆڤی رەزیل و پیسكە، چونكە پێویستیترین شتت ناداتێ.

٥/مرۆڤی فاسق و بێدین، چونكە بەتیكەیەك یان كەمتر دەتفرۆشێ([1]).

٣-تەنها لەبەر خوا جل جلالە هاوڕێیەتی خەڵك بكە، ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەر كەسێك سێ شتی تێدا بێ، ئەوە شیرینیایەتی باوەڕی چەشتووە:

ا /خواو پێغەمبەرەكەی لەهەموو شتێك زیاتر خۆشی بوێت.

ب/هەر مرۆڤێكی خۆشدەوێ، تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت .

ج/پێی ناخۆشبێ كە بگەڕێتەوە بۆ ناو كوفر وبێباوەڕی، دوای ئەوە كە خوا رزگاری كردوە لێی هەروەك چۆن پێی ناخۆشە كە بخرێتە ناو ئاگرەوە.([2]).

٤-هەر كەسێكت خۆش دەوێ ئاگاداری بكەوە كە تۆ ئەو كەسەت خۆشدەوێ، میقداد گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إذا أحبّ أحدكُمْ أخاه فَلْيُعلِمْه أنّه يحِبُه}[3] .

واتە: هەر كەسێك برایەكی خۆی خۆشویست ئەوە باپێی بڵێ: كەوا خۆشی دەوێ.

---

[1] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ /ل:١٠٠.

[2] حديث متفق عليه.

[3] رواه أحمد(٤/ ١٣ والبخاري في الأدب المفرد، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٢٧٩) والحديث صحيح.

٥-هاوڕێکەت وخەڵك وەك خۆت حیساب بکە، هەرچی خێروخۆشی وچاکە هەیە هەی بێت، وهەرچی ناڕەحەتی و ناخۆشی هەیە لێی دور بێت، ئەنەس گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لایؤمن أحدُکُم حتی یُحِبّ لأخیه مایُحِبّ لنفسه**}(١). واتە: هەتا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ براکەشت پێت خۆش نەبێت بڕوات تەواو کامڵ نابێت.

٦-زۆر سەردان وئامۆژگاری وبەخشینت بۆ خەڵك وبۆ براکەت بکە لەبەر خوا جلجلالە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {کابرایەك سەردانی برایەکی لەدێیەك کرد، خوا جل جلالە فریشتەیەکی ناردە سەر ڕێگەکەی پرسیاری لە کابراکە کردو گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی کابراکەش گوتی: دەچم سەردانی برایەکم دەکەم لەم دێیەدا، فریشتەکە گوتی: هیچ ماڵ و سامان و نیعەتێکت لەلایەتی کە پێوەی بچی؟ کابراکە گوتی: نەخێر، تەنها ئەوە نەبێ من لەبەرخوا ئەو کەسەم خۆشدەوێ و سەردانی دەکەم، فریشتەکە گوتی: دەبزانە من نێردراوی خوام بۆلای تۆ کە پێت بڵێم: خوای پەروەردگار تۆی خۆشدەوێ، وەك چۆن تۆ ئەو کەسەت خۆشدەوێ.}(٢).

٨-زوو پەلە بکە بەخۆت و ماڵ و سامانتەوە، یارمەتی خەڵکی لێقەوما وهەژار ونەدار وهاوڕێکەت بکە،وخەم وپەژارەیان لەسەرلابە وبەسەر خۆتدا هەڵیان بژێرە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ نفَّس عن مؤمنٍ کَرْبةً من کُرَب الدّنیا نفَّس اللهُ عنه کَرْبةً من کُرَب یوم القیامة، و منْ یسّر علی معسرٍ یسّر الله علیه في الدنیا والآخرة، و منْ سَتَر مسلماً سَتَره اللهُ في الدنیا والآخرة، والله في عَوْن العبد،ماکان العبدُفي عَوْن أخیه**}(٣) واتە: کەسێك تەنگ و چەڵەمەیەك لەبڕواداڕێك لەدونیادا لاببا، خوا تەنگ و چەڵەمەیەك لەتەنگ و چەڵەمەکانی ڕۆژی دوایی لەو لادەبا، وە کەسێك کارئاسانی بۆ قەرزار و نەدارێك بکا،خوا جلجلالە لەدونیاو لە دوا ڕۆژدا کارئاسانی بۆ دەکات، وە کەسێك کەموکوڕی مسوڵمانێك داپۆشێ، ئەوە خوا جل جلالە لەدونیا و لەدوا ڕۆژداکەم و کوریەکانی ئەو دادەپۆشێت، خوا جل جلالە یارمەتی بەندەکەی خۆی دەدا مادام بەندەکەی یارمەتی براکەی خۆی بدا.

---

١ حدیث متفق علیه.

٢ أخرجه مسلم في صحیحه.

٣ أخرجه مسلم في صحیحه.

٩-بەگوێرەی توانا دیاری ببە بۆ هاوڕێ و دۆستەکانت و بەسەریان بکەوە، ئەبو هریرە گێڕایەوە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {**تهادَوْا تَحابُّوا**}([1]) واتە:دیاری بۆ یەکتری ببەن خۆشەویستیتان زیاد دەکات.

١٠-هەر کاتێك گەیشتی بەخەڵك وبە هاوڕێکەت تۆ لەپێشەوە سەلامی لێ بکەو تەوقەیان لەگەڵدا بکە بەزەردەخەنەو ڕوخۆشیەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : {**مامِنْ مسلمَيْن يلتقيان فيتصافحان، إلاّ غُفِر لهما قبل أَنْ يَفْترقا**}([2]) واتە: هەر دوو برای موسڵمان کە بەیەك بگەن و تەوقە لەگەڵ یەکتریدا بکەن، ئەوە پێش ئەوە کە لێك بترازێن خوای پەروەردگار لەگوناهیان خۆشدەبێت.

١١-نهێنی خەڵك وهاوڕێکەت بەهیچ شێوەیەك بڵاو مەکەوە،ولەلای کەس باسی مەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**مَنْ سَتَر عورة أخيه المسلم، سَتَره اللهُ في الدنيا و الآخرة**} ([3]) واتە:هەرکەسێك ئابڕوی براکەی داپۆشێ،خواجلجلاله لەدونیا ولە دوارۆژدا ئابڕوی ئەو دادەپۆشێ،وە یەکێك لەزانایەکان گوتویەتی: هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە نهێنیەکەت ناشارێتەوە و کەم کوڕیەکانت داناپۆشێ.([4]).

١٢-ئەگەر دوو نەفەر یان دوو برا کێشەیان هەبوو، خێرا هەستە وچارەی بکە، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{**ألا أُخْبِرُكُم بأفضلَ مِنْ درجة الصيام والصلاة والصدقة**} واتە:پێتان بلێم بەشتێك چاکتربێ لەپلەی ڕۆژو ونوێژ وخێر وصەدەقە؟، یارەکان گوتیان:بەلێ،ئەمجا فەرموی: {**إصلاح ذات البَيْن،فإِنَّ إفسادَ ذات البَيْن هي الحالقة**}([5]). واتە:چاك کردنەوەی نێوان برایانە، چونکە تێکدانی نێوان برایان تاشێنەری چاکەکانتە و تێکدانی شتەکانە.([6]).

---

[1] صحيح الأدب المفرد للبخاري،١ /٢٣٥وقال: حديث صحيح الإسناد.

[2] اخرجه ابو داود(٤/٣٥٤ والترمذي (٥/٧٤ ) كتاب الأستئذان و قال الترمذي : حديث حسن غريب من حديث ابي اسحاق عن البراء.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل:١٠٧.

[5] أخرجه أبو داود (٤٩١٩) وصححه الألباني في المشكاة(٥٠٣٨).

[6] الآداب الإسلامية،للمصري ل:٢٦٥-، ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٤٦٠ -٤٦٦ .

{سود وبەهرەیەك} پێشینە چاكەكانی ئیسلام چەند ئاداب و مامەڵەیان لەگەڵ بێباوەڕاندا هەبوە،لەچەند خالێكدا باسیان دەكەین:

١-ئاینی ئیسلامیان نیشاندەدەین، بەلام زۆر وتۆبزیان لیٚ ناكەین، مسولمان دەبن، یان مسولمان نابن، ئازادن، ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف:٢٩،هەركەس بڕوا دەهێنیٚ، یا بڕوا ناهێنیٚ ئازادە.

٢-بە جوانترین شێوە گفتوگۆ و موجادەلەیان لەگەڵدا دەكەین،[ولا تجادلوا أهل الكتاب إلاّ بالتی هي أحسن].

٣-چاكە وخێروخێراتیان لەگەڵدا دەكەین و تەواو بەزەییمان پێیاندادێتەوە بەدابین كردنی ژیان وگوزەرانیان وبژێویان.

٤-بەبیر وباوەڕی ئەوان رازی نابین ونایانكەین بەگەورەی خۆمان.

٥-نابیٚ ئەزیەت وئازاربگەیەنین بەخۆیان ومالٚ وسامان وخێزان ومنداڵیان، ونابیٚ ستەمیان لێبكەین، ولەسەر كوفرەكەیان موحاسەبەیان ناكەین.

٦-دروستە ئێمە دیاریان بۆ بەرین، ودیاریشیان لیٚ وەربگرین،ونانیان بخۆین، و كە پشمین دوعایان بۆبكەین، وە كە سەلامیانكرد ئێمە وەك خۆی وەلامیان دەدەینەوە، وە بە پەیمان بەستن لەگەڵیاندا ئێمە پابەند دەبین.

٧-نابیٚ ئێمە لاسایی بێباوەڕان بكەینەوە، وەنابیٚ بەدزیەوە دۆستیان لیٚ بگرین، وە ناشبیٚ ئەوان بكەین بەدۆستی خۆمان.([1]).

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١/ل:٦١٠-٦١٦ ،وموسوعة الآداب الإسلامية،للشيخ أيمن والشيخ محمد حسان، ل:٢٧٢ -٢٧٨.

## پانزدەیەم: ئادابەکانی مامەڵە لەگەڵ هەتیودا:

**لە ئەستۆگرتنی هەتیو وچاکەکردن لەگەڵیدا:**

هەتیو یەکێکە لەوانەی کەخوا جل جلالە لەکتێبەکەی خۆیدا فەرمانی بەئێمە کردوە چاکەیان لەگەڵدا بکەین، ئەوەتە فەرمویەتی: ﴿.... لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ ... ﴾ البقرة: ٨٣. واتە: ئێوە بەندایەتی خوابکەن....و چاکە لەگەڵ دایك و باوكدا بكە..... و هەتیوەکاندا بکەن.([1]).

**لە ئەستۆ گری هەتیو لەگەڵ پێغەمبەردایە لەبەهەشتدا:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**أنا وكافِلُ اليتيم كهاتَيْن في الجنّة**} **و أشار بالسبابة و الوسطى**. ([2]). واتە: من و لە ئەستۆگریٚ هەتیو، لە بەهەشتدا وەك هەردوو پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شادە واین، واتە: هەردوکمان بەیەکەوە دەبین لەبەهەشتدا.

**پیرۆزی یارمەتیدانی بێوەژن و هەژاران:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**الساعي على الأرملة و المسكين كالمجاهد في سبيل الله، أو القائم الليل، الصائم النهار**}([3]).واتە:تێکۆشان ویارمەتیدانی بێوەژن وهەژاران وەك کەسێکە کە لەڕێی خوادا جیهاد دەکات.یان وەك کەسێکەشەونوێژ بکات، وبەڕۆژیش بەڕۆژوو بێت. بێوەژن بەزۆری منداڵی هەتیوی هەیە بۆیە یارمەتیدانی ئەوەندە خێرە و چاکە.([4]).

**خواردنی ماڵی هەتیو گەورەترین گوناهە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **اجْتنِبوا السبعَ المُوبِقات**}خۆتان لەوحەوت گوناهە فەوتێنەرە بپارێزن، یارەکان گوتیان ئەوانە کامانەن؟پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٤٨٨ .

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] حديث متفق عليه.

[4] الآداب الإسلامية، للمصري ، ل:٢٨٧ .

{الشِّرْكُ بالله.... وأَكْلُ مالِ اليتيم....}(1).واته:خواردنی مال وسامانی هەتیو یەکێکە لەو گوناهە گەورانە.

لەبەر ئەوە زیاد لەوانەی کەباسمان کردن، هەتیو کۆمەڵێك ئادابی هەیە باسیاندەکەین:

١-لەئەستۆگرتنی هەتیو ودابینکردنی بژێوی ژیانیان،وەك فەرمودەکەیپێغەمبەر ﷺ کەلەپێشەوە باسمان کرد.

٢-بەردەوام چاکەیان لەگەڵدا بکەین، ودلیان خۆش بکەین، وئەزیەتیان نەکەین.

٣-دەست بەسەریاندابێنین، ودلیان خۆش بکەین، ودوعایان بۆ بکەین،وەدیاریان بۆ بەرین،وستایشیان بکەین.

٤-دەبێ ئێمە ماڵ وسامانیان بپارێزین،خواجلجلاله فەرمویەتی:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ﴾ النساء: ١٠

٥ -لەلای هەتیو نابێ ئێمە شانازی بەباوك و باپیرانەوە بکەین،چونکە شانازی کردن بەباوك و باپیرانەوە نەریتێکی سەردەمی نەفامیە،ئیسلام قەدەغەی کردوە.(2).

## شانزەیەم:ئادابەکانی پیر وتەمەندارەکان:

مرۆڤی پیر وتەمەندار لەئیسلامدا زۆر رێز وحورمەتی گەورەی لێگیراوە لەهەمو بوارەکانی ژیانی کۆمەلایەتی، ئابوری ،تەندروستی، دەرونیدا،بەپێچەوانەی سیستەمە عەلمانیەکان،چونکە ئەوان تەنها لەیەك بواردا گرنگیانداوە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : {ليس منّا مَنْ لم يرحمْ صغيرَنا،ويوقّرْ كبيرَنا}وە لە ڕیوایەتێکیتردا هاتوە {ويَعْرِفْ حَقَّ كبيرنا}(3)ئەوەی ڕێز لەگەورەکانمان نەگرێ، ومافیان نەزانێ لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە، بۆیە پیرەکان چەند ئادابێکیان هەیە دەبێ جێبەجێیان بکەین، بەم شێوەی باسی دەکەین :

---

1 أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

2 الآداب الإسلامية، محمود المصري، ل:٢٨٨.ومنهاج الصالحين،ب١ /ل:٥٩٧ .

3 رواه أبوداود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.

١ –پیر وبەتەمەنەکان لەهەمووشتێکی وەك ئیمامەتکردن،قسەکردن بۆ خەلك، وەرگرتن و بەخشین و هتد..، لەسەر بچوك پێش دەخرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**..لیلیني منكم أُولُوا الأَحْلام والنهى، ثمّ الذين يَلُونهم...**}([1])واتە:باپیاوە بالغ و ژیرەکان لە دوا منەوە لەپێشەوە بن، ئەمجا لەدوا ئەوانەوە بچوکەکان.

٢ –دروست نیە بچوك بەچاوی سوکەوە تەماشای پیر وتەمەندار بکات، ئەبوموسای ئەشعەری گێرایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إنّمِنْ إجْلالِ اللهِ إكرامَ ذِي الشيبة المسلم،**}([2]) واتە:لەگەورەیی خوایە کەوارێز لە مسولمانی ڕیش سپی دەگرێت.

وە ئەبوهریرە بەمرفوعی لەپێغەمبەرەوەﷺگێرایەوە گوتی:{کۆڕ ودانیشتنەکان تەنها بۆ سێ کەس فراوان دەکرێن، یەکێك لەوانە پیاوی بەتەمەنە لەبەر پیریەکەی ڕێزی لێ دەگیرێ}.([3]).

٣–شەرم لەپیاوی پیرو تەمەندار بکە،سمُرەی کوڕی جندب دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ منداڵ بوم فەرمودەی زۆرم لەبەربوو،تەنها ئەوە نەیدەهێشت کە قسە بکەم کۆمەڵێك پیاوی بەتەمەن لەوێبون، منیش شەرمم لێدەکردن.([4]).

٤ –لەبەر پیاوی پیر و تەمەندار هەڵبستە، سەعدی کوڕی **معاذ** کە هاتەوە لە ڕوداوەکەی **بنوقريظه** دا پێغەمبەرﷺبە خەڵکەکەی فەرموو:{**قوموا إلى سيّدكم**}([5]) واتە: هەستن بڕۆن بۆلای برا گەورەکەتان، پێشوازی لێبکەن. ئیمام غەزالی دەڵێ:هەستان لەبەرخەڵك بەشێوەی بەگەورەزانین خەراپە، بەلام بەشێوەی ڕێز وچاکەکردن لەگەڵ ئەوکەسەدا شتێکی چاکە،ئیبن حجری عسقلانی دەڵێ: قسەکەی ئیمام غەزالی شتێکی جوانە، و منیش دەڵێم: هەستان لەبەرپیر وتەمەندار ڕێزگرتن و چاکەکردنە لەگەڵ ئەو کەسە بە تەمەنەدا و شتێکی چاکە.[6].

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه أبو داود رقم: ٤٨٤٣ والبخاري في الأدب المفرد رقم: ٣٥٧،والبيهقي ١٦٣/٨ وفي "الآداب" رقم: ٥١ والحديث حسن.

[3] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٢٧٨.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] أخرجه البخاري في صحيحه.

[6] فتح الباري لابن حجر(١٧ /٤٩٦ .

٥ –بۆ ڕێز لێگرتن دەستی پیر و تەمەندار ماچ بکەیت خێرە،زۆر لەیارەکان وەك:وەفدی عبدالقیس و اسامەی کوڕی شریك، عمری کوڕی خەتتاب و بوریدە، ئەمانە دەستی پێغەمبەریان ماچ کردوە، ئیمامی علی دەست و پێی عباسی مامی ماچ کردوە، بۆیە ئیمام نووی دەڵێ:دەست ماچکردن ئەگەر لەبەر زانست و بەدینی و چاکی بێ، خەراپ نیە، بگرە سوننەتە. بەڵام ئەگەر لەبەر دەوڵەمەندی و دەسەڵات بێ ئەوەخەراپە.([1]).

## حەڤدەیەم: ئادابەکانی سەلام کردن:

ئاینی ئیسلام ئاینی ئاشتی وخۆشەویستی برایەتیە، لەبەرئەوەیە کە ئادابی سەلام کردنی داناوە، ئەم ئادابە پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی بەهێزدەکات وگەشەی پێدەدات، لە ڕێگەی سەلامکردنەوە مرۆڤ خۆشەویستی و ڕێزی بۆ خەڵك دەردەبڕێ.
سەلامکردن یەکێکە لەناوە پیرۆزەکانی خوا جل جلالە وەك فەرمویەتی:﴿الملك القدّوس السَلام﴾، وە یەکێك لەناوەکانی بەهەشت ناوی سەلامە، وەك فەرمویەتی:﴿لهم دار السلام عند ربهم﴾، ووشەی سلام علیکم واتە: تۆ هەمیشە سەلامەت بی و لەژێر چاودێری خوادا بیت و خوا بتپارێزێ.
لە بەرئەوەی کە سەلام کردن گرنگی زۆری هەیە لەژیانی مرۆڤدا، پێغەمبەر ﷺ لە ڕاسپاردە و ڕێنموییەکانی خۆیدا خەڵکی زۆر بۆ سەلامکردن هەڵناوە و شارەزایی کردون ، کابرایەك پرسیاری لێ دەکات و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئیسلام کامەی چاکە؟ ئەویش فەرموی: {**تُطْعِم الطَعامَ وتقرئ السلام على مَنْ تَعْرِف ومَنْ لاتعْرِف**}([2]). واتە: خواردن بەخەڵك بدە، سەلام بکە لەو کەسانەی کە دەیانناسی و لەو کەسانەش کە نایان ناسی. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ سەلامکردنی لەیەکتری کردۆتە هۆکاری چونە بەهەشتەوە ئەوەتە فەرمویەتی: {**لاتدخُلوا الجنّة حتى تؤمنوا، ولاتؤمنوا حتى تحابُّوا ألاَ أدلّكُم على شيْء إذا فعلتُموه تحابَبْتُمْ؟ أفْشُوا السّلام بينكم**}([3]) . واتە: هەتا بڕوا نەهێنن ناچنە بەهەشتەوە، هەتا یەکتریشتان خۆش نەوێ بڕواتان نەهێناوە،

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ي٢ /ل:٢٨٠ .

[2] أخرجه البخاري ومسلم.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

با کارێکتان پێ بڵێم کە ئەو کارەتان کرد، یەکترتان خۆشبوێ؟ سەلامکردن لە نێوانتاندا بڵاوبکەنەوە. واتە: بە سەلام کردن لەیەکتری بەزۆری خۆشەویستی و ڕێزو حورمەتتان بۆ یەکتری زۆر دەبێت و زیاد دەکات.

**لەبەرئەوە سەلامکردن چەند ئاداب و ڕەوشتی بەرزی هەیە پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەو ئادابانە بکەین و جێبەجێیان بکەین:**

١-پابەندبون بەووشەی سەلامکردنەوەوبڵێ: **السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**، وەڵامدانەوەکەشی بڵێ: **وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته.**([1]).

٢-سەلامکردن، واتە:گوێڕایەڵی خوا وپێغەمبەرەکەیﷺ،وبڵاو کردنەوەی ئەمان و خۆشەویستی لەناو مسوڵمانانداا، بەرائی کوڕی عازیب دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی حەوت شتی پێ کردین:

أ/سەردانیکردنی نەخۆش.

ب/بەشوێن جەنازە کەوتن.

ج/دوعای بەزەیی کردن بۆ ئەو کەسەی کە دەپشمێ.

د/سەرخستنی مرۆڤی لاواز و بێ هێز.

ه/یارمەتی و کۆمەکی کردنی ستەم لێکراو.

و/بڵاوکردنەوەی سەلامو ئاشتی لەناو خەلکیدا.

ز/سوێند نەشکاندنی کەسێك کە سوێندت لێدەخوات([2]).

٣-پێش ئەوەی قسەبکەیت سەلام بکە، وە کۆتایی دانیشتن و قسەکەشت هەر بەسەلام کردن بهێنە، ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إذا انتهى أحدُكُم المجلس فليسلّم فإذا أراد أن يقوم فليسلّم، فليست الأُولَى بأحقّ من الآخرة**}([3]).

واتە: یەکێك لە ئێوە کەهاتە کۆڕێکەوە با سەلام بکات، کە ویستیشی لەو شوێنەدا هەڵبستێ هەر باسەلام بکات، هەردوکیان ئەم دوانە وەك یەك وان.

---

[1] الآداب الإسلامية،للمصري،ل:٤٢١ .

[2] حديث متفق عليه.

[3] رواه أبو داود(٥٢٠٨) والترمذي (٢٧٠٦) وصححه الألباني في الصحيحة(١٨٣).

٤-هەر جارێك هاتیە ماڵەوە ولەماڵ دەرچووی سەلام بکە، ئەنەس گێڕاویەوە پێغەمبەر ﷺ پێی ووتم: {**یابُنَیّ إذا دخلتَ علی أهلك، فسلّم تكن بركةً عليك وعلى أهل بيتك**}([1]) واتە: ئەی کوڕەکەم: هەر کاتێك چویە ماڵەوە سەلامیان لێ بکە، ئەو سەلامکردنە دەبێتە فەڕو پیرۆزی بۆ ئەهلی ماڵەوەتان.

٥-هەر جارێك گەیشتی بەبرا مسوڵمانەکەت سەلامی لێ بکە، هەرچەند کاتەکەشی کەم بێت، ئەبوهریرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إذا لقی أحدكم أخاه فليسلّم عليه، فإنْ حالتْ بينهما شجرةٌ أو جدارٌ أو حجر،ثم لَقيه فليسلّم عليه**}([2]) واتە: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە گەشت بەبراکەی سەلامی لێ بکە، جا ئەگەر دارێك، بەردێك، دیوارێك کەوتە نێوانەوە پاشان پێی گەیشتەوە ئەوە با سەلامی لێ بکاتەوە.

٦-هەر کاتێك تێپەڕیت بەلای کۆمەڵێکی زۆردا سوننەتە سێجار سەلامیان لێ بکە،تا سەلامەکەیان پێ بگات، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: {**أنّ النبیّ ﷺ إذا تكلّم بكلمةٍ أعادها ثلاثاً حتی تفهم عنه، وإذا أتی علی قومٍ فسلَّم عليهم سلّمَ عليهم ثلاثاً**}([3]).واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك قسەیەکی بکردایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە بۆئەوە لێی حاڵی بونایە، وە ئەگەر بچویایە بۆلای خەڵك سێ جار سەلامی لێ دەکردن.

٧-رۆیشتوو سەلام لەوەستاو دەکات،سوار سەلام لەپیادە دەکات، و بچوك سەلام لەگەورە دەکات، تاك سەلام لەکۆمەڵ دەکات، و کەم سەلام لەزۆر دەکات، بەم پێیە ئەبوهریرە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**یُسلِّمُ الراكبُ على الماشي، والماشي على القاعد، والقليل على الاكثر**}([4]) واتە: سوار سەلام لەپیادە دەکات و رۆیشتوو سەلام لەدانیشتوو دەکات و کەم سەلام لەزۆر دەکات.

٨-کاتێك کۆمەڵێك بێن بۆلای تاکە کەسێك دروستە یەکێك لەکۆمەڵەکە سەلام بکات لەباتی ئەوانیکە،وەئەگەرتاکێك بێ بۆلای کۆمەڵێك و سەلام بکات لێیان، ئەوە دروستە

---

[1] رواه الترمذي رقم:(٢٦٧٨) وقال: هذاحديثٌ حَسَنٌ غريبٌ.

[2] أخرجه البخاري في الأدب المفرد (١٠١٠).

[3] حديث متفق عليه.

[4] حديث متفق عليه.

یەکێك لەو کۆمەڵە وەلاّم بداتەوە لەباتی ئەوانی تر،چونکە لەم بارەوە فەرمودەی پیرۆز هاتووە.([1]).

٩-سوننەتە لەشەودا بەدەنگی نزمەوە سەلام بکەیت،میقداد گێڕایەوە گوتی: ئێمە بەشە شیرەکەی پێغەمبەرمان بۆ هەڵدەگرت، هەتا پێغەمبەر ﷺ لەشەودا دەهات وسەلامێکی وای دەکرد خەوتوەکانی بەخەبەر نەدەکردەوە وبەخەبەربووەکانیش گوێیان لێ دەبوو.([2]).

١٠-هەر کاتێك چویە ماڵەوە کەسی لێ نەبوو سوننەتە بڵێی: **السلام علینا وعلى عباد الله الصالحين**، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿....فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً ...... ﴾النور: ٦١ واتە: کاتێك کە چونە ماڵانەوە سەلام لەسەر خۆتان بکەن، بەسەلامێکی خوایی پاك و پیرۆز.

١١-کاتێك بەلای منداڵاندا ڕۆیشتی سەلامیان لێ بکە، ئەنەس کاتێکە کە بەلای منداڵاندا دەڕۆیشت سەلامی لێ دەکردن ودەیگوت: پێغەمبەر ﷺ وای دەکرد.([3]). لە ڕیوایەتێکیتردا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای کۆمەڵێك منداڵدا ڕۆیشت، سەلامی لێ کردن.

١٢-لەگەڵ سەلامکردنەکەدا تەوقەکردن ودەست لەملکردن و ماچکردن شتێکی باشە، بەلاّم خۆ چەماندنەوە بۆی خەراپە، ، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: کابرایەك گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ یەکێك لەئێمە بەبرایەکی دەگا بۆی بچەمێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، کابراکە گوتی: ئەی دەستی بگرێ و تەوقەی لەگەڵدا بکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.([4]).وەئەبوهریرە گێڕایەوە گوتی: {**فَجَاءَ يَشْتَدُّ حَتَّى عَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ، وَقَالَ: اللَّهُمَّ أَحْبِبْهُ وَ أَحِبَّ مَن يُحِبُّهُ**}([5]) .

---

[1] منهاج الصالحين، ب١ /ل:٤٧٣.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] حديث متفق عليه.

[4] رواه الترمذي، قالالإمام النووى فى " الرياض " ١ / ٢٨٧ : قال الترمذى : حديث حسن .

[5] أخرجه الحميدي (١٠٤٣). وأحمد ٢/٢٤٩(٧٣٩٢) وفي ٢/٣٣١(٨٣٦٢) والبُخاري٣/٨٧(٢١٢٢) ،وفي الأدب المفرد (١١٥٢)، وهو حديث صحيح.

واتە: پێغەمبەرﷺهات و هەتتا دەستی لەملی حسنی کوری ئیمام عەلی کرد، وماچی کرد، وفەرموی: خوایە ئەمکورەت خۆشبویٚ، وهەرکەسێکیش ئەمی خۆشدەویٚ ئەویشت خۆش بویٚ.[1]

١٣-لەگەڵ تەوقەدا سوننەتە ڕووت گەش وخۆشبێت بەگەرمی و گوڕییەوە تەوقە بکەیت، لەم بارەوە ئەبو زەر دەگێڕێتەوە گوتی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: {**لاتحقرنّ من المعروف شيئاً ولو أن تلقى أخاك بوجهٍ طليقٍ**}[2] واتە: چاکەت بەلاوە کەم نەبێت هەرچەندە چاکەکە ئەوە بێت کە بەڕوویەکی گەش و خۆشەوە بگەی بەبرایەکەت.

١٤-سەلامکردن لەوکەسەی کە لەسەر ئاوە ناپەسەندە وخەراپە، هەروەها سەلامکردن لەخەوتو، نوێژ خوێن، دەستنوێژ هەڵگر، قورئان خوێن، ئەو کەسەی بەزیکرو دوعاوە مەشغولە، سەلامکردن لەمانە ناپەسەندە، چونکە ئەمانە بەخواپەرستیەوە خەریکن با نەپچڕێن.([3]).

١٥-لەگەڵ سەلامکردن لە مەحرەمەکانت سلامیش لەئافرەتە نامەحرەمەکان بکە، بەمەرجی ئەمین بون لەفیتنە، وە بۆ ئافرەتە نامەحرەمەکانیش دروستە سەلام لەپیاوان بکەن، ئەسما ئەگێڕایەوە گوتی:ئێمە کۆمەڵە ئافرەتێك بوین پێغەمبەرﷺ بەلاماندا هات و سەلامی لیٚ کردین.([4]).

سەهلی کوری سەعد گێرایەوە گوتی:ئافرەتێك سلق بەجۆی لێدەنا لەسەر ڕێگەکەمان بو، ئێمەش کەنوێژی جمعەمان دەکرد، دەچوینەلای وسەلاممان لێدەکرد، وئەو سلق بەجۆیەی پێدەداین دەمان خوارد.[5].

---

[1] موسوعة الآداب الإسلامية، للشيخ المزين، والشيخ محمد حسان، ل:٢٢٩ .

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[3] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ ل: ١٢٢ .ومنهاج الصالحين،ب١/ل:٤٧٢ ،والآداب الإسلامية،محمود المصري،٤٣٥

[4] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما

[5] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

ئوم هانيء گێڕایەوە گوتی:چوم بۆلای پێغەمبەرﷺلەکاتی فەتحی (مەککە)دا خۆی دەشۆری، وفاتیمەی کچی پەردەی لێکردبو، منیش سلامم لێکرد، ئەویش وەڵامیدامەوە و فەرموی: {مرحباً بأمّ هانيء}[1].

وەهەموو جارێك کەجبرائیل(علیه السلام) دەهات،بەپێغەمبەرداﷺسەلامی دەنارد بۆ عائیشە-رضي الله عنها- ئەویش وەلامی سەلامەکەی دەدایەوە، ودەیگوت:(وعلیه السلام ورحمه الله)، بۆیە ئیمام نووی دەلی:لەم فەرمودەدا ئەوە هەیە سوننەتە سەلام بنێردرێ بۆخەلکی تر، وپێویستە ئەوکەسەشکەراسپێرراوە سەلامەکە بگەیەنێتە کەسەکە.([2]).ئەم فەرمودانە ئەوە دەگەیەنن کەسەلامکردن لەسەر ئافرەتی نامەحرەم ، و سەلام بۆ ناردنیشی دروستە، وفەرمودەی راست ودروستی لەسەر هاتوە.

## هەژدەیەم: ئادابەکانی پرس کردن بوچونە مالآن:

ئەدەبو ڕەوشتی پرس کردن یەکێکە لەئادابە بەرزەکانی ئاینی ئیسلام، ئەو ئەدەبە ئەدەبێکی جوان و بەرزە، ئاینی ئیسلام ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەی هێناوە، لەسەردەمی پێش ئیسلام ئەو ئەدەبە نەبووە و نە ناسراوبوە ، بەڵکو خەڵك بەبێ پرس کردن خۆیان دەکرد بەماڵەکاندا و ئاگاداردەبوونەوە لەسەر ئابڕو و شەرەفی یەکتری و بەنهێنیەکانی یەکتریان دەزانی، جا بۆئەوەی کە خەڵك نهێنیەکانی و ئابڕوو شەرەفیان پارێزراو بێت، ئاینی ئیسلام ئەدەبی پرسکردنی دانا، ئەم پرسکردنەش چەند ئادابێکی هەیە پێویستە ئێمە ڕەچاویان بکەین و ئاگامان لێیان بێت بەم شێوەی کە باسیان دەکەین:

١-پرسکردن بۆچونە ماڵەوە هەتا لەسەر (دایك وباوکیش) پێویستە وەك فەرمودەی پیرۆز ئەمەی ڕوون کردۆتەوە.[3]

٢-لەکاتی پرسکردندا لەلای ڕاستی دەرگاکەوە، یان لەلای چەپی دەرگاکەوە بوەستە، وە کاتێك کە دەرگاکەیان بۆ کردیەوە تەماشای ناو ماڵ و حەوشەکە مەکە، چونکە

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[2] صحيح مسلم بشرح النووي،٨ /٢٠٨.

[3] منهاج الصالحين،ب١ :ل:٥١٥ .

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنّماجُعِل الاستئذانُ من أجل البصر}([1]) واتە: پرسکردن تەنها لەبەرئەوەیە کە تەماشای ماڵ نەکرێت.

٣-نابێ بچیە ماڵانەوە هەتا پرس نەکەیت، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ (النور: ٢٧) واتە: ئەی بڕوادارەکان مەچنە ماڵانەوە هەتا داوای هۆگری نەکەن و هەتا سەلام لەخەڵکەکە نەکەن.

٤-پێویستە پرسکردن و سەلام کردن بەیەکەوەبن کلدەی کوڕی حەنبەل گێڕایەوە گوتی: چوم بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەلاّم سەلامم نەکرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {ارْجِعْ، فقُلْ: السلامُ عليكم أأَدخُلُ؟}([2]) واتە: بگەڕێوە بڵێ: السلام علیکم ئایا بێمە ژوورەوە؟ ئیبن عباس گوتی: عمری کوڕی خەتتاب پرسی لەپێغەمبەر ﷺ وەرگرت وگوتی: (السلام علی رسول الله) ئایا عمر بێتە ژوورەوە.([3]).

٥-لەسێ جار زیاتر لەدەرگا یان لەجەرەس مەدە، وە نێوان هەر لێدانێکیش با کەمێکی پێ بچێ، وە ئەگەر ڕێگەیان نەدای بگەڕێوە؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {الإستئذان ثلاثٌ فإنْ أذِن لك، وإلّا فارْجِعْ}([4]) واتە: پرسکردن سێ جارە، جا ئەگەر ڕێگەیان دای ئەوە بچۆ ماڵەوە، ئەگەر ڕێگەیان نەدا و داوایان کرد بگەڕێیەوە ئەوە بگەڕێوە.

٦-ئەگەر خاوەن ماڵ پرسیاری کردو گوتی: ئەوە کێیە لە دەرگا دەدات؟ پێویستە ئەویش ناوی خۆی بڵێ نابێ هەر بڵێ: منم، چونکە هەر بەوەندە ناناسرێ، جابیر گێڕایەوە گوتی: من ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ و لەدەرگام دا ئەویش فەرمووی: ئەوە

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه.

[2] رواه ابو داود والترمذي وقال : حديث حسن.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

کێیه منیش گوتم: ئەوە منم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چیه دەڵێی: منم، منم؟ جابیر گوتی: وا پێدەچوو کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ووشەی پێ ناخۆشبوو.([1]).

وە لە فەرموودەکەی شەو ڕەویدا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: جبرائیل منی لەگەڵ خۆیدا بردو لەدەرگایدا گوتیان: ئەوە کێیە؟ جبرائیل گوتی: منم جبرائیل، گوتیان: ئەی کێت لەگەڵدایە؟ جبرائیل گوتی: محمدم لەگەڵدایە، بەم شێوەی گوت جبرائیل لەهەموو ئاسمانەکاندا.([2]).

٧-ئەو منداڵانەی کە باڵغ نەبوون پێویستە فێربکرێن کە لەسێ کاتدا پرس بکەن کەدەچن بۆلای دایكو باوکیان. یەکەم: کاتی بەیانی، دوهەم: کاتی نیوەڕۆ، چونکە کاتی ئیسراحەت کردنە، سێیەم: کاتی عیشا ، ئەمە ئایەتی ٥٨ی سورەی نور ئاماژەی پێ کردوە.([3]).

## نۆزدەیەم: ئادابەکانی کۆڕ ودانیشتنەکان:

پێویستە مرۆڤ لەژیانی رۆژانەیدا تێکەڵاوی خەڵك بکات و مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، و لەگەڵیاندا کۆببێتەوە و دابنیشێ دانیشتنی گشتی یان دانیشتنی تایبەتی، لەناو کۆڕو دانیشتنەکاندا مرۆڤ دەتوانێ حوکم بەوە بدا ئایا ئەو کۆڕو دانیشتنانە کۆڕو دانیشتنێکی چاك و باشن، و بەروبووم و قازانجیان هەیە، یان بەپێچەوانەوە کۆڕو دانیشتنێکی بێ کەڵكو سودن، وقازانجیان نیە.

لەبەرئەوە کۆڕو دانیشتنەکان چەند ئاداب و ڕەوشتی بەرزیان هەیە، پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەو ئادابانە بکەینو ئاگامان لێیان بێت، بەم شێوە کە باسیان دەکەین:

١-هەر کاتێك چویە ناو کۆڕ ودانیشتنەکانەوە یان لێی دەرچووی سەلام لەدانیشتوانەکەی بکە، لەم بارەوە ئەبوهریرە دەگێڕێتەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اذا انتهى أحدُكُم الى المجلس فليُسلِّمْ، فإذا أراد أنْ يقوُم فليسلِّمْ فليستِ الأُولَى بأحَقّ مِن الآخرة**}([4]) واتە: هەر کاتێك یەکێك لەئێوە هاتە ناو کۆڕو

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] حديث متفق عليه.

[3] الآداب الإسلامية، للمصري،ل:٤٤٥، ومنهاج الصالحين ،ب١ /ل: ٥١٥ ،والآداب الإسلاميةللناشئة، ل:١٢٣ .

[4] له باسي سلامكردندا باسكراوه.

دانیشتنەکانەوە باسەلام دانیشتوان بکات، وە کاتێك کە ویستی لەو کۆڕو دانیشتنەدا هەڵبستیٚ ئەوە هەر با سەلام بکات، یەکەم و دووەم یەکسانن وەك یەك وان.

٣-کەسێك لەشوێنەکەی خۆی هەڵمەستێنەو بۆ خۆت لەشوێنەکەی دابنیشی هەرچەندە ئەو کەسە منداڵ بێت یان کەسێکی هەژار بێت عبدالله ی کوڕی عمر گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايقيمنّ أحدُكُم رجلاً مِنْ مجلسه، ثم يجلس فيه، ولكن توسّعوا و تفسّحُوا**}[1] واتە: نابیٚ کەسێك لەئێوە پیاوێك لەشوێنەکەی خۆیدا هەڵبستێنیٚ و پاشان بۆخۆی لەو شوێنە دابنیشیٚ، بەڵام ئێوە لەکۆڕو دانیشتنەکانتاندا فراوانی بکەن و جێگەی خەڵکی تر بکەنەوە، ئیبن عمر ئەگەر کەسێك لەبەرئەو لەشوێنەکەی خۆی هەڵبستایە ئەو لەو شوێنەدا دا نەدەنیشت.

٤-ئەگەر دوکەس لەشوێنێك بەیەکەوە دانیشتن تۆ مەچۆ نێوانیانەوە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لايحلّ لرجلٍ يُفرّق بين اثنينِ إلّا بإذنهما**}[2] واتە: دروست نیە کەسێك بچێتە نێوان دو کەسەوە بەپرسی ئەوان نەبێت.

٥- ئەگەر کەسێك لە شوێنێکدا هەڵساو ویستی بێتەوە ئەو شوێنە تۆ مەچۆ جێگاکەی دابنیشی چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**اذا قام أحدُكُم من مجلسٍ ثم رَجَع إليه فهو أحقّ به**}[3] واتە: ئەگەر کەسێك لەشوێنێك هەستاو ویستی بێتەوە ئەو شوێنە ئەوە هەر بۆ ئەو کەسە شایەنترە.

٦-ئەگەر سیٚ کەس بوون نابیٚ دوانیان بەیەکەوە چپە بکەن بەبیٚ ئەوەکەی تر، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اذا كنتم ثلاثةً فلايتناجى رجلان دون الآخر، حتى تختلطوا بالناس، فإنّ ذلك يُحْزِنُهُ**}[4] واتە: ئەگەر تەنها سیٚ کەس بوون نابیٚ دوو کەسیان بەبیٚ ئەوەکەی تر بەیەکەوە چپە بکەن، چونکە ئەوە کەسەکەی تر خەفەتبار دەکات.

٧-لەکۆڕ ودانیشتنەکاندا نابیٚ گاڵتە بەکەس بکەیت، یان لێیان کەم بکەیتەوە، وە نابیٚ لەسەر پشت رابکشێی، یان قاچیان بۆ لاراکێشی.

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] رواه أبوداود،رقم:( ٤٨٤٥) ،والترمذى رقم:( ٢٧٥٢) وقال : حسن - صحيح.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه.

[4] حديث متفق عليه.

٨-بەهیچ شێوەیەك نهێنیەكانی كۆڕو دانیشتنەكان بلاّومەكەوە، چونكە ئەوە ناپاكیە، عبداللە ی كوڕی عباس زۆر دەرۆیشتە ناو كۆڕو شورای عمری كوڕی خەتتابەوە بۆیە عباسی باوكی ئامۆژگاری عبداللە ی كردو گوتی: عمری كوڕی خەتتاب راوێژت پێدەكات، تۆ پێشدەخات بەسەر یارە گەورەكاندا، بۆیە ئامۆژگاری پێنج شتت دەكەم ئاگاتان لێیان بێت:

ا /نهێنیەكانی عمر بلاّومەكەوە.

ب /غەیبەتی كەسی لەلامەكە.

ج /هەواڵی بەدرۆی مەدەیە.

د /فەرمانەكانی مەشكێنەو بەقسەی بكە.

ه /باخیانەت و ناپاكیت لێ دەرنەكەوێت.([1]).

٩/قسەو باسی كۆڕو دانیشتنەكان مەهێنەو مەبە بەشێوەی خراپەكاری و بلاّوكردنەوەی دوژمنایەتی و رقەبەرایەتی، حوزەیفە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**لایَدْخُلُ الجنّة نَمامٌ**}([2]) واتە: مرۆڤی دووڕوو ناچێتە ناو بەهەشتەوە،وە عبداللە ی كوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: بایارەكانم كەسیان باسی كەسیانم بۆ نەكات، چونكە من پێم خۆشە بەدڵ و دەروونی ساغەوە بێم بۆتان.([3]).

١٠-مافەكانی كۆڕو دانیشتنەكان جێبەجێ بكە، مافەكانیش ئەمانەن:

فەرمان كردن بەچاكە، لابردنی خراپە، بیرخستنەوەی خواپەرستیەكان و چاكەكان و خێرو سەدەقەكان، یارمەتی دانی هەژارو نەدارەكان یاكردنەوەی خوای پەروەردگار، ئامۆژگاریكردنی خەڵك بەداواكردنی پاداشتی خواو دوا رۆژ، هەموو رێگەكانی خێروچاكەو چاكەكاری، خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ ۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن

[1] بروانە: الآدب الإسلامية للناشئة ب٣ ل: ١٤٠.

[2] حدیث متفق علیه.

[3] خرجه أبوداود ( ٢٠٦/١٣- عون ) والترمذي ( ٣٨٩٧ ) وأحمد (٣٩٦/١) وأبو الشيخ في أخلاق النبي ( ٥٠/٢/١ ) والبخاري في الكبير (٣٩٤/١/٢ ) ،والخطيب في التاريخ ( ١٠/١١ ) والبيهقى ( ١٦٧/٨، ١٦٦ ) والبغوى في شرح السنة ( ١٤٨/١٣ ) عن ابن مسعود، فذكره،مرفوعا . قال الترمذي : هذاحديث غريب من هذا الوجه.

نَجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴾ (النساء: ١١٤)واته: **زۆرینەی قسەوچپەکانیان چاك نیە، تەنها قسە وچپەی ئەوانە نەبێت کە فەرمان بەصەدەقە، یان چاکە، یا چاکسازی نێوان خەڵك دەکەن، هەرکەس لەبەر بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا ئەمانە بکات، ئەوە ئێمە پاداشتێکی گەورەی پێدەدەین.**

**١١-عوزری خاوەن ماڵ وەربگرە،وتوڕە مەبە، چونکە لەوانەیە کارێکی زەروری هەبێ، یان ئیشێکی گرنگی تری هەبێ، یان بێتاقەت ونەخۆش بێت.([1]).**

**١٢-هەر کاتێك لە شوێنێك هەستای زیکر وتەسبیحاتی خوا بکە، ئەبو هریرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ هەر کەسێك لەشوێنێك هەستای کە لەغوەوقسەی زیادەی زۆر تێدابکرێ، پێش هەڵسان بڵێ: (سبحانك اللهمّ وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّأنت، أستَغْفِرُكَ وأتوبُإليك) هەر کەسێك ئەم زیکرە بڵێ، ئەوە هەرچی لەودانیشتنەدا بوبێت خوای پەروەردگار دەیبورێ.([2]).**

**١٣-دروستە وەك ڕێزگرتن لەبەر براکەت هەڵبستی لەبەری، پەنجارۆژ پێغەمبەر ویارەکانی بەهۆی دواکەوتنیەوە لەجەنگ دەنگیان لە کەعبی کوڕی مالك دابڕی، دوا ئەوە خوا جل جلالە تۆبەی لیّ قەبوڵکرد،ئەمجا کەعب هەڵسا ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر ﷺلەمزگەوتدابو،کەعب دەڵێ: خەلك پۆل پۆل دەهاتن پیرۆزباییان لێدەکردم،کەچومە ناومزگەوتی مەدینەوە ، تەنها (طلحە) لەبەرم هەستا وتەوقەی لەگەڵدا کردم وپیرۆزبایی لێکردم،کەقەت ئەمەم لەبیر ناچێتەوە.([3]).**

**وەکاتێك عیکریمەی کوڕی ئەبو جهل مسولمانبو، هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ولەخۆشیان پێغەمبەر ﷺگەشایەوە، وهەستایە سەرپێ لەخۆشی مسوڵمان بونەکەی عیکریمە.([4]).**

---

[1] الآداب الإسلامية، للمصري، ل:٤٤٧.

[2] أخرجه الحاكم في المستدرك، وقال:حديث صحيح الإسناد، ولم يخرجاه.

[3] الآداب للبيهقي،رقم:٣١٥ /ل:٣٩٠ .

[4] منهاج الصالحين،ب١ /ل:٣٨١ .

لەروداوەکەی (بنوقریظە)دا سعدی کوڕی معاذ بەسواری گوێدرێژێکەوە هات،پێغەمبەر بەخەڵکەکەی فەرموو: {قوموا إلى سيّدكم}([1]).واتە:ئەوە سعد هات، هەستن بڕۆن بۆ لای و پێشوازی لێبکەن.

## بیستەم: ئادابەکانی هاوسەرگیری {النكاح}:

هاوسەرگیری یەکێکە لەبەهێزکارانی ژیان وپارێزەرانی کۆمەلگەی مرۆڤایەتی لەتێداچون وفەوتان بەئیذنی خوا جلجلالە،بەهۆی هاوسەرگیریەوە کۆمەکی پالپشتی وئولفەت وخۆشەویسی نێوان ژن وپیاو دروست دەبێ.

هاوسەرگیری یەکێکە لەنیشانەکانی خوا جلجلالە لەم بونەوەرەدا وەك فەرمویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ..... ﴾ الروم: ٢١ بۆیە خوا جل جلالە

لە چەندەها ئایەتدا بانگی خەڵکی کردوە بۆ هاوسەر گیریکردن، وەك فەرمویەتی: ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ﴾ النور :٣٢.وەلەچەندەها ئایەتی تردا خوا جل جلالە ئەم فەرمانەی کردوە.([2]).

وە پێغەمبەر ﷺ گەنجان- کوڕان وکچانی هەڵناوە بۆ هاوسەرگیری وشوکردن وژنهێنان فەرمویەتی:{يا معشر الشباب مَنْ استطاع منكم الباءةَ فليتزوّجْ فإنّه أغضُّ للبصر وأحْصَنُ للفرج، ومَنْ لم يستطع فعليه بالصّوم فإنّه له وجاءٌ}([3])،واتە: ئەی کۆمەڵی جەوانەکان کێتان دەتوانن هاوسەر گیری بکەن،وەئەوەشتان ناتوانێ بابەڕۆژو بێت،ڕۆژو ئارەزوی دەشکێنێ.

---

[1] صحيح سنن أبي داود للألباني، (٥٢١٥) ومشكاة المصابيح(٤٦٩٦ ).

[2] منهاج الصالحين ب١ / ل:٢٨٠.

[3] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

ئەمەش هەندێکە لەئادابەکانی هاوسەرگیری لەئیسلامدا پێویستە ڕەچاو بکرێت:

١-ئیستیخارە بکە،چونکە یارەکان دەڵێن:پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن سورەتەکانی قورئانی فێردەکردین، بەهەمان شێوە فێری ئیستیخارەی دەکردین([1]).

٢-واباشە هاوسەرەکەت ببینی وهەلببژێری،هەڵبژاردنەکەش بەوە دەبێ کە ئافرەتەکە صالیحە وبەدین بێ،وبەزاو زێ بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{.....فاظْفَرْ بذات الدِّين تَرِبَتْ يداك}([2]) واتە:ئەوئافرەتە هەڵبژێرە بۆ هاوسەری ژیانت کەخاوەن دین وئیمان بێت.

هەروائەگەر بکرێ هاوسەرەکەت کچ بێت باشترە، چونکە پێغەمبەر ﷺبەجابیری فەرموو: {هلاّ بِكْراً تُلاعِبُها وتُلاعِبُك}([3])واتە:ئەوە بۆ کچت نەدەهێنا، یاری لەگەڵدا بکەیت وئەویش یاریت لەگەڵدا بکات،بەلام لەبەر زەروری، یان لەبەر بەرژەوەمدی بێوە ژنیش بێت هەر زۆر چاکە.

٣-سوننەتە ئافرەتیش پیاوی صالح وچاك بۆ هاوسەرگیری هەلبژێرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{إذا جائكم مَنْ ترضَوْن دِينَه وخُلُقَه فزَوِّجُوه، إلاّ تفعلوا تكُنْ فتنةٌ في الأرض وفسادٌ عريضٌ}([4])،واتە: کاتێك کەسێك هات داخوازی ئافرەتی لێکردن، ئێوەش کە لەدین ورەوشتی ئەو کەسە رازیبون ،ئەوە ئێوە ئافرەتەکەی لێ مارەبڕن، ئەگینا خەراپە وخەراپەکاری لێدەکەوێتەوە.

٤-پێویستە سەرپەرشتیار (ولی) گرێبەستەکە ومارەیی ئافرەتەکەی ببڕێ،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{لا نكاح إلاّ بوليٍّ وشاهِدَيْن }([5])،واتە:گرێبەست ومارەبڕین بە بێ سەرپەرشتیار ودوو شایەت ناکرێت،وەپێویستە سەرپەرشتیار (ولی) ئەم دوو کارە

---

[1] منهاج الصالحين ب١ / ل:٢٨٢.

[2] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

[3] تحريجه كه ي باسكراوه.

[4] رواه ابن حبان في صحيحه(١٢٤٨ ) وصححه الشيخ أبو إسحاق الجويني.

[5] رواه الطبراني وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم: (٧٥٥٨).

بکات: أ- نابیٚ مارەیی ئافرەتەکەی زۆر بێت، ودەبیٚ کەم بێت، ب- دەبیٚ پرس وراوێژ بە کچ وخوشکەکەی بکات، وپاشان گرێبەستەکە ئەنجام بدات.

٥-سوننەتە گرێبەست ومارەبڕین بەدەف لێدان وبەئاشکرابیٚ،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **أعلنوا النكاح**}([1])،و زاد ابن ماجه{**واضربوا عليه بالغربال**}([2])،واتە: با گرێبەست و مارەبڕین بەدەف لێدان و بەئاشکرابیٚ.

٦-کاتێك هاوسەرت گواستەوە بۆلای خۆت ئەم چەند شتە سوننەتە ئەنجام بدرێن:أ-لەپێشەوە دوعا بۆ هاوسەرە تازەکەت بکە .

ب-پێش نزیك بونەوە لێی بەیەکەوە دووڕکات نوێژ بکەن.ج-سیواك بکە ودەمت پاك بکەوە.د-لەپێش جوتبون (جیماع) لەگەڵیدا ئەم دوعایە بخوێنە: { **اللهمّ جنّبنا الشيطان وجنّبِ الشيطان مارزقتنا**}واتە: خوایە شەیتانمان لیٚ دور بخەوە، وەشەیتان دور بخەوە لەوبەچکۆلانەش کەپێمان دەدەیت،پێغەمبەر ﷺ فەرموی:ئەگەر ئەم دوعایە بخوێنیٚ وخوا جلجلالە منداڵیان بداتیٚ ئەوە شەیتان ناتوانیٚ زررەری لێبدا.([3]).

٧-سوننەتە دوعا بۆ کوڕ کچەکە بکەین بەم دوعایەکەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **بَارَكَ اللهُ لك وبَارَكَ عليك وجَمَعَ بينكما في خَيْرٍ**}([4]).

٨-لەکاتی عادەبوندا-حەیز- نابیٚ جیماعی لەگەڵدا بکریٚ، ونابیٚ نهێنیەکانی کاتی جیماع باس بکریٚ،وەکاتێکیش ئافرەت پیاوەکەی بانگی بکات بۆ جیماع پێویستە قسەی نەشکێنیٚ،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إذا باتَتِ المرأةُ هاجرةً فراشَ زوجها لعَنَتْها الملائكةُ حتى تصبح**}([5])،واتە: هەر ژنێك تەرکی سەر جێگای پیاوەکەی بکات، ئەوە هەتتا بەیانی دەبێتەوە فریشتەکان نەفرینی لێدەکەن.

---

[1] رواه أحمد في مسنده (١٦٠٧٥) بإسناد صحيح،وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم:١٠٧٢.

[2] رواه ابن ماجه(١٨٩٥) وفي سنده خالد بن إياس، ضعيف.

[3] أخرجه البخاري في صحيحه.

[4] رواه أحمد في مسنده والترمذي ، وقال: حديث حسن صحيح.

[5] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

٩-پێویستەپیاو زۆر بەچاکی مافەکانی ژنەکەی جێبەجێ بکات،وزۆر بەجوانی مامەلەی لەگەلدا بکات،وقسەی خۆش وسوعبەت ویاری لەگەلدا بکات، وئیدارەیەکی جوانی لەگەل مندال وهاوسەرەکەیدا هەبێت.([1]).

١٠-پێویستە ژن زۆر بەچاکی گوێرایەلی پیاوەکەی بکات لەهەمو شتێکی چاکدا، هەتتا بەبێ پرسکردن نابێ بچێتە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إنّما الطاعة في المعروف**}(٢).واتە: گوێ رایەلیکردنی ژن بۆ پیاو هەر لەچاکەدایە،نەك لەخەراپەدا. واتە: پێویستە ژن بەقسەی پیاوەکەی بکات لەهەموچاکەیەکدا.

١١-نابێ پیاو بۆ ژن ومندالەکانی لەمەصرەفکردندا رەزیلی بکات وپیسکە بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ **كَفَى بالمرءِ إثماً أنْ يضيِّع مَنْ يقوت**}([3]) واتە:مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە کە بۆ ژن ومندالەکانی لەمەصرەفکردندا رەزیلی بکات وبەچاکی بژێوی ژیانیان دابین نەکات([4])

١٢-پێویستە ژن بۆ سوننەتەکانی وەك: رۆژوگرتن، حەجکردن، هتد پرس بەپیاوەکەی بکات،وبەبێ پرسی ئەو ئەو کارانە نەکات،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**لا يحلّ لامرأة أن تصوم وزوجها شاهدٌ إلاّ بإذنه**}([5]).

{**سود وبەهرەیەك**}هاوسەرگیری لەئیسلامدا وەك ئەوە سوننەتە لەهەمان کاتدا سودی زۆری هەیە، بۆیە هەندێکیان باس دەکەین:

أ-داواکردنی مندالە، چونکە مانەوەی مرۆڤایەتی بەهۆی هاوسەرگیریەوە دەبێت.

ب-دوعا ونزای مندالی صالح وبەدینە.

ج-داواکردنی خۆشەویستی پێغەمبەرە ﷺ بەهۆی وەچە زۆری وخەلك زۆر بونەوە .

د-رزگار بونە لەشەیتان بەهۆی بەجێهێنانی ئارەزوەوە.

هـ-خۆشحالی و هۆگریە بەهۆی تێکەلاو بون لەگەل هاوسەرەکەتدا.

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ / ل:٢٩٦.

[2] رواه الترمذي وابن حبان والبيهقي ، وقال الترمذ حديث حسن صحيح.

[3] رواه أحمد في مسنده (٦٨١٩) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٤٤٨١).

[4] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية، ب١ / ل:٢٩٦.

[5] أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما.

و- ڕەنجدان و زەحمەتكێشانە بەهۆی هەلسان بەدابینكردنی ئەرك ومافەكانی ماڵ و منداڵەوە.

ز- هاوسەرگیری دەبێتە هۆكاری دەولەمەندی وریزق فراوانبون.([1]).

## بیست و یەكەم: ئادابی مسوڵمان دەربارەی ناز ونیعمەتەكانی خوا:

ناز ونیعمەتەكانی خواجل جلالە هەندە زۆرن لەژمارە نایەن ﴿ وإن تعدّوا نعمة الله لا تحصرها ﴾ وەبەتایبەت هەندێك لەناز ونیعمەتەكانی ئەمانەن:ناز ونیعمەتی هاتنە كایەی ئێمە بۆ دونیای بوون، ناز ونیعمەتی ئیمان وئیسلام، ناز ونیعمەتی خەوتن وهەستان، ناز ونیعمەتی ماڵ وسامان،ناز ونیعمەتی ژن ومنداڵی چاك وصالح،ناز ونیعمەتی زمان وقسەكردن، ناز ونیعمەتی كردنەوەی دەرگای تۆبەكردن،ناز ونیعمەتی لەشساغی، ناز ونیعمەتی هەلبژاردنی خوا یی بۆ ئێمەی مرۆڤ، ئەمانە وملیۆنەها ناز ونیعمەتی دیكە كە خوا جل جلالە بەئێمەی مرۆڤی داوە،بەراستی پێویستە ئێمەش هەتا دەتوانین سوپاس وستاییشی خوا بكەین لەسەر ئەوهەموو ناز ونیعمەتانە.([2]).

**لەبەر ئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم ئادابانە بكەین:**

١-پێویستە ئێمە بیر بكەینەوە لەوكەسانەی كەلەوهەموو ناز ونیعمەتانەیخوا بێبەشن، وەپێویستە ئێمە تەماشای ئەوانە بكەین، بۆ ئەوە ناز ونیعمەتەكانی خوامان بەلاوە گەورە بێت،

٢-نابێ ئێمە گوناهو تاوانی ئەو خوایە بكەین كەئەو هەموو ناز ونیعمەتانەی داوەتە ئێمە، بەڵكو دەبێ سوپاس وستاییشی بكەین،خوا جل جلالە فەرمویەتی: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾ إبراهيم: ٧.واتە: ئەگەر ئێوە سوپاسی ناز ونیعمەتەكانی من بكەن، ئەوە منیش ئەوناز ونیعمەتانەتان بۆ زیاتر دەكەم، وەئەگەر سپڵە وپێنەزان بن، ئەوە سزای من سەختە،([3]).

---

[1] موسوعة الآداب الإسلامية، ل:٤٢٣-٤٢٤.

[2] منهاج الصالحين ، ب٢ / ل: ٧٤ -٧٧.

[3] منهاج الصالحين ب٢ : ل: ٨٠.

وەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اللهمّ ما أصبح بي مِنْ نعمةٍ أو بأحدٍ من خلقك فمنك وحدك لاشريك لك،فلك الحمد ولك الشكر**}[1].

واتە: ئەی خوایە ئەوناز ونیعمەتانەی کەمن وخەلك هەمانە، هەموویان تۆ پیت داوین، دەکەواتە ئێمەش هەمومان سوپاس و ستاییشی تۆ دەکەین.

٣-هەوڵبدە قەناعەت بکە بەوناز ونیعمەتانەی کەخوا جلجلالە پێیّ داوی هەرچەندێك بێت،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إرْضَ بما قَسَم اللهُ لك، تكُنْ أغنى الناس....**}[2]،واتە: تۆ رازیبە بەوەی کەخوا پێیّ داوی ، دەبی بەدەوڵەمەندترینی خەڵك.

٤-هەرکاتیّ خەلکی ئیحتیاجیان بەتۆ بو، تۆ غەمیان لیّ بخۆ، وهەولیان بۆ بدە، ئیحتیاجیەکەیان بۆ دابین بکە، لێیان تورە مەبە، چونکە خوا جلجلالە ئەو پلە وپایەی بەتۆ داوە، وبەئەوانی نەداوە، لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { **إنّ لله عباداً يختصّهم بالنعَم لمنافع العباد، فمَنْ بَخِل بها على العباد، نقلها اللهُ عنه إلى غيره**}[3]،واتە: خوا جل جلالە چەند بەندەیەکی هەیە، تایبەتی کردوون بە نیعمەتەکانی خۆیەوە بۆ سودگەیاندنیان بەبەندەکانی خواوە، جا هەرکەسێك رەزیلی بەونیعمەتانەوە بکات بۆ بەندەکانی خوا، ئەە خواجل جلالە لەم کەسانە دەسێنێتەوە و دەیداتە کەسانی شیاو و لێهاتوو.

---

[1] قال الحافظ فى " الفتح " ١١ / ١٣١ : صححه ابن حبان في صحيحه.

[2] رواه الترمذي وأحمد وحسنه الألباني في صحيح الترغيب(٢٣٤٩) وصحيح الجامع(١٠٠).

[3] رواه الطبراني وابن إبي الدنيا عن ابن عمر،وحسنه الألباني في صحيح الجامع(٢١٦٤).

## بیست ودووەم: ئادابەکانی گەشت و وەرزش و سەیران:

خوای پەروەردگار بەئاینێکی خۆرسك وپاكوبێگەردوئاسانەوە پێغەمبەرەکەی ناردوە، خواعزوجل فەرمویەتی: ﴿فَأَقِمْ وجهك للدين حنيفاً فطرة الله التى فطر الناس عليها﴾ ئایینە پاکەکەی خوا ئەو ئایینە ڕسکانە خواییە کە هەموو خەڵکی لەسەر ڕسکاندووە.

خوای پەروەردگار فەرمانی بەکارئاسانی بۆ خەڵك کردوەو زەحمەت و ناڕەحەتی و ناخۆشی قەدەغەکردوە، شتە پاکەکانی حەلاڵ کردوە، و شتە پیس و ناپاکەکانی قەدەغەکردوە، کۆت وزنجیریان لەسەر لادەبا، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنّ هذا الدّين يُسْرٌ**}([1]) واتە: ئەو ئایینە ئاینی ئاسانکاریە، یەکێك لەوانەی کە ئاینی ئیسلام حەلاڵی کردوە بۆ مسوڵمان ئەوەیە کە مسوڵمان یاری پاك وخاوێن و دور لەشوبهەو شتە قەدەغەکراوەکان بکات، بۆ مسوڵمان حەلاڵە گەشتو گەڕان بکات و بڕوا بۆ ناو باخچەو بێستانەکان و دارستانەکان، کێو وبەندەکان بگەڕێ و هێز ووزەی خۆی بەکاربێنی بۆ سود وەرگرتن لەماددە چاکەکان و ڕووەك و گیاو گوڵە جوانەکان، بەروبومی گەورە بەدەست بهێنێ، چونکە ئەم هەموو گول وگولزار وڕوەکانە بەخۆڕایی خوا دروستی نەکردوون.

هەروەها چۆن ئاینی ئیسلام گرنگی داوە بەبەهێز کردنی جەستەو وەرزش کردن پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: {**المؤمن القوىّ خيرٌ وأحبّ إلى الله من المؤمن الضعيف، وفي كُلّ خيرٌ**}([2]) واتە:بڕواداری بەهێز لەبڕواداری بێ هێز چاکترو خۆشەویستترە بەلای خواوە، وە لەهەردوکیانیشدا چاکە هەیە.

ئاینی ئیسلام بانگی خەڵکی کردووە بۆ وەرزشکردنی بەسود، بۆ مەلەکردن، بۆ تیر وتفەنگ هاویشتن،وفێربوونی هەموو جۆرە چەكو سیلاح وسواربونی سەیارە وتەیارە،وهەموو جۆرەکانی تری فەننوهونەری جەنگی و چەك دروستکردن و هتد.

هەروەها ئاینی ئیسلام خەڵکی هەڵناوە بۆ ژیانی زبر وهەڵگرتنی ناڕەحەتیەکانو بەدەستهێنانی دەستکەوتە گەورەکانی ژیانی دونیا و دوا ڕۆژ، بەڵام ئەمانە هەمووی

---

[1] جزء من حديث أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

دەبێ بەگوێرەی ئەو بەرنامە ووردەکاریانە بێ کە شەریعەتی ئیسلام باسی لێوە کردووە.

وەلەبارەی گەشت وگەڕانەوە (ئیمامی شافیعی) گوتویەتی:بڕۆن بۆگەشت وگەڕان، چونکە لەگەشت وگەڕاندا پێنج سودتدەست دەکەوێ،غەم وپەژارەتدەڕوا،بژێویتدەست دەکەوێ،زانست وئەدەب ومالٚ وسامانیشت دەستدەکەوێ.

هەروەها ئیمام شافیعی گوتویەتی:گەشت بکەن وبگەڕێن، چونکە ئەگەر ئاویش ڕاوەستێ خەراپ دەبێت،ئاو بڕوا ئنجا پاك دەبێتەوە،خۆر ئەگەر بوەستێ، خەڵك هەموو لێی بێتاقەت دەبن.([1]).

شێخ (حسن عطار) دەلێ:گەشت وگەڕان ئاوێنەی شتە سەرسوڕهێنەرەکانە، وچادر وخێمەی شتە ئەزمونیەکانە.

پرۆفیسۆر (فرنسیس بیکن) دەلێ: گەشت وگەڕان ئاوێنەی منداڵانە وخیبرە وئەزمونی گەورەکانە.([2]).

**لەبەرئەوە گەشت وگەڕان وسەیران ووەرزشکردن ومەلەکردن وياری کردن چەند ئاداب و ڕەوشتی بەرزیان هەیە، پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەو ئادابانە بکەین و پابەندیان بین بەم شێوەیەی کە باسیان دەکەین:**

## یەکەم: ئادابەکانی گەشت وگەڕان و سەیران:

١-یەکلاکردنەوەی نیازو مەبەست لەئیسراحەت پێدانی دلٚ وجەستە بۆ بەهێز بوون لەسەر بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا وگەڕان بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا بە هەڵمەتێکی بالأتر ونیازێکی بەهێزترەوە.

٢-بیستن و گوێڕایەڵی کردنی سەرپەرشتیاری ئەو گەشت وگەڕانە بەشێوەی تەواو، بۆئەوە گەشتەکە ڕێك وپێك بێت.

٣-دانانی بەرنامەیەکی بەسودو جۆراوجۆرو سود بەخش بۆگەشت و گەڕانەکەو ئاگابوون لەکاتەکان، وگەڕانەوە بەکۆڵێك زانست وشتی کەڵکدار.

---

[1] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٣٤٥ .

[2] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٣٤٥ .

٤-هەوڵ بدە لەکاروانەکە دوور نەکەویەوە ودانەبڕێی، تەنها بەپرسی سەرپەرشتیار نەبێ، بەتایبەت ژن ومندالْ ئاگاداریان پێویستە.
٥-هەوڵبدەلەگەڵ هاورێی چاکدابی وخۆشت رەوشتت بەرزبێ لەهەڵسوکەوت ومامەڵە کردنت لەگەڵ خەڵکدا،وەك راستگۆیی،ئەمینی، هەڵبژاردنی خەڵك بەسەر خۆتدا، خەمخۆری، سەبر وئارامی،بێفیزی، ڕوخۆشی، وقسەی نەرم ونیان.
٦-ئاگات لەفەرزەکان بێت،بەهۆی یاری وەرزشەوەفەرزەکان نەفەوتێنی،ولەهەمان کاتدا لەگەشتەکەشتدا بیر لەدروستکراوەکانی خوای پەروەردگار بکەوە، وە کۆمەڵێك فەرموودەی دیاریکراو وقسەیخۆش بۆ خەڵکەکە باس بکە.
٧-پەلە بکە بۆ خزمەتکردن وهاوبەشیکردن لە ئامادەکردنی پێداویستیەکانی گەشتەکە وحازرکردنیان، زەرقانی گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەگەشتێکدا بوو فەرمانی بەیارەکانی کرد مەرێك چاك بکەن، یەکێك لەیارەکان گوتی: من سەری دەبڕم، یەکێکی تریان گوتی: منیش پاکی دەکەم، یەکێکی تریان گوتی: منیش دەیکوڵێنم، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: منیش دار کۆدەکەمەوە، یارەکان گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەباتی تۆ دار کۆدەکەینەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ئەوە دەزانم بەڵام من پێم ناخۆشە خۆم لەئێوە جیابکەمەوە، وە خوا جلجلالە پێی ناخۆشە بەندەیەکی خۆی ببینێ کە خۆی لەیارەکانی جودا بکاتەوە.([1]).
٨-پارێزگاری بکە لەسەر خۆشی دۆستەکانت بەخزمەتکردنیان وکارئاسانکردنیان وبەسەرکردنەوەیان، وسوربون لەسەر دڵخۆشکردنیانوخۆش رابواردنیان لەگەشتەکەدا.
٩-هەرچی پێداویستی خودی خۆت هەیە پەیدای بکە بۆ گەشت و گەڕانەکەت، پشت بەکەسەکانی تر مەبەستە بۆئەوە تا نەبی بەبار بەسەر خەڵکەوە.
١٠-ئاگاداربە ئامیارەکانی یاری حەرام و کەرەسەکانی گۆرانی خەراپ و رەقسی ئافرەتان و قومار وشتە خراپەکانی تریش لەگەڵ خۆتدا مەبە،ومەیانکە،چونکە ئەمانە قەدەغەکراون.
١١-لەگەشت و گەڕانێکدا مەبە کە پیاوانی بێگانە وئافرەتان بەیەکەوە تێکەڵ ببن، و شتی قەدەغەکراو وگوناهوتاوان ئەنجام بدەن.

---

[1] رواه الزرقاني، بروانه: الآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ /ل:١٤٨.

١٢-لەگەشت وگەڕانەکەتدا مەچۆ ئەو شوێنانەوە کە ئارەقی لێدەفرۆشن و سنورەکانی خوای پەروەردگار تییدا دەبەزێندرێ،وگوناهو تاوانی تێدا دەکرێت.
١٣- پێویستە بزانی لەشەرعدا گەشت وگەڕان چۆنە و ئەو روخصەتانەی کەهەیە چیە و چۆنە و چۆن بکرێ باشە؟،وەك: نوێژ کورتکردنەوە، تەیەمومکردن،و رۆژوو شکاندن، و هەموو شتەکانی تر.([1]).
١٤-زۆر ئاگاداری کەلو پەلی خەڵك بکرێت و نەفەری تایبەتی بۆ دابنرێ بۆ پاسەوانی کردنیان و بۆچاودێرییان، بەبێ پرس دەستکاری کەلو پەلی خەڵك نەکرێت.
١٥-باخۆگۆڕین لەشوێنی تایبەتی خۆیدا بکرێ،وپارێزگاری لەسەر خۆداپۆشین و شەرم بکرێت.
١٦-خەوتن و هەستان پێویستە کاتی بۆ دابنرێ و ئاگاداری شێوەی خە وتنی ڕەوار شەرعی بکرێت.
١٧-خۆڵو خاش ومیوە فرێدراوەکان رێگە نەدرێ فرێ بدرێنە سەر رێگەی خەڵك و بن دارەکان و ناو ئاوو ڕووبارەکانەوە.([2]).
١٨-پارێزگاری لەسەر شوێنە گشتیەکان بکرێت، ئەزیەتی دارو درەختەکان نابێ بکرێت، گیاوگوڵەکان نابێ هەڵکەندرێن، مریشك و جوجکە وکوتر وزیندەوەرەکانی تریش نابێ بکوژرێن، میوەهاتەکان نابێ لێبکرێنەوە، دەستکاری موڵك و سامانی خەڵك نابێ بکرێت، نابێ کاری وابکرێ کە خەڵك قسە بکات و جنێو بدات و نارەحەت بن.([3]).
١٩-شەوانە لەکاتی خەوتنداناگر بکوژێنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**{النَّارُ عدوٌّ فاحْذَرُوها}**([4]).واتە:ئاگر دوژمنە، ئاگاداربن.
٢٠-لەهەر شوێنێك شەو مایەوە ئەم دوعایەبخوێنە**{أعُوذُ بكَلِمَاتِ اللهِ التَامَّاتِ كُلّها مِنْ شَرِّ ماخَلَق}**([1])چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:هەرکەسێك چۆ شوێنێك، وئەم دوعایە بخوێنێ، ئەوە هەتا لەو شوێنەدا بێت توشی هیچ زەرەر و زیانێك نابێت([2]).

---

[1] منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية،ب١ /ل:٤٠٧ .

[2] الآداب الإسلامية، محمودالمصري، ل:٣٤٨ .

[3] الآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ /ل:١٤٩ .

[4] منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٣٥٠ .

## دوهەم: ئادابەكانی وەرزش و مەلەكردن:

١-ئەوكەسەی دەیەوێ وەرزش بكات، پێویستە نیاز ومەبەستی ئەوەبێ كەبەهۆی وەرزش و مەلەكردنەوە خۆی بەهێز بكات، وجەستەی بەهێز بێ بۆ ئەنجامدانی كارە چاكەكان وفەرزەكان وعیبادەتی خوا جل جلالە([1])

٢- لەكاتی وەرزش ومەلەكردنداالەشوێنی تایبەتیدا خۆت بگۆڕە، وئەو پۆشاكانە لەبەر بكە كە نێوان ناوكەو ئەژنۆت داپۆشێ، وجەستەت داپۆشراو بێت، وخەڵك عەورەتت نەبینێ.

٢- لەكاتی وەرزش ومەلەكردندا ئەوپەڕی رەوشتی جوان بەكاربێنە، وخۆت بپارێزە لەجنێودان ونەفرینكردن، وهەرا هەرا،چونكە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{سِبابُ المسلم فُسُوقٌ، وقتالُهُ كُفْرٌ}([2]).واتە:جنێودان بەمسولمانبێدینیە، وجەنگكردن لەگەڵیدا بێباوەڕیە.وەفەرمویەتی:{لَعْنُ المؤمن كقَتْلِه}.([3]).واتە:نەفرینكردن لەبروادار وەك بیكوژی وایە.

٣-با شەڕواڵی مەلەكردنەكەت تەنك نەبێت و جەستەت بگرێتەوە و شەرەفوعەورەتت دەرنەخات،واتە:لەوقوماشانە نەبێت كەتەنكە وجەستەی مرۆڤ دەردەخات ([4]).

٤-پارێزگاری لەسەر ئەوە بكە كە حەوزی مەلەكردنەكەت پاك بێت، پێش مەلەكردن لاشەوو پێیەكانت بشۆ، میزو چڵم و تف مەكە ناو حەوزەكەوە.

٥-یاری بەئاو مەكە، ئاو بەكەسدا مەكە، و كەس مەخە ناو ئاوەكەوە، با كەس بە دەستی تۆ نەخنكێ لەئاودا.

٦-وەرزش ویاریكردن پێویستە بۆ خۆشەویستی و بۆخۆ بەهێزكردن بێت، نەك بۆ دەمارگیریو لایەن لایەن و پێشبڕكێوململانێ بێت وەك خەڵكی ئەم زەمانەی خۆمان.([5]).

---

[1]أخرجه مسلم في صحيحه.

[2]الآداب الإسلامية للناشئة،ب٣ /ل:١٥٤ ،منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٣٥٣ .

[3]منهاج الصالحين، ب٢ /ل:٤٥٢ .

[4]أخرجه البخاري ومسلم.

[5]رواه أحمد والبيهقي والترمذي،وصححه الألباني في صحيح الجامع(٥٤٠٤ ).

[6]الآداب الإسلامية للناشئة، ب٣ /ل:١٥٠ .

[7]منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٤٥٩.

٧-لەکاتی مەلەکردندا، یان وەرزشکردندا زۆر خۆت ئەزیەت مەکە، و زۆر رامەکەو زیاد لەپێویست جوڵە مەکە، با لەسنوری جوڵەکردنی مام ناوەندی دا تێپەڕ نەکات.
٨-یاریکردن و مەلەکردن هەریەکەیان با لەگەڵ ئەو کەسانەدا بێت کە لەتەمەن و لەئاستدا وەك یەك وابن، چونکە ناگونجێ منداڵ لەگەڵ گەورەدا یاری بکات، یان هەندێ یاری هەیە وەك:سواری وولاٚخە بەرزە، یان زۆرانبازی ، ئەمانە بۆ منداڵ نابێ.([1]).
٩-لەدوا مەلەکردنەوە راستەوخۆ بەلەشی تەڕەوە خێرا مەڕۆ بۆ سەر پۆشاك و بۆسەر بەرماڵ و شتەکانی تر.
١٠-لەدوا مەلەکردنەکەوە بەئاوی شیرین و پاك جوان خۆت بشۆ، بەتایبەت لەدوا مەلەکردن لەدەریادا.
١١-ئەویاری ووەرزشانە بکە کەحەلاڵ وسودبەخش بن بۆ جەستە وبۆ زەینی مرۆڤ ، چاکترینیان ئەوانەن کەلە سوننەتدا هاتوە، وەك:تیرەندازی، سوارچاکی، مەلەوانی، رۆیشتن، راکردن،یاریەکانی خۆبەهێزکردن هتد([2]).

١٢ -هەوڵبدە وەرزشکردنەکەت با بەردەوام بێت،چونکە وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {چاکترینی کردەوەکانتان ئەوکردەوانەن کەبەردەوامبن}،چونکە بەردەوام بون لەسەر کردەوە چاکەکان پیرۆزی وسەرکەوتنە، بەلام بەردەوام نەبون خەراپە و نەگبەتیە، وەزۆر خۆماندوکردن وئیسراف کردنیش لەکردەوەکاندا خۆفەوتاند و بێتاقەتیە.([3]).

## {سودەکانی وەرزشکردن}

**وەرزشکردن ئەم سودە گرینگانەی بۆ جەستەی مرۆڤ هەیە:**

أ-خوێن لەدەمارەگەورەکاندا زۆر چاك دێت ودەچێ.

ب-رێژەی ئۆکسجینی کەدەگاتەجەستە زیاد دەبێت.

ج-مرۆڤ لەنەخۆشی سیەکان دەپارێزێ وسینەی فراواندەکات.

د-جەستەی مرۆڤ گەشە دەکات، وزۆر بەهێز دەبێت.

وەتوێژینەوەی زانستیش ئەم سودانەی وەرزشکردنی دەرخستوە:

---

[1] منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٤٥٥ .

[2] الآداب الإسلامية للناشئة ب٣ /ل:١٥١ .ومنهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٤٥٨ .

[3] منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٤٥٨.

أ-ڕێژەی تووشبون بەنەخۆشی شەکرە کەم دەکاتەوە.

ب- ڕێژەی تووشبون بەنەخۆشی دڵ ودەمارەگەورەکان کەمدەکاتەوە.

ج-ڕێژەی کۆلسترۆلی خوێن نزم دەکاتەوە.

د-وەلەسەرمابون مرۆڤ دەپارێزێ.

هـ-کێشی مرۆڤ دەپارێزێ، وجوانی وزەریفیەکەشی دەپارێزێ.([1]).

## بیست و سێیەم: ئادابەکانی خۆپاککردنەوە لەدەشتو سەحرادا:

لەبەرگی یەکەمدا ئادابەکانی خۆپاککردنەوە لەناو ماڵ دا باسکرا ئێستا باسی ئادابەکانی خۆپاککردنەوە لەدەشت و سەحرادا دەکەین:

١-کاتێك ئاو نەبێت سێ بەرد بەکاربهێنە بۆ پاککردنەوەت خوا عزوجل: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة: ٢٢٢) واتە: خوای پەروەردگار تۆبەکاران و پاکانی خۆشدەوێ. دەتوانی هەر ئاو بەتەنها بەکاربهێنی، یان هەرسێ بەرد کەخۆتی پێ پاك بکەیەوە،عائیشە-رضي اللهعنها- گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**إذا ذَهَب أحدُكم الى الغائط، فليَذهبْ معه بثلاثة أحجار يَستطيبُ بهنّ، فإنّها تجزئ عنه**}([2]) واتە:هەر کاتێ ئێوە چون بۆسەرئاو سێ بەرد لەگەڵ خۆتاندا بەرن خۆتانی پێ پاك بکەنەوە ئەوە دروستە.

وە ئەگەر ویستت هەر یەکێکیان بەکاربهێنن ئەوە لەم کاتەدا ئاوەکە بەکاربهێنە باشترە، چونکە ئاو پیسیەکە وشوێنەوارەکەشی لادەبا، ئەنەس گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە دەچوو بۆ سەرئاو من و گەنجێکی تر دەچوین بۆلای پێغەمبەر ﷺ قاپێکی پێستینەیی پڕ لەئاومان پێ بوو پێغەمبەر ﷺ خۆی بەئاوەکە پاك دەکردەوە.

٢-بۆسەرئاو ئەوەندە بڕۆ خەڵك تەماشات نەکات، و باشوێنە کەشت نزم و چۆل بێت، مغیرە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك بیویستایە سەرئاو بکات، پۆشاکەکەی هەڵ نەدەدایەوە هەتا لەزەوی نزیك نەبوایەوە.([3]).

---

[1] منهاج الصالحين ، ب٢ /ل:٤٥١.

[2] قَالَ الدَّارَقُطنِيّ فِي سنَنه :إِسْنَاده حسن.وَقَالَ فِي«علله» : إِسْنَاد مُتَّصِل صَحِيح.

[3] الجامع الصغير، ١ /١٧٧ ، وقال: حديث صحيح.

٣-لەکاتی سەرئاودا ڕوو لەقیبلە و ڕۆژو ومانگ مەکە و پشتیشیان تێ مەکە، بەڵکو ڕوو لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بکە لەسەحرادا.
٤-لەسەر ڕێگەوبان و بن داری بەردارو بن سێبەر و شوێنی کۆبونەوەی خەڵك، یان لەنزیك بیرو حەوزو گۆڕستاندا سەرئاو مەکە و خۆت بپارێزە، مەعازی کوڕی جەبەل گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**اتّقوُا الملاعنَ الثلاثة: البراز في الموارد، وقارعة الطريق، والظلّ**}([1]) واتە: لەو سێ شوێنەدا کە دەبنە هۆی نەفرین کردنی خەڵك لەتۆ سەرئاو مەکە:
١)لەدەم کانی وچەم وئاوەکاندا.
٢)لەسەر چەقی ڕێگەیخەڵکدا.
٣)لەبەر سێبەروبندارەکاندا.
٥-خۆت بپارێزە میزو پیسایی مەکە ناو کون‌و کەلەبەرەوە، چونکە ئەم شوێنانە شوێنی مانەوەی زیندەوەرەکانە، قەتادە گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ خەڵکی قەدەغە کردوە لەمیزوپیسایی کردنەناو کون و کەلەبەرەکانی زەویەوە.([2]).
٦-لەشوێنی زۆر ڕەق یان بەرەو ڕووی با سەرئاو مەکە چونکە پیسیت پێ دەکەوێتەوە وپیس دەبیت.

## بیست و چوارەم: ئادابەکانی مامەڵە لەگەڵ زیندەوەر وئاژەڵدا:

زیندەوەر وئاژەڵ یەکێکن لەو نیعمەتانەی کەخوا جلجلالە بۆ ئێمەی ڕامکردوە، وئێمەسودی گەورەیان لێوەردەگرین، وەك لەچەندەها ئایەتی پیرۆز باسکراون،وەبۆ ئەوە ئێمە سود لەو زیندەوەر وئاژەڵانە وەربگرین، وبۆئەوە هەم بەزەییمان پێیاندابێتەوە، پێویستە ئەم چەند ئادابانە بزانین کەباسیان دەکەین:
١-دەبێ ئێمە بەزەییمان پێیاندابێتەوە،ونابێ ئەزیەت وئازاریان بدەین،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{**من لايَرْحمْ لايُرْحَمْ**}([1]).واتە:کەسێك بەزەیی بەخەڵك و بەزیندەوەر و ئاژەلەکاندا نەیاتەوە ئەوە خواش جل جلالە بەزەیی بەئەودا نایاتەوە.

---

[1]رواه ابو داود والحاكم ١٦٧/١،وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه.
٢بروانه: البدر المنير، ٢ /٢٣٣وهو حديث صحيح.

یەکێك لەزانایان دەڵێ:ئەگەر تۆ حەزت لەبەزەیی خوایە دەتۆش وابکە کەبەزەییت بێتەوە بەخۆت وبەخەڵك وبە نەزان وبەهەژار وبەزەلیل وبەگەورە وبچوك وبەزیندەوەر وئاژەڵ، لێیان تورە مەبە وسۆزت هەبێ لەگەڵیاندا([1]).

٢ –کاتێك برسی وتینویان بێت دەبێ ئێمە ئاو وخواردنیان پێبدەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**في كلّ كبدٍ رطبةٍأجرٌ**}([2]).واتە:بۆتێرکردنی هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ ئەجر وپاداشی گەورە هەیە.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ئافرەتێکی سۆزانی سەگێکی زۆر تینوی دیتوە، بەزەیی پێیدا هاتۆتەوە، ئاوی پێداوە خوا جل جلالە بەهۆی ئەوە عەفویکردوە.([4]).

٣–نابێ ئەزیەتیان بدەین، ونابێ باری وایان لێباربکەین کەنەیتوانن،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {ئافرەتێك بەهۆی ئەشکەنجەکردنی پشیلەیەکەوە، وئاو وخواردنی نەدابویە خواجل جلالە خستیە ناو دۆزەخەوە.([5]).

٤–لەکاتی سەربڕینیان ئیسراحەتیان پێبکەین،چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**إنّ الله كَتَب الإحسان على كلّ شيء....وإذا ذَبَحْتم فأَحْسِنوا الذِّبْحة، ولْيُحِدّ أحدُكُم شفرته، ولْيُرِحْ ذبيحته.**([6]).واتە: خوا جل جلالە لەسەر هەمووشتێك چاکەی نوسیوە،...وەئەگەر باڵندە وماڵاتتان سەر بڕی جوانی سەر بڕن.چەقۆکەتان تیژ بکەن، وسەربڕاوەکەش ئیسراحەت پێبدەن، وئەزیەتی مەکەن لەکاتی سەر بڕیندا،یانی نابێ بەڕاکێش ڕاکێش بیهێنی بۆ سەربڕین.

٥–نابێ دایکە وبەچکەکەیان لێك جودا بکرێنەوە، مەگەر لەکاتی ناچاریدا بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {**مَنْ فرّق بين والدةٍ وولدِها، فرّق الله بينه وبين أحبّته يوم**

---

[1] حديث متفق عليه.

[2] الآداب الإسلامية،محمود المصري، ل:٢٩٢.

[3] أخرجه أحمد(٤ /١٧٥ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٢٠٤ ).

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] حديث متفق علية.

[6] أخرجه مسلم في صحيحه.

**القيامة**}([1]).واته: هەرکەسێك دایکە وبەچکەکەی لێك جودابکاتەوە خوا جلجلاله لەرۆژی دواییدا جیاوازی لەنێوان ئەو وخۆشەویستەکانی دەخات.

٦-نابێ زەنگ وزەنگوڵە لەملیان بکرێت،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{**لاتَصْحبُ الملائکةُ رُفقةً فیها کلبٌ ولاجرسْ**}([2]).واتە:فریشتەکانی خوا لەگەڵ کۆمەڵ و کاروانێکدا نابن کەسەگ وزەنگوڵەیان لەگەڵدا بێت.

٧-دروست نیە گوێدرێژی نێر بخرێتە سەر ماین ولێی بپەڕێ، ئیبن عباس دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی :

{**أمَرَنا أنْ نُسْبِغَ الوضوء وأنْ لانأکل الصدقة وأنْ لانَنْزی حماراً علی فرس**}([3]).

واتە:پێغەمبەر فەرمانی پێکردین .... وەزەکات نەخۆین وە گوێدرێژیش نەخەینە سەر ماین.

٨-دروستە ئەوئاژەلانەی کە ئەزیەتی خەلك دەکەن بکوژرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

{**خمسٌ یُقْتلنَ في الحِلّ و الحَرم: الحیّة و الغراب الأبقع والفأرة والکلب العقور والحدأة**}([4]).

واتە: پێنج ئاژەڵ دەبێبکوژرێن: مار، قەلە رەشکە، مشك، سەگی نهێنگر، کۆلارە.

٩ -نابێ دەم وچاوی ئاژەل داغ بکەین، ونابێ لەدەم وچاویشی بدەین، ونابێ بە هۆیانەوە واز لەعیبادەتی خوا بهێنین،وەپێویستە زەکاتەکەیان بدەین.([5]).

لە کۆتاییدا زۆر زۆر سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم کە یارمەتی دام هەرسێ بەشەکانی ئەم کتێبەم نوسیەوە.

داواکارم لەدایکانو باوکان و مامۆستایان و سەرپەرشتیاران کە سود لەم کتێبە وەربگرن بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و گەنجو لاوەکانمان کوڕان وهەم کچان، و پابەند

---

[1] اخرجه الترمذي(١٥٦٦ ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٤١٢ ).

[2] أخرجه مسلم في صحيحه.

[3] اخرجه الترمذي(١٧٠١ ) وقال: حديث حسن صحيح.

[4] أخرجه مسلم في صحيحه.

[5] الآداب الإسلامية،محمود المصري، ل:٢٩٥،ومنهاج الصالحين ،ب١ /ل:٦٠٥.

بونیان بەم ئادابە جوانانەوە بۆ ئەوەی منداڵ و گەنج و لاوی بەئەدەبمان هەبێت و لەبەریان بجەسپێنەوەو ببن بەچرا و ئەستێرە و بدرەوشێنەوە و رەنگ بدەنەوە بەگوفتار و بە کرداری جوانیان وە ئەم ئادابانە پێشکەشی خەڵك وگەل ومیللەت بکەن.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

سلێمانی گەڕەکی کازیوە

٦ی رەمەزانی ساڵی ١٤٣٢ی کۆچی بەرامبەر بە ٢٠١١/٨/٢٦ میلادی

## سەرچاوەکانی ئەم کتێبە:

١-تەفسیری تيسير الكريم الرحمن للشيخ ناصر السعدی .

٢- أيسر التفاسير ، للشيخ اسعد الخومد .

٣- صحیحی ئیمام بخاری و مسلم.

٤- هەموو کتێبەکانی فەرموده .

٥-هەموو سوننەکان بەگشتی.

٦ - زۆرینەی کتێبە صحیح و تحقیق کراوەکانی فەرموده.

٧- منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية لدكتور محمد عبد العاطي.

٨- المسند الجامع لأبي الفضل النووي

٩ - الآداب الإسلامية للشيخ محمود المصري.

١٠ - الاداب ولأخلاق الشرعية للشيخ عبدالرحمن الجبري.

١١ - الوقت وأهميته في حياة المسلم للشيخ علي بن نايف الشحود .

١٢ - الآداب العشرة للشيخ ابي البركات.

١٣ -موسوعة الآداب الإسلامية للشيخ محمد حسان وأيمن المزين.

١٤- الآداب الصحبة لأبي عبدالرحمن السلمي

١٥-الآداب الإسلامية للناشئة لدكتؤر محمد خير فاطمه.

١٦-آداب المسلم لعبدالرحيم ماردينى.

١٧-منهاج المسلم للشيخ ابي بكر الجزائرى.

١٨-الموسوعة الآم في تربية الاولاد في الإسلام.

١٩ - مدارج السالكين لأبن قيم الجوزية

٢٠ - قاموسی دەریا ، دانراوی رزگار کەریم.

## نوسینەکانی نوسەر:

**چاپکراوەکان:**

١- بۆهەڵگرانی قورئان.

٢-چۆن قورئان لەبەر دەکەیت.

٣- پوختەی فیقهی ئافرەتان بەرگی یەکەم و دووەم.

٤- تەرجەمەی فقه المرأة المسلمة بەرگی یەکەم و دووەم.

٦- بەهەشت بەلینی راستەقینەیە. ترجمە.

٧- دۆزەخ-ژیان وگوزەرانی خەلکەکەی. ترجمە.

٨ -ڕێبازی پەروەردەی منداڵان.دوو بەرگ.

٩- پوختەی پەروەردەو فیقهی منداڵە جگەرگۆشەکان.

١٠- ئادابە ئیسلامیەکان بۆ گەنج و لاوو تازە پێگەیشتوەکان،سێ بەشە.

١١- نوێکردنەوەی ئیسلام و موژدەکانی سەرکەوتنی .

١٢- بیروباوەڕو هێزی بڕوادار .

١٣- برایەتی ڕاستەقینە دڵسۆزی دین و ژینە .

١٤- ماستەرێك لەبارەی (صلح ) لە ئیسلامدا .

١٥- ماستەرێك لە سەر ڕێبازی بانگخواز .

١٦- دکتۆرا لە سەر فیکرو ڕێبازی حەرەکاتی ئیسلامی لە کوردستاندا .

# نیوەرۆك

**بابەت** — **لاپەڕە**


پێشکەش بێت.................................................... ٤
پێشەکی .................................................... ٥
**بەشی یەکەم : تایبەت بە قوتابیانی زانستە شەرعیەکان** ........................ ٧
یەکەم / ئادابەکانی نیاز کردن .................................... ٧
دووەم/ ئادابەکانی خەوتن .................................... ١٠
سێیەم / ئادابەکانی لە خەوهەستان .................................... ١٤
چوارەم / ئادابەکانی سەر ئاوو خۆپاککردنەوە .................................... ١٧
پێنجەم/ ئادابەکانی دەستنوێژگرتن .................................... ٢٠
هەندێك لە سودەکانی سیواك .................................... ٢٢
شەشەم / ئادابەکانی سیواك کردن .................................... ٢٥
حەوتەم / ئادابەکانی نانخواردن .................................... ٢٩
هەشتەم /ئادابەکانی ئاوخواردنەوە.................................... ٣٥
نۆیەم / ئادابەکانی پۆشاك لەبەرکردن .................................... ٣٧
دەیەم / ئادابەکانی گفتوگۆو قسەکردن .................................... ٤٠
ئادابەکانی سوعبەت کردن و مەزاح .................................... ٤٨
یانزەیەم / ئادابەکانی ناوماڵ .................................... ٤٩
دوانزەیەم / ئادابەکانی کوڕ و کچ لەگەڵ دایك و باوکدا .................................... ٥١
ئادابەکان لەگەڵ دایك و باوکدا .................................... ٥٢
سیانزەیەم / ئادابەکانی خوشك و برا لەگەڵ یەکتریدا .................................... ٥٦
چواردەیەم / ئادابەکانی ڕێگاوبان .................................... ٦٠
پانزەیەم / ئادابەکانی خوێندنگاو دەرس خوێندن .................................... ٦٤
یەکەم / ئادابەکانی خوێندنگا .................................... ٦٥

دووەم / ئادابەکانی خوێندکار لە ماڵەوە ........................ ٦٧
شانزەیەم / ئادابەکانی خوێندکار.................................. ٦٨
یەکەم / ئادابەکانی خوێندکار لەگەڵ زانستدا ................... ٦٨
دووەم / ئادابەکانی خوێندکار لەگەڵ ماموٚستادا ................. ٧٢
حەڤدەیەم / ئادابەکانی خوێندەوار و زانا ( عالم ) .................. ٧٥
بەشی دووەم : تایبەت بە فەقێ وحوجرەو زانستە شەرعییەکان ............ ٨١
یەکەم / ئادابەکانی کەسایەتی خودی مرۆڤ ......................... ٨٢
دووەم / ئادابەکانی مروئەت و پیاوەتی مرۆڤ ....................... ٩١
سێیەم / ئاداب و خەسڵەتەکانی فیگرەتی ئینسان ...................... ٩٣
چوارەم / ئادابەکانی خۆپاککردنەوەو خۆ شۆردن ..................... ٩٦
پێنجەم / ئادابەکانی مزگەوت............................................. ١٠٠
شەشەم / ئادابەکانی نوێژی بەکۆمەڵ ( صلاه الجماعه )................ ١٠٧
حەوتەم / ئادابەکانی ڕۆژی جومعە ..................................... ١١٠
هەشتەم / ئادابەکانی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان ................ ١١٥
نۆیەم / ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئان ................................. ١١٩
دەیەم / ئادابەکانی ئامۆژگاری کردنی خەڵك ............................ ١٢٧
یازدەیەم / ئادابەکانی کات و ساتی تەمەن و ژینەکەت ................. ١٣٠
دوازدەیەم / ئادابەکانی ئێمەی مرۆڤ لەگەڵ خوادا ( جل جلاله ) .......... ١٣٢
سیازدەیەم / ئادابەکانی ئێمەی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەرﷺ............ ١٣٦
چواردەیەم / ئادابەکانی ڕێگاو بانی ئەم سەردەمە ......................... ١٤٢
پازدەیەم / ئادابەکانی بەکارهێنانی مۆبایل .............................. ١٤٣
شازدەیەم / ئادابەکانی زیکرو یادی خوای پەروردگار ..................... ١٤٤
حەڤدەیەم /ئادابەکانی دۆعاو نزا و پاڕانەوە ........................... ١٥١
نزاو پاڕانەوە هەڵبژاردەکانی قورئانی پیرۆز ............................. ١٥٦
نزاو پاڕانەوە هەڵبژاردەکانی فەرموودەی پیرۆز.......................... ١٥٧
هەژدەیەم / ئادابی تۆبەو پەشیمان بونەوە لە گوناهو تاوان ............. ١٥٩

**بەشی سێیەم: تایبەت بە قۆناغی گەنج و لاوەکانی زانکۆ و پەیمانگاکان و فەقێ و حوجرەکان و قوتابیانی زانستە شەرعییەکان................١٦١**

یەکەم / ئادابەکانی بەڕۆژوو بوون ................١٦١

دووەم / ئادابەکانی زەکات دان و خێر و صەدەقە ................ ١٦٨

سێیەم / ئادابەکانی حەج وزیارەتی ماڵی خوا لە مەککەدا ................١٧٢

چوارەم / ئادابەکانی زیارەتی پێغەمبەرﷺ لە مەدینەدا ................١٧٦

پێنجەم / ئادابەکانی ئیش و کەسابەت و کڕین و فرۆشتن ................١٧٧

شەشەم / ئادابەکانی پەیوەندی و چاودێری خزمەکان ................ ١٨٢

حەوتەم / ئادابەکانی دراوسێ ................١٨٥

هەشتەم / ئادابەکانی سەردانی نەخۆش ................١٨٧

نۆیەم / ئادابەکانی خودی نەخۆش ................ ١٩٠

دەیەم / ئادابەکانی پزیشك و دەرمان ................ ١٩١

یازدەیەم / ئادابەکانی جەنازە و مردوو ................١٩٣

دوازدەیەم / ئادابەکانی میواندارێتی میوان ................١٩٧

سیانزەیەم / ئادابەکانی دیاری بردن ................١٩٩

جۆرەکانی دیاری................٢٠١

چواردەیەم / ئادابەکانی هاوڕێیەتی و مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا ................٢٠١

لوقمانی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات ................ ٢٠٣

پازدەیەم / ئادابەکانی مامەڵە لەگەڵ هەتیودا ................٢٠٧

شازدەیەم / ئادابەکانی پیرو تەمەندارەکان ................٢٠٨

حەڤدەیەم / ئادابەکانی سەلام کردن ................ ٢١٠

هەژدەیەم / ئادابەکانی پرسکردن بۆ چونە ماڵان ................٢١٥

نۆزدەیەم / ئادابەکانی کۆڕو دانیشتنەکان ................٢١٧

بیستەم / ئادابەکانی هاوسەرگیری ( النكاح ) ................٢٢١

بیست و یەك / ئادابەکانی مسوڵمان دەربارەی نازو نیعمەتەکانی خوا ........٢٢٥

بیست و دووەم / ئادابەکانی گەشت و گوزار ................٢٢٧

یەکەم :ئادابەکانی گەشت و گەڕان و سەیران ........ ٢٢٨
دووەم : ئادابی وەرزش و مەلە کردن ........ ٢٣١
بیست و سێیەك / ئادابەکانی خۆ پاککردنەوە لە دەشت و سەحرادا........ ٢٣٣
بیست و چوارەم / ئادابەکانی مامەڵە لەگەڵ زیندەوەرو ئاژەڵدا ........ ٢٣٥
سەرچاوەکان ........ ٢٣٨
بەرهەمەکانی نوسەر ........ ٢٣٩
نێوەرۆك ........ ٢٤٠

چاپی چوارەم

# ئادابە ئیسلامییەکان

## بۆ گەنج و تازە پێگەیشتووەکان

بەشی یەکەم- دووەم- سێیەم

-بۆ هەر سێ قۆناغی:
-سەرەتایی و بنەڕەتی
-فەقێی حوجرەکان و ئامادەیی
-پەیمانگا و زانکۆ و هاوئاستەکانیان



نووسینی
أبوبکر صدیقی



کتێبخانەی گەشەبۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ktebkhaney geshe

 ٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣




چاپخانەی سیما